ئەم چیـرۆکە پێشـــکەش بە دایکـــی پێشـــمەرگە بێــت، کە هەمیشـــە چاوبەفرمێســـک لە دڵەخـورپەدان و بە تـرس و هیـواوە چـاوەڕوانی دەنگوباسـی سـەرکەوتن و سـەلامەتیی ڕۆڵە خەباتکەرەکەیانن.

**گەلاوێژ**

# ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەشکەوتی دلێران

خوێنەرانی بەڕێز، دەمێک بوو حەزم دەکرد چیرۆکی بەرەو ئەشکەوتی دلێران دووبارە چاپ بکەمەوە، تاوەکو خوێنەرانی کوردستانی ئازیز بیخوێننەوە.
چاپی یەکەم لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨دا بڵاو کرایەوە، لە سوید و لەندەن و زۆرینەی وڵاتانی ئەورووپا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو کاتە کوردستانی شیرین لە بارودۆخێکی نالەباردا بوو بەدەست داگیرکەرانیەوە، بۆیە نەدەکرا بگاتە دەستی خوێنەرانی، لەبەر ئەوە ئێستا زۆرم پێ خۆشە کە چاپی دووەمی دەخەمە بەردەستتان، ئومێد دەکەم خەیاڵتان بەرنە ئەو کاتەی ئەم چیرۆکەی لێ پەیدا بووە و لەگەڵی گەشتێکی ناو ئەو کەژ و کێو و ئەشکەوتە سەربەرزانە و جێ و شوێنی ئەو پێشمەرگە قارەمان و دلێرانە بکەن.
خوێنەرانی بەڕێز، یەکەم چاپی بەرەو ئەشکەوتی دلێران ساڵی ١٩٨٦، مامۆستای نەمر ئیبراهیم ئەحمەد (باوکی هێرۆ)، بۆی تایپ کردم، بە دەستی خۆی، بە تایپێکی سادەی ئەو ساڵانە، هەرچەند دڵم نەهات کە ئەو نووسین و تایپکردنەی ئەو بگۆڕم و سەرلەنوێ بە کۆمپیوتەر و کەرەسەی پێشکەوتووی ئێستا بنووسرێتەوە، بەڵام کە سەیرم کرد زۆر کەموکوڕیی تێدایە و لە هەندێ شوێن و سەردێڕ وردەکاریی دەوێت، بۆیە ڕستم کردنەوە، واشم بە باش زانی کە سەرلەنوێ بنووسرێتەوە و چاپی یەکەمی ببێ بە یادگاریی دەستوپەنجەی گرانبەها و ڕەنگینی و تاوەکو ماوم ئەو نووسینەی بخەمە سەر چاوەکانم و خەوی پێوە ببینم.
ئازیزان، کاتی خۆی کە دەستم کرد بە نووسینی بەرەو ئەشکەوتی دلێران، زۆرم پێ چوو، نزیکی ساڵ و نیوێک زیاتر خەریکی بووم، بۆیە کاتێ تەواو بوو و بڵاو کرایەوە، بەینێ سەرقاڵی نامە و تەلەفۆنی پیرۆزبایی خوێنەران بووم و دەزگایەکی

بڵاوکردنەوەی ئینگلیزی پەیوەندییان پێوە کردم و هاتنە لام بۆ ماڵەوە و گوتیان باسی کتێبەکەتمان لە دکتۆر کەمال میراودەلییەوە بیستووە و دەڵێن کە لە کەژ و کێوی سروستی بێدەستکاری دەچێت، هاتووین قسە لەوە بکەین کە بیکەین بە فیلمی سینەمایی. دوای پشوودانێک سەیرم کرد کەوا زۆر بێتاقەت دەبم بۆ پاڵەوانەکانی بەرەو ئەشکەوتی دلێران و زۆریان بیر دەکەم، هەروەک خزم و کەسانی زۆر خۆشەویستم لێم دوور کەوتبنەوە بۆ شوێنێکی نادیار و خەریک بوو نارەحەت و دڵتەنگ دەبووم بۆیان، بۆیە کە نامەی شەهید فازیل مەلا مەحموودم پێ گەیشت، کە تێیدا دەڵێت: "چیرۆکەکەش هێشتا بەلای منەوە تەواو نەبووە و خوێنەر بەتەمای بەشێک یان بەشانی تریەتی." لەبەر ئەوە ئەم داخوازییەی شەهید فازیلم دەستبەجێ پەسەند کردەوە، زۆریش پێی خۆشحاڵ بووم کە بگەڕێنەوە ناو ئەو خەڵکە خۆشەویستانەی بیرم دەکردن، ئیتر دەستم کرد بە نووسینی بەرگی دووەم، ئەگەرچی ماندووش بووم و سیحەتم هەندی ناجۆر بوو، بەتایبەتی چاوم، جگە لە ئەرکی ماڵومنداڵ و خیزان، لەگەڵ ئەوەشدا وازم نەهێنا و بەرگی دووەمیش لە لەندەن و ئەورووپا بڵاو کرایەوە، کە باس لە کەوتنە دووبەرەکیی ناو پارتی دەکات و دەستپێکردنی شەڕی براکوژی لە بەینی هەردوو باڵیدا؛ مەکتەبی سیاسی، کە ڕۆشنبیر و پێشکەوتووخواز بوون و بەشەکەی تری، کە باڵی عەشایەری بوون. دوای ئەوە بەرگی سێیەمیشم نووسی، کە باس لە هەرەسپێهێنانی شۆڕشی کوردستان دەکات لە ساڵی ١٩٧٥دا، ئەمەش ئامادەیە لە لەندەن بۆ چاپ و بە ئومێدی خوای گەورە هەردوو بەرگەکە لە کوردستانیش بڵاو دەکرێنەوە، هەرسێ بەرگەکەش پاڵەوانەکان هەر هەمان کەس و خیزانن.

خوێنەری بەڕێز، لەگەڵ هەر دێرێکی ئەم چیرۆکەدا یادگارێکی شیرین و لەبیر نەچووی باوکی هێرۆی خۆشەویستمی تێدایە و پێوەیە، کاتێ چەند لاپەڕەیەکم لە چیرۆکەکە دەنووسی، دوایی بۆم دەخوێندەوە بۆ ئەوەی ڕای ئەوم بزانیایە لەسەری، هەندێ جار کە زۆر ڕەزامەندیی خۆی دەردەبڕی و دەستخۆشیی لێ دەکردم، سوێندم دەدا و دەمگوت: "بەخوا ئەوە لەبەر من وا دەڵییت، توخوا ڕاستییەکەم پێ بڵێ و مەترسە." بە دڵ پێدەکەنی و دەیگوت: "نووسینی چیرۆکی وا خاتری تێدا نییە، چونکە دەچێتە بەردەستی خەڵکی خوێندەوار و هۆشیار و ڕۆشنبیر، چۆن لەخۆڕایی دەڵێم باشە!" ئیتر کە وای دەگوت منیش دڵنیا دەبووم.

لێرەدا دەمەوێت زۆر زۆر سوپاسی گەرمی برای بەڕێز و خۆشەویستم کاکە حەمە ڕەسووڵ هاوار بکەم، چونکە ئەویش ئەزیەتی لەگەڵ من کێشاوە و چیرۆکەکەی

خوێندووەتەوە و بەسەریدا چووەتەوە و کوردییەکەی بۆ ڕاست کردوومەتەوە، چونکە نووسینە کوردییەکەم زۆر تەواو نەبوو، زۆرتر عەرەبییەکەم باشتر بوو، لەبەر ئەوەی لە خوارووی عێراق گەورە بووم، بەڵام لام وایە ئیستا و لە دوای نووسینی دە کتێبی چیرۆک، وابزانم نووسینەکەم خراپ نییە.
ئیتر زۆر سوپاستان دەکەم لەبەر ئەوەی تووشی ئەو ڕوونکردنەوە دوورودرێژەم کردن.

**گەلاوێژ**
**سلێمانی**
**٢٠٠٠١٩١٨**

بەرەو ئەشکەوتی دلێران، کە باسی ئەو ڕووداوانەی سەرەتاکانی ١٩٦٠ دەکات، کە لە کوردستانی عێراق ڕوویان داوە.
ساڵی ١٩٥٨ حوکمی هاشمی کەوت و عێراق بوو بە جمهوری، کوردەکان چالاکانە لەو ئاڵوگۆڕەدا بەشدارییان کرد، هیوایەکی زۆریان هەبوو بە گەشەپێدانی دیموکراسییەت لە عێراقدا و بەدەستهێنانی مافەکانیان و حوکمی تازە.
پاش دوو سێ ساڵ کۆماری تازەی عێراق لە هەموو ئەو بەڵێنانەی بە گەلی کوردی دابوو، پاشگەز بووەوە، بۆیە کوردەکان دەستیان کرد بە ڕێکخستنی جووڵانەوەیەکی بەرگرییانەی بەهێز، کتێبەکە باسی چۆنێتیی لەدایکبوونی ئەو جووڵانەوەیە دەکات، نووسەر بە شێوەیەکی بلیمەتانە دەچێتە ناو ڕووداوەکان و بیر و هەستی کۆمەڵانی خەڵک و جەماوەرەوە، ئەمەش لە ڕێگەی باسکردنی ژیانی خێزانێکی کوردەوە، کە لە ناوجەرگەی ساڵی یەکەمی ئەو جووڵانەوە بەرگرییەدا ژیاوە. ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە هەستی نەتەوایەتی و شوناسنامەی مرۆڤی کورد چ ڕۆڵێک دەبینێ، لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا پیاو ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە کۆمەڵدا، لە هەمان کاتیشدا ژنە گەنجە ڕۆشنبیرەکان چالاکانە بەشداری دەکەن لە بزووتنەوەی نەتەوایەتیدا.
بەرەو ئەشکەوتی دلێران ڕۆمانێکی ئیجگار سەرنجڕاکێش و مەزنە، پڕە لە ڕووداو و بەسەرهات، کە سەرنجی خوێنەر بە شێوەیەکی وا ڕادەکێشێ کە هەرگیز دەستبەرداری ڕۆمانەکە نەبێت، تا نەگاتە ئەنجام، واتە وازناهێنێ لە خوێندنەوەی.
لە ڕووی زمانیشەوە زۆر دەوڵەمەند و پاراوە. سەبارەت بە بێهاوتایی ڕۆمانەکە لە ڕووی ناوەڕۆک و چۆنایەتی و وەزنی ئەدەبییەوە، کتێبەکە دادەنرێ بە یەکێک لە کتێبە بەنرخەکان و هونەرێکی مەزن و کتێبخانەی کوردی و زمانی کوردی دەوڵەمەندتر کردووە.

**حەمەد موهتەدی**

**تەرجەمەی نووسینی سویدی لەبارەی بەرەو ئەشکەوتی دلێرانەوە**

# پێشەکی

خوێنەرانی خۆشەویست، دەمەوێت لێرەدا کورتەی ناوەڕۆکی بەشی یەکەمی بەرەو ئەشکەوتی دلێرانتان بۆ بگێڕمەوە، بۆ ئەوەی بتوانن زنجیرەی هەردوو بەشەکەی پێکەوە ببەستن.

بەشی یەکەمی بەرەو ئەشکەوتی دلێران باسی ئەو کاتە دەکات کە سوپای عێراق لە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا شۆڕشێکی سەرکەوتوانەی کرد، بە سەرۆکایەتیی زەعیم عەبدولکەریم قاسم، کە ڕژێمی مەلەکیی سەرنگوم کرد، هەروەها چۆن گەلی عێراق بە کورد و عەرەبیەوە دڵیان بەو شۆڕشە خۆش بوو و هەموویان بە توندی بە سەر و ماڵ پشتیان گرت و هەر لە یەکەم ڕۆژەوە تەنها حزبی کوردی ئەوساکە، کە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، بە ناوی هەموو کوردەوە بروسکەیان لێ دا بۆ دەربڕینی دڵسۆزی و پشتگیری لەم شۆڕشە پیرۆزە و هەر دەستبەجێ سەرکردەکانی پارتی کەوتنە وەفدپێکهێنان و لە هەموو شار و شارۆچکە و دێهاتی کوردستانەوە کەوتنە ڕێ بەرەو بەغدا بۆ پیشاندانی دڵسۆزی و پشتگیری بۆ ئەو شۆڕشە و سەرکردەکانی، بەتایبەتی بۆ زەعیم عەبدولکەریم قاسم.

ئەو شۆڕشەی کە هەموو گەلی عێراق بە کورد و عەرەب و کەمایەتییەکانیەوە سەریان پێ بەرز بوو و هیوایان پێ زیندوو بوو و لە دەوری ئاڵان و هەریەکەیان چاوێکیان کرد بە سەد بۆ چاودێریکردنی خەڵکی خراپکار و ئەوانەی کە هەستانی شۆڕشەکەیان پێ ناخۆش بوو. بەتایبەت ئەوانەی سەر بە ڕژێمی پێشووی مەلەکی و دەستوپێوەند و بەکرێگرتیەی دەوڵەتە بێگانەکان، هەر دەستبەجێ شۆڕشی ١٤ی تەمووز هەموو بەندە

سیاسییەکانی بەردا و بەڵێنی ئازادی و دیموکراسیی تەواویشی دا بە میللەت، ئیجازەی حیزبە سیاسییەکان درا بە ئاشکرا ئیش بکەن، کە یەکێ لەو حزبە سیاسییانەش پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، کە ئیجازەی درا بە ئاشکرا بکەوێتە خەبات و چالاکیی سیاسی خۆی. هەروەها لە دەستووری عێراقیشدا بۆ یەکەم جار لە مێژووی دەوڵەتی عێراقدا، دان بە حقووق و مافی کورددا نرا و لە مادی سێهەم گوترا کە "کورد و عەرەب شەریکن لەم وڵاتەدا و لەگەڵ عەرەب ماف و هەقیان وەک یەک وایە".
کورد کردیان بە شایی و خۆشی و ئەوەندی تر دڵسۆزی و پەرۆشیی خۆیان دەربڕی بۆ سەرکەوتن و پەرەسەندنی شۆڕشەکە، پارتی بارەگای خۆی لە بەغدا دانا و ڕۆژنامەکەی خۆی دەرکرد بە ناوی خەباتەوە، کە زەعیم عەبدولکەریم قاسم ئیمتیازەکەی دا بە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەو کاتە سکرتێری گشتیی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو.
ڕۆژنامەی خەبات کەوتە گەڕ بە زمانی عەرەبی و بوو بە یەکێک لە ڕۆژنامە ڕۆژانە هەرە بەناوبانگەکانی عێراق، کە گەلێ جار لە پێشی هەموو ڕۆژنامەکانی تر نەدەما لە بازاڕ و گورج هەمووی دەفرۆشرا و لە پێشی کورد، عەرەب پەلاماریان دەدا و دەیانکڕی، چونکە ئەوەندە سەروتار و ناوەڕۆکی گرنگ و بەقیمەتی تێدا دەنووسرا کە هەر ڕاستەوخۆ هەست و ئارەزووی دەروونی وڵات و میللەتپەرستانی خەڵکی کوردستان و عێراقی دەردەبڕی، بە شێوەیەکی پێشکەوتووی پڕ فەخر و سەربەرزی و ئینسانی و دۆستی و ئاشتیخوازییانە.
بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو عەرەبە شۆڤێنییەکان و ئەوانەی ئەو وەزعەیان پێ ناخۆش بوو، کەوتنە خۆیان و لە ماوەیەکی کەمدا سوپا و گەلی عێراق بە کورد و عەرەبییەوە توانییان چەند جووڵانەوەیەکی خراپکارانە و چەند کودەتایەک بکوژێننەوە و پێشێل بکەن و لە هەموو ئەو کودەتایانە گەورەتر کودەتای شەواف بوو لە موسڵ، کە بە یارمەتیی هێز و بازووی کورد کوژێنرایەوە. ماوەی ساڵ و نیویک بەسەر شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا تێپەڕی.
شۆڕشگێڕەکان لە ناو خۆیشیاندا کەوتنە سەروپۆتەڵاکی یەکتری و کەوتنە لابردنی ئەم و سووککردنی ئەو و دەرکردنی ئەوی تر و هەر کەسەیان کەوتنە ئەوەی خەڵکی سەربەخۆی پەیدا بکات و خزم و عەشیرەتی لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە.
عەبدولکەریم قاسم و دەوروبەریشی وردە وردە لە هێزی یەکێتیی کورد و پەرەسەندنی تەنیا حیزبەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەوتنە دوودڵییەوە، بەتایبەتی کە گێرەشێوین و هەڵمەتەکاسە و خۆلەپێشبەریی زۆر پەیدا بوون و ئەوان

زیاتر دڵی عەبدولکەریم قاسمیان کرمێ کرد لە کورد، یان با ڕاست بڵێین ئەویش هەندێ لە خۆی بایی ببوو دوای ئەوەی خۆی جێگر کرد و ناحەزەکانی لەناو برد و ڕەگەزپەرستییەکەشی تێدا زیندوو بووەوە و لای وابوو ئیتر باکی بە کەس نییە و پێویستی بە پشتگیریی کورد نەما، بۆیە کەوتە لێدانیان، جارێ لە سەرکردەکانەوە دەستی پێ کرد و فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ هەندێکیان دەرکرد، بە تۆهمەت و گوناهی بێجێ و پڕ لە درۆودەلەسە، وەک پێش هەموو کەس فەرمانی گرتنی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی دەرکرد، کە سکرتێری گشتیی پارتی بوو، گوایە زۆریشی خۆش دەویست و لە پێش بوو لای، بە تۆهمەتی ئەوەی لە ڕێگای شەقڵاوە سەرۆکعەشیرەتێکی سەر بە حکومەتی کوشتووە، سەرکردەکانی تریش هەریەکە شتێکی بۆ هەڵبەستن و وەکو لە ناو مەجلیس و کۆمەڵانی خەڵکدا قسەی بە حکومەت وتووە و لە زابت و کاربەدەستی حکومەت تووڕە بووە و لێ داوە، پتر لەم درۆودەلەسە بێسەروبنانە، لەوەوە کەوتە داخستنی بارەگای پارتی و دەستیان بەسەر هەموو کەلوپەل و چاپخانە و کەرەسەی دەرکردنی ڕۆژنامەی خەباتدا گرت و ڕۆژنامەی خەباتیشی داخست، ئەمە لە بەغدا، ئینجا کەوتە شارەکانی کوردستان و قەزا و ناحیە و دێهاتەکانیش، کە ئەگەر دەستیان بگەشتایە، دوای ئەوە کەوتنە شەڕفرۆشتن بە خەڵکی کوردستان بە ناو بازاڕ و بە تەلەبە و بە مەئمووری کورد، لەبەر ئەوە کوردیش کەوتنە خۆیان و ئەوانی زۆر دیار و لەبەرچاو بوون خۆیان شاردەوە و خۆیان ون کرد.

پارتی دیسان کەوتەوە بە نهێنی ئیشکردن و کۆبوونەوە و بەیانەرکردن و ئامۆژگاری بڵاوکردنەوە بەسەر ئەندام و لایەنگر و هەموو میللەتدا.

حکومەتیش دەستی کرد بە هێنانی سوپا و سەربازی زۆر بۆ ناو شارەکانی کوردستان، عەشایەری کورد ڕێگایان پێ گرتن و بەرەنگاریان بوونەوە و شەڕ دەستی پێ کرد. ئەگەرچی سەرکردە پێشکەوتووەکانی پارتی حەزیان نەکرد کەوا زوو شەڕی چەکدارانە دەست پێ بکەن، چونکە وەختی نەبوو، کورد زۆر بێکەس و بێپشتیوان بوو، تاوەکو چەکیشی نەبوو جگە لە چەند تفەنگ و بڕنەوێک کە هەندێ کەس لەملاولا بۆ خۆیان شاردبوویانەوە و هیی تایبەتی خۆیان بوو، بەڵام ئەو سەرکردانەی ئەم شەڕەیان وا زوو بەدڵ نەبوو لە ترسی ئەوەی نەوەکو پارتی دووبەرەکیی تێبکەوێت و ببێت بە دوو بەشەوە، بۆیە بێ ئەوەی هەر هیچ لە شەڕی چەکدارانە بزانن و بەبێ هیچ دەرامەتێک کەوتنە شاخ و چوون بەرەو ئەشکەوتە دڵگیرەکانی کوردستان و لەوێ هێزی چەکدارییان پێک هێنا لە سەرکردە و ئەندام و لایەنگرەکانی پارتی، کە هیی وایان

هەبوو لە گرتنی قەڵەم زیاتر هیچی تری نەدەزانی، چ جای تفەنگ و ئەو شتانە. ئەو هێزە چەکدارەی کە پێک هات، ناو نرا پێشمەرگەی کوردستان.
بەشی یەکەمی بەرەو ئەشکەوتی دلێران لەو ڕووداوانە پێک دیت، بە باسکردنی ژیانی چەند خیزانێک کە چالاکیی حیزبایەتییان هەبوو و ئەوانیش لەگەڵ ئەو خەڵکەی تر خۆیان دەگەیەننە شاخ و لە دەستگرتن و بڕینی حکومەت هەڵدێن. دوو خیزانەکەی پاڵەوانی ڕۆمانەکە بریتییە لە ماڵی حەپسە خان و حاجی مەجیدی مێردی و دوو کوڕی خەباتکەری کە ناویان حسێن و عەلییە و دوو کچیان، کە یەکەمیان موعەلیمە و خەباتکەرە بە ناوی سەبرییەوە و ئەوی دیکەیان منداڵێکی پازدە شازدە ساڵە و ناوی ڕووناکە، خێزانەکەی تریش بە ناوی ئامە خان، کە خوشکی حەپسە خانە و کاکە حاجی مێردی ئامە خانیش برای حاجی مەجیدە، یەعنی دوو خوشک شوویان کردووە بە دوو برا.
ئامە خان و کاکە حاجییش دوو کوڕی خەباتکەریان دەبێت بە ناوەکانی نەورۆز و بەختیارەوە و تاکە کچێکیش کە ناوی نەسرینە، هاوتەمەنی سەبریی ئامۆزا و پوورزای دەبێت، ئەویش موعەلیمەیە، دوایی شوو دەکات بە حسێنی پوورزای، کە کوڕی حەپسە خانە، سەبرییش شوو دەکات بە شیروان، کە ئەویش خەباتکەرێکی سەرسەختی چالاکی و هاوڕێ و هاوخەباتی براکانیەتی، ڕووناکی مناڵکار و ئێسکسووکیش دوای بەینێک و دوای دڵدارییەکی پاک و بێگەردی بێدەنگ لەگەڵ بێستوونی هاوڕێ و هاوخەباتی خوشک و براکانی، شوو دەکات بە بێستوون، کە خەڵکی ماوات دەبێت، بەڵام خەریکی خوێندن و خەبات دەبێت لە سلێمانی.
تۆفە، کە وەک برای حەپسە خان و ئامە خان وایە و لە منداڵییەوە لەگەڵ ئەو دوو خوشکە گەورە بووە، لەبەر ئەوەی دایکوباوکی هەر زوو عەمری خوا دەکەن، تۆفە بە منداڵی بە جێ دەهێڵن و دایکوباوکی حەپسە خان بەخێوی دەکەن.
تۆفە گەرمی و خۆشییەک دەدات بەم ڕۆمانە، چونکە زۆر دەمەهەراش و قسەلەڕووە و کە هات بەسەریدا قسە بە هەموو ئەهلی خیزانەکە دەڵێت و هەردوو خێزانەکە حیساب بۆ دەمی تۆفە دەکەن و هەموو شتێکی لێ قبووڵ دەکەن و نازی دەکێشن، چونکە زۆریان خۆش دەوێت و ئەویش زۆری خۆش دەوێن. تۆفە ژیانی خۆی تەرخان دەکات بۆ خزمەت و پاراستنی ئەو دوو خیزانە و منداڵیان، بۆیە پشتئەستوورە لە هەموو کردەوە و جووڵانەوەیەکی، هەروەها زۆر خۆهەڵکێش و فیشاڵکەریشە.
ئینجا خوێنەری خۆشەویست، بەرگی یەکەمی بەرەو ئەشکەوتی دلێران لەم ڕووداوانە پێک دێت و ئەوە بوو کورتەی بەرگەی یەکەمی بەرەو ئەشکەوتی دلێران، هیوام هەیە

بەدڵت بێت و سەرنجت ڕاکێشێتەوە بۆ ئەو کاتە. لەگەڵ ئەمەدا ئەمەوێ ئەوەش بڵێمەوە کە ئەو دوو خێزانەی پاڵەوانی هەر سێ بەرگەکەی بەرەو ئەشکەوتی دلێران، کە بەرگی سێهەمیش خەریکی ئامادە بوونە و بەم زوانە دەخرێتە ژێر چاپ، دەڵێم ئەو دوو خیزانە پاڵەوانە خەیاڵین و خەڵکی ڕاست نین و کەس وانەزانێ کە ئەگەر ناوێک لە یەکێک چوو تەنها ڕێکەوتە و هیچی تر و تەنها ئەوەیە کە ڕووداوەکان لە زروفی ئەو کاتەدا و تێکڕا لەو ماوە وەزعە هەڵقوڵاون، کە بڕێکی زۆری خۆمی تێدا بەشدار بووم و لە ناویدا بووم، بەڵام بە هیچ جۆرێک ئەو ڕۆمانە حەقی بەسەر من یان کەسێک لە خێزانەکەشمەوە نییە و هەموو ئەو کەسانە خەیاڵین.

خوێنەری بەڕێز، لەگەڵ داوای لێبوردندا بۆ ئەم پێشەکییە درێژە، بە پێویستی دەزانم ئەوەشتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە من لە بەشی دووەمی داستانەکەمدا کە باسی شەڕی براکوژیی کۆنم کردووە، کە خراپ و ماڵکاولکەر بووە، نیازم لە کای کۆن بە باکردن و برینی کۆن کولانەوە نەبوو، بە پێچەوانەوە، نیازم ئەوە بوو کە بۆ خوێنەوارانی بەڕێزی دەربخەم کە چۆن بە سەدان قارەمانی پێشمەرگەی کورد لە هەردوو لا بە فیڕۆ کوژران و بناغەی شۆڕش هەڵتەکا و چۆن حکومەتیش لە خۆشییاندا نینۆکی لە یەک دەخست و کردبووی بە شایی کە دەیبینی ئەوە کوردە خەباتکارانەی کە گوایە بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەکەیان لە زوڵم و زۆری بێگانە و دەستخستنەوەی مافە ڕەواکانی شۆڕشیان هەڵگیرساندبوو، بەربوونەتە گیانی یەک و بە دەستی خۆیان نەک هەر ئاواتی ئەو، ئاواتی هەموو حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بەجێ دەگەیەنن.

ویستوومە بەم جۆرە دەری ببڕم کە لە مێژووی خەبای نەتەوەکەماندا هیچ کارەساتێک ئەوەندەی شەڕی براکوژی دڵتەزین و کەمەرشکێن نییە و ئەوەندەی ئەو ورە بە جەماوەر بەرنادا و دوژمن دڵخۆش ناکات و نابێ هەرگیز ئەمەمان بیر بچێتەوە، کەچی داخم هێشتا کتێبەکەم نەخرابووە ژێر چاپەوە کە مێژوومان دووپات کردەوە و دیسان شەڕی براکوژی دەستی پێ کردەوە لە کوردستان و کورد کەوتەوە قەلاچۆکردنی یەکتر.

ئینجا ئەمە کەی و لە چ کات و هەلومەرجێکیشدا دەست پێ دەکاتەوە؟ کە بەشێکی ئازادکراوی خاوەن حوکمی فیدڕاڵی ژێر دەستی پەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا، ئەو بەشەی کە حکومەتی ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا بەڵێنیان داوە کە بیپارێزن لە دەستدرێژیی حکومەتی ڕژێمی بەغدا.

لە کاتێکدا کە ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەی کە بەسەر میللەتە نەبەزەکەماندا هاتبوو، وەک کارەساتی هەڵەبجەی شەهید و ئەنفال و ڕاپەڕینەکەی دوای شەڕی عێراق و کوێت، لە

سایەی میدیای جیهانییەوە مەسەلەی کوردی کرد بە یەکێ لە مەسەلە گرنگەکانی نێودەوڵەتی و لە هەموو لایەکەوە کۆمەڵ و ڕێکخراوە خێرخوازەکان بە ئەندازەیەک کەوتبوونە یارمەتیدانمان لە خواردەمەنی و جلوبەرگ و وڵات ئاواکردنەوە و لەسەرکردنەوەدا، کە زۆری خەڵکی دنیا بەخیلییان پێ دەبردین، جا توخوا خەڵکینە لە هیچ کات و شوێنێکدا و لە ناو هیچ کۆمەڵە خەباتکەرێکدا ڕووی داوە لەمەی ئێستای کوردستان، نەک پڕ زەرەر و زیانتر وماڵکاولکەرتر، بەڵکو پڕ شوورەییترتان بیستووە؟ تا ئێستا دیمەنی منالّی کەسک و سۆر و کچۆڵە و کوڕی نەونەمام و نووبووکی شۆخ و شەنگ و پیر و لاوی بە گازی ژەهراوی خنکاوی هەڵەبجەی شەهید لەبیر دونیا نەچووەتەوە، کەچی هەر وا زوو لەبیر خۆمان چووەوە و خەریکن ئەم دەستکەوتە  مێژووییەی کە بە خەوی شەوانیش بە بیرماندا نەدەهات، لەدەست خۆمانی دەدەین و ئابڕووی خۆمان دەبەین لای ئەوانەی دەستمان دەگرن  و دەمانپارێزن.

بۆیە یەکەم ئەرکی سەرشان و فەرمانی ئەستۆی هەموو کوردێکی دڵسۆزە کە هەوڵ بدەن و خەبات بکەن کە نەک هەر ئاو بە ئاگری ئەم شەڕی براکوژییەدا بکەن و هۆیەکانی لە ڕەگوڕیشە دەربهێنن، بەڵکو دەبێت نەشهێڵن لە هیچ لە هیچ زروف و هەلومەرجێکدا و بە هیچ بەهانە و بیانوویەک و بە هیچ نرخێک کارەساتی وا دووپات بکرێتەوە. دە با هەموو پەند و دەرس لە مێژوو وەربگرین، نەک یارمەتیی دووبارەبوونەوەی بدەین.

سـاڵێک و چەنـد مانگێـک تێپەڕیبـوو بەسـەر هـاتنی مـاڵی حەپسـە خـان و ئـامە خـانی خوشکی و خیزانیان بۆ جاری دووەم بۆ ماوەت، پاش ئەوەی گفتوگۆ لە بەینی کورد و حکومەتدا نەما، وەزع تێک چوو و دەرکەوت کە حکومەت هەموو بەڵێنەکانی درۆن و وا دیسـان خەریکـن پـیلان و بلـۆف و دەسـتبڕینەوە، لەجیـاتیی جێبەجێکردنـی مادەکـانی بەیاننـامەکەی، خەریکـی هانـدانی جـاش و پیاوەکـانیەتی، کە تـا پێیـان بکرێـت دەسـت بوەشێنن لەو پێشمەرگانە کە بە ئـازایی و دلێری ناویـان دەرکردووە و کەوا بە بۆنەی گوایە "خۆشیی وەزع" و دەرچوونی بەیانەکەوە هاتوچۆی شارەکانیان دەکرد.
هەروەهـا حکـومەتی بەغـدا هەوڵێکـی زۆریشـی دەدا بـۆ گێرەشـێوێنی و تێکدانی ڕیـزی خەباتکەران، لەبەر ئەمانە سەرکردەکانی شۆڕش هەر زوو کەوتنە خۆیـان و پیلانەکـانی حکومەتیان پووچەڵ کرد و خەریکی خۆقایمکردن و ئامادەکردنی هێزەکانیـان بـوون بـۆ هەموو جـۆرە ڕووداوێـک و ئەوانەی مەترسـیی زۆریـان لەسـەر بـوو، لە نـاو شـارەکاندا کەوتنە ڕێ بەرو شـاخوداخ و ئەشـکەوتە دڵگیرەکـانی کوردسـتان، کاریشـیان بەوە بـاش بـوو کە لە مـاوەی ئەو سـاڵ و چەنـد مـانگەدا یەک دوو ئینقیلابـی عەسـکەری لە بەغـدا ڕووی دابوو و کاربەدەستانی حکومەت لەسەر کورسیی حوکم و دەستکەوتی تـایبەتیی خۆیان بەربوونە گیانی یەک.
ئەم جارە لە ناو خێزانەکەی حەپسە خان و خوشکیدا چەند سـەروکەللەیەکی بچکۆلەی ئێسکسووکیان تێدا پەیدا بوو، وەکو کوڕێکی جـوانکەلەی سـەبری، کە هەروا هەشـت نـۆ مانگێک دەبوو، کچەکەی نەسرینیش، کە هەر دەتگوت خـۆیەتی، بە تەمەنـی پێـنج شـەش مـانگییەوە سـەری قـاڵ قـاڵ کردبـوو، لەگەڵ حسـێنی مێـردی، کە ئەوانـیش نزیـک و دراوسیی ماڵی دایکی بوون لە ماوەت.

ڕووناک گوێزرابووەوە بۆ بێستوونی دەستگیرانی و چووبوونە ماڵی باوکی بێستوون و لەگەڵیدا دەژیان و ڕۆژ و شەوی بێستوون بە جارێک ببوو بە هەنگوین و شەکر و خۆشی لە خۆشیی ڕووناکیی خۆشەویستی.

حەپسە خان خۆی و حاجی مەجیدی مێردی و نەوبەهاری بووکی بە ناو عەلی کوڕی کەشەوە نا، شەوێک لە ماڵەوە دەنووست، ئەوانیش هەموو لە خانوویەکدا بوون، کوردۆی کوڕەزایان پێی گرتبوو و کەوتبووە قسەی خۆش و هەموو ناخۆشی و ژیانی لادێی لەبیر بردبوونەوە، ئەوەندە دڵیان پێی خۆش بوو.

سەبری و شیروانیش هەر لە دێیەکەی پێشوی خۆیان مابوونەوە، ئەم جارە پوورە ئامە خانی و کاکە حاجی و مامیشی هاتبوونە ئەو دێیە و دراوسێیان بوون، نەورۆز و بەختیاری کوڕیشیان پێشمەرگە بوون لە بنکەی مەکتەبی سیاسی، کە نزیک بەو دێیە بوو، بۆیە ئەوانیش شەوان بە نۆرە لای دایکوباوکیان دەنوستن، کاکە تۆفەش دەمانچەیەکی چواردەخۆری لە پشت بەستبوو، کە بێستوون بۆی کڕیبوو، لە خۆشی و بە بۆنەی ژنهێنانەکەی خۆیەوە، لەبەر ئەوە تۆفە ئەوەندە خۆی پێوە گیف کردبووەوە، کە هەر هیچ عەلەشیشێکی ئەو ناوەی نەدەگەیشتێ، ئیش و کاریشی ببوو بە تەتەری هاتوچۆکردن لە بەینی ماوەت و دێیەکەی سەبری و ئامە خاندا. پێشمەرگە وا هۆگری ببوون و فیشاڵەکانیان ئەوندە لا خۆش بوو، هەر پێیان ڕادەبوارد و بە هەر بنکەیەکدا تێپەڕیبایە، بە هەڵەداوان پێشمەرگە دەچوون بەرەو پیرییەوە و دەیانبردە بنکەکە یان شوێنێکی تر، چایان بۆ لێ دەنا و پرسیاریان لێ دەکرد و دەیاندواند و هانیان دەدا کە قسەیان بۆ بکات و فساڵیان بۆ هەڵڕژێت.

قۆناغ و جێی پشوودانی تۆفە لە بەینی ماوەت و دێیەکەی سەبری و ئامە خاندا، دێیەکی بچکۆلە بوو کە شوێنی بەرگدرووی پێشمەرگەی لێ بوو، ژوورێکی درێژ لەگەڵ هەیوانێک کە لە قوڕ و خشتی کاڵ دروست کرابوو، کە لەوێ جلی خاکیی پێشمەرگەیان دەدروو، خەیاتەکان بەرلەوە و لە شاریش هەر بەرگدروو بوون، ئیتر کە هاتبوون و ببوونە پێشمەرگە، ئەو کارەیان بۆ شۆڕش و پێشمەرگەکانی بە شانازییەوە دەکرد و هەموویان زۆر کوڕی چاک و دڵسۆز بوون، لەبەر ئەوە خەڵکەکە کە دەیانزانی ئەوێ جێی پشوودان و ئیسراحەتی تۆفەیە، بە پەرۆشەوە چاوەڕێیان دەکرد کە کەی بەویدا تێپەڕێت، بەتایبەتی کە پێشمەرگە بەرگدرووەکان دەیانتوانی ئیشی خۆیشیان بکەن و گوێ لە ڕادیۆ بێوەستانەکەی تۆفەش بگرن.

ئەو زستانە بەفرێکی ئێجگار زۆر باریبوو، دنیا ئەوەندە سارد بوو کە لە ژووریشەوە شووشەی پەنجەرەکان بەستبوویان، چلوورەی سەهۆڵ وەکو تێلای بلوور بە قەراغی

ئەشکەوت و گوێسوانە و ئەملاولادا هاتبووە خوارێ، زستانەکە ئەوەندە سەخت بوو کە چەندەها ڕێبوار لە ڕێگاوباندا ڕەق ببوونەوە و لە سەرماندا مردبوون.
گورگ و حەیوانی کێوی وایان لێ هاتبوو لە برساندا بە شەو بەبێ ترس دەهاتنە ناو دێیەکان و هەر شتێکیان تووش ببوایە، پەلاماریان دەدا و دەیانخوارد.
ئەگەر کەسێک بە هەزار حاڵ و فەلاکەت بیتوانیایە هەندێ جل بشوات، ئەو جلە جارێکی تر چڵکن دەبوونەوە بەرلەوەی وشک ببوونایەتەوە، چونکە ئەوەندە ئەمبەر و ئەوبەریان پێ دەکردن، پیش دەبوون و دەبوو جارێکی تر بشۆرانایەتەوە. خۆ کە جاروبار هەتاویش بکەوتایە، خاوەن جلەکان رایان دەکرد، گوایا لەبەر ئەوەی جلەکانیان لەبەر هەتاوەکە هەڵبخەن، کەچی دوای چاوترووکانێک ئەو جلانە دەیانبەست و ڕەق دەبوون، بەتایبەتی کراسی کوردیی ژنانە دیمەنی زۆر پێکەنینی ئەو بوو، چونکە وەک تەیارەی لێ دەهات بەسەر ئەو تەنافەوە و هەر قۆڵ و فەقیانەیەکی بە جیا ڕووی دەکردە لایەک.
خەڵک کە هاتوچۆیان دەکرد، تا ناوقەدیان دەچەقینە ناو بەفر، پێشمەرگەی قارەمان و دلێری کوردستانیش بەو زستانە سەخت و تۆفە، بەو بێتفاقییە، وەک پێڵاو و جلوبەرگی بەکەڵک، بێبارانی، بەو حاڵەش بەبێ وچان و بێ کۆڵدان خەریکی هێرش و بەگژداچوونی تانک و تۆپی حکومەتی ڕەگەزپەرست و عەسکەر و جاشە خویڕییەکانی بوون، تا وای لێ هاتبوو کە حکومەت لە ترساندا شەمەندەفەری بەینی کەرکووک و بەغداش بە سڵامینەوە هاتوچۆی پێ دەکرد، چونکە چەند جارێک پێشمەرگە پەلاماریان دابوو، کە پڕ بوو لە عەسکەر لە دەوری توزخورماتوو و جەبەل حەمرین و بەینی کەرکووک و بەغدادا، هەروەها بە ئۆتۆمبێلیش بە قافڵە نەبوایە نەیدەتوانی هاتوچۆ بکات لە بەینی شارەکاندا، کە مەعاشی دەنارده شارەکان بۆ مەئموورەکانی، بەقەد لەشکری پەلاماردانێک هێزی لەگەڵدا دەنارد.
ئیستگەی شۆڕش کەوتبووە گەڕ و زرمەی دەهات، هەموو خەڵکی کوردستان سەربەرز و پڕ هیوا و ئاوات ببوون و ئەو ناڕەحەتییەی لە شارەکاندا تووشیان دەبوو بەدەست حکومەتەوە، لەبیریشیان نەدەما، داڵە و شوێنی ئەمینی بێترسیان دەست دەکەوت بە ئاسانی، هەر ئەوەندە بچوونایەتە ئەودیو شاخە بەرزە شیرینەکانی کوردستان، ئەگەر زۆریان بۆ بهاتایە و بیانزانیایە کە مەترسییان لەسەرە، ئینجا ئەمە نەک هەر لە ناوچەی سلێمانی و کەرکووک و کۆیە و هەولێر، بگرە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان، لە بادینان جاری وا هەبوو شاریان دەگرت، یەکێ لەوانە شاری زاخۆ بوو، کە بۆ چەند ڕۆژێک لەوێ پارتی حوکمی کرد و قائیمقام و ئەوانەی سەر بە

حکومەتیان هەموو بە دیل گرت و سەرا و دائیرەکانی حکومەتیان بەکار هێنا، هەروەها لە شەڵاوە و گەلی و ناوچەی بارزان و هەموو شوێنێکی کوردستان ببوو بە ئاگر و دوژمنەکانی کوردی تێدا دەسووتا.

عەسکەر و سوپای حکومەت هەر بە هاتنی ناوی پێشمەرگە و دەنگی دەستڕێژی، هەرەسیان دەهێنا و پاشەوپاش دەکشانەوە دواوە، لەو کاتەدا یەک دوو سەرکردەی پارتی چووبوونە ئەورووپا بە ڕێگای ئێراندا، چونکە شای ئێران کە بینیی کورد سەرکەوتووە و بوونەتە هێزێکی گەورە، ئیتر ئەویش کەوتە پشی پشی و جەوابی بۆ ناردن کە دەتوانن بێرەدا بێن و بڕۆن و زەخیرە و کەلوپەل بۆ خۆیان بکڕن، دیارە ئەمەش لەبەر خاتری چاوی گەشی کورد نەبوون، لەبەر ئەوە بوو کە ئەویش لەگەڵ حکومەتی عێراق ناڕێکی و ناکۆکییان لە ناو خۆیان هەبوو، ئەگینا ئەگەر شا ڕاستی دەکرد و بۆ کورد باش بوایە، جارێ لەگەڵ کوردەکەی خۆی باش بوایە کە هەموویان لەژێر زوڵم و غەدر و ئەشکەنجە و کوشتن و بڕیندا بوون و تەنانەت نەیدەهێشت بە زمانەکەی خۆیشیان بخوێنن، کە هیچ نەبێت کوردی عێراق منداڵیان بە زمانی خۆیان دەیانخوێند لە مەکتەب.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمە بوو بە ڕەئیی سەرکردەکانی کورد بەرانبەر بە شا و حکومەتەکەی، بەڵام لەبەر ئەوەی لە هەموو ڕوویەک و لایەکەوە لە دنیای دەرەوە دابڕابوون، بە ناچاری خۆیان لەوە گێل کرد کە ئێران دەیەوێت ئەوان بەکار بهێنێ بۆ دەستکەوتی خۆی و بە خۆشییەوە چوون بەپیر سیاسەتە ساختەکەیەوە، بەتایبەت کە ئەمان خەباتیان بۆ میللەتی خۆیان دەست پێ کردبوو، نەدەبوو تەنها لەبەر ئەوەی کە ڕەنگە شا لەم خەباتەی ئەمان قازانج بکات، دەست لە خەباتی خۆیان هەڵگرن، بۆیە هەر زوو کەڵکیان لەو ڕێگا بۆ کردنەوەیە کردەوە، وەک دوان لە سەرکردەکانیان نارد بۆ ئەورووپا، کە دەنگی شۆڕش بگەیەننە خەڵکی دەرەوە و پەیوەندی بە هەندێ لایەنی ئینسانییەوە بکەن، بە هیوای ئەوەی کە یارمەتییەکیان لێ وەربگرن بۆ گەلەکەیان، وەک جلوبەرگ، چەک و فیشەک، پارە یان هەر شتێکی تر.

ئەو زستان و بەفر و تۆفانە کەسی بەقەد ئامە خان سەغڵەت نەکردبوو، چونکە وەک حەپسی لێ هاتبوو، نەیدەتوانی سەری خوشکی بدات لە ماوەت، یاخود ئەوان بێن بۆ لای ئەم، هەروەها کورەکانیشی بەشی هەرە زۆری کات لە بنکەکان و مەکتەبی سیاسی بوون، بۆیە ئامە خان لەگەڵ حاجی بەرانبەر یەک دانیشتبوون، جاری وا هەبوو لەسەر شتێکی بچووک بەیەکدا دەهاتن، ئەگەرچی سەبری نزیکیان بوو، زوو زوو خۆی هەڵدەکرد و دەهاتە لایان و ئەگەر کوڕەکان یان تۆفە بهاتنایەتەوە، قۆڵی ئامە خانیان

دەگرت و دەیانبرد بۆ ماڵی سەبری بۆ دوو سێ شەو لەوێ دەمانەوە، سەبرییش کە شیروانی مێردی لە ماڵ نەبوایە، کوڕەکەی هەڵدەگرت و دەچووە لای ئامە خانی پووری و کاکە حاجیی مامی.
زۆر جار ئامە خان تاقەتی فەچوو و ئەگەر خۆی و حاجی لە ماڵ بوونایە، دووربینەکەی نەورۆزی کوڕی دەگرت بە دەستەوە و دادەنیشت لەبەر پەنجەرەکەی ژوری خۆیان و بە سەعات سەیری دەرەوەی دەکرد، کاکە حاجی پێی دەگوت: "ماڵت بە قوڕ نەگیرێ، ئەوە دەستت شل نەبوو؟! دنیا هەمووی هەر سپی دەچێتەوە، لە بەفر زیاتر، ئەوە تاقەتت نەچوو؟"
ئامە خانیش وەرامی دەدایەوە و دەیگوت: "چی بکەم، سەیری ڕێگاکە دەکەم، بەشکم ئەمە خوایە کەسیک بێت بۆ لامان. ئەیەڕۆ چۆن لە دنیا دابڕاوین، خۆزگە ئێمەش هەر لە ماوەت بووینایە، خۆ شەقمان برد لێرە."
هەندێ جاریش لەپڕ بە خۆشییەوە دەیگوت: "ئۆخەی، ئەرێوەڵا وا زەلامێک هات بەرەو لای ئێمە، لارولەنجەی هەر لە تۆفە دەچێت."
حاجی پێی دەگوت: "ئەگەر تۆفە بێت یان هەر کەسێک بێت، شان و ناوقەدی دیارە لەبەر بەفر، ئیتر لارولەنجەی چی دیار بێت."
دوای بەینێک ئامە خان بە نائومێدییەوە دووربینەکەی دادەنا و بە کزییەکەوە دەیگوت: "بە خوا تۆفەی چاک بوو! تومەز چاوم ڕەشکەوپێشکەی دەکرد، گوێدرێژ و ولاخم لێ بوو بە زەلام."
بەیانییەکیان شیروان هاتە لای ئامە خان و کاکە حاجی، گوتی: "سەبری چاوەڕێتان دەکات، خۆتان کۆ بکەنەوە با بتانبەم."
ئامە خان دڵی خۆش بوو، گوتی: "دە باشە، عومرت درێژ بێت، بەخوا خەریک بوو دڵم شەقی دەبرد."
هەستا خۆی کۆ کردەوە، چەند سەرپۆش و لەچک و کۆڵوانەی لە خۆی پێچا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ماڵی سەبری هەمووی پێنج خولەکێک ک دوور بوون لەوانەوە.
خۆی لێ هەڵکرد و لەگەڵ حاجی و سیروان کەوتنە ڕێ، شیروان قۆڵی گرتبوو، حاجییش گۆچانێکی گرتبوو بە دەستەوە.
ئامە خان لە دوای یەک دوو هەڵخلیسکان بەدەم بۆڵەبۆڵەوە گەیشتە لای سەبری، شیروانیش بە پەلە گەرایەوە بنکەی سیاسی.
سەبری بە گەرمی بەخێرهاتنی کردن و بە هەموویان بۆڵەبۆڵیان بوو بەرانبەر بەم بەفر و تۆف و هەلایەی ئەم زستانە سەختە و کە چۆن لە حەپسە خان ئەوانیش دابڕابوون

و لەم جۆرە قسانە، سەبری هەندێ ناڕەحەت و دڵگیر هاتە بەرچاو، پووری دوو سێ جار لێی پرسی ئەوە بۆ ناڕەحەتی، سەبری گوتی: "هیچ نییە."
دوای پشوودان و خواردنەوەی دوو سێ چای گەرم و خەستوخۆڵ، ئامە خان ڕووی کردە سەبری و گوتی: "بە خوا شتێک هەر هەیە وا ناڕەحەتی کردووی، توخوا ئەگەر پێم نەڵێیت، ڕاستت دەوێت ئارامم لێ هەڵگیرا، دەترسم حەپسەی خوشکم یان یەکێ لە منداڵەکان نەخۆش بن."
حاجی سەری بادا و سەیرێکی سەبریی کرد و گوتی: "کچم، هەرچی بووە بۆی بگێڕەوە، تازە ڕابورد، بەخوا تا دووسبەی هەر دەڵێت ئەوە 'بۆ وا ماتی؟' ئەوە بۆ و ماتی؟'"
سەبری کە بیری کردەوە دنیا خۆی سارد و تاریک و دڵتەنگکەر بوو، خۆیشیان لە ژوورەوە وەک حەپس و دیل وابوون، پووری و مامی لەکن خۆیان هاتوون بۆ لای ئەو کە هەندێ هەوا بگۆڕن و دڵیان بکرێتەوە، کەچی ئەویش لەجیاتیی ئەوە خۆشی بخاتە دڵیانەوە، خستنیە مەراقەوە، بۆیە بە پێکەنینێکی دەستکردەوە دەستی برد بۆ لەچک و سەرپۆشەکەی، توند لە ملی خۆی ئالاندەوە و گوتی: "وەڵا هیچی وا نییە، تۆزێ لەگەڵ شیروان دەمەقاڵێمان بوو لەسەر ئەوەی گوتی حکومەت دیسان ناردوویەتی دەڵێت کوردەکان با بێن و قسە بکەین و و دەست بکەینەوە بە گفتوگۆ و بزانین چییان دەوێت."
ئینجا بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە گوتی: "منیش تووڕە بووم و گوتم هەر ئەم جارە گفتوگۆ و مفاوەزات دەستی پێ نەکرد، لە جاری پێشوو تێرمان خوارد. شیروانیش، کە خۆیشی تووڕە بوو لە دڵدا، ئیتر چوون بەگژ یەکدا."
کاکە حاجی مامی دەستی دا بە یەکدا و حەپەساوانە گوتی: "ئەشهەدوبیلا شتێکی خۆشە، هەر ئەمەمان کەم بوو. گفتوگۆی چی؟ دەی دیسان عەینی تاس و عەینی حەمام، حکومەت گفتوگۆ دەکات لەگەڵ کوردەکان، خەڵک هەموو دیسان دەکەونەوە هەلەکەسەما، پێشمەرگە دەستی ئیتر چەک ناگرێت و هەموو دێنە ڕوو و ئاشکرا دەبن، حکومەتیش لە پیلانی خۆی ناکەوێت، هەر خۆی کۆ دەکاتەوە تاوەکو لەناویان بەرێت، وەڵا ئەگەر حکومەت ڕاستی بکردایە، ئێمە مەمنوونیش دەبووین، چ سەگبابێ هەیە حەز بە ئاشتی و تەبایی نەکات."
حاجی جنێوێکی دا و گوتی: "هەیە حەز لە شەڕ و کوشت و کوشتار بکات ئەگەر ناچاری نەبێت!" دەستی برد بۆ پاکەتە جگەرەکەی و بە تووڕەبوونەوە کردیەوە و جگەرەیەکی دەرهێنا و هێشتا هەر بە دەستیەوە بوو، گوتی: "ئەوە دەزانم، حکومەت

ئەو قسەیە بۆیە دەکات چونکە دەزانێت کە چەند بێدەسەلات بووە و هێزی پێشمەرگەش چەند پێشکەوتووە، وا بڕوات ڕەنگە بەغداش بگرن، ئەوە نییە پێشمەرگە شەمەندەفەری بەینی بەغدا و کەرکووکیشیان گرت."
سەبری خان تا ئەوسا بەبێ قسە و هەر سەیری دەمی دەکردن و وا دیار بوو کە لە دڵدا ئەم باسی مفاوەزاتەی پێ خۆش بوو، بەڵام بەرانبەر بە تووڕەبوون و ناڕەزایی سەبری و حاجیی مێردی نەیدەویرا دڵخۆشیی خۆی دەرببڕێت، بۆیە کە حاجی خەریکی داگیرسانی جگەرەکەی بوو، ئەو بە فرسەت و هەلی زانی و ڕووی کردە هەردووکیان و دەستێکی بەسەر سنگ و دەسماڵەکەیدا هێنا و گوتی: "ئەها خەریکن بەغدا دەگرن! نا، خەریکن بەسرەش بگرن، ڕۆحم دەرچێت کوردی فەقیر چیی هەیە بەغدای پێ بگرێ؟ چۆن دەرەقەتی تۆپ و تەیارەی حکومەت دێت؟ وەڵا من دەڵێم هەر گفتوگۆیەکە باشە، بەشکم ئینشائەڵا ئەم جارە ڕاست بکەن."
حاجی چاوی چووە پشتی سەری و سەیرێکی ژنەکەی کرد و گوتی: "ئەی تا ئێستا کورد چۆن دەرەقەت هاتن کە بە تفەنگە شڕەی خەڵکەکەی خۆی شەڕیان کرد؟ ئینجا نەخوازەڵا ئێستا کەوا بەو هێزە گەورەیە کە زۆربەی زۆری پێشمەرگە بە کڵاشینکۆفی عەسکەرەکان خۆیان شەڕیان لەگەڵ دەکەن و بەو چەکانە کە لەوان گرتوونی." حاجی بە تووڕەبوون و هەڵچوونەوە سەیرێکی ئامە خانی کرد و گوتی: "ئەم قسانە چین؟ کە تۆ لە هیچ نازانی قسەش مەکە." ئینجا سەری ڕاوەشاند و گوتی: "دەزانم بۆ وا دەڵێیت، چونکە تاقەتت چووە و دەتەوێ بڕۆیتەوە بۆ شار و سەیران و گەڕان." ئامە خانیش بە تووڕەییەوە گوتی: "دەی بڵێم چی، دەڵێم بەشکم ئینشائەڵا ئەم جارە ڕاست بکەن لەگەڵ کورد و ڕزگارمان بێت."
سەبری ترسا لەوەی پووری و مامی بیکەن بە شەڕ، بۆیە قسەی بەسەردا هێنا و گوتی: "جارێ ئەمە هەر قسەیە و دڵی خۆتان سەغڵەت مەکەن، ئاخۆ کێ بڵاوی کردووەتەوە، خۆ بە تەواوی شتی وا نەبووە."
سەبری ئەم جارە بە گەرمی و هەروەک ئەوەی بیەویت قسەکەیان لەبیر بەرێتەوە، گوتی: "دەی با بزانین خوا چیمان لێ دەکات، جارێ ئێوە بڵێن حەز لە چی دەکەن بۆ نیوەڕۆ."
پووری گوتی: "هەرچییەک بێت." دوایی گورج گوتی: "وەڵا بۆ ئەم سەرمایە ترخێنە خۆشە."
سەبری گوتی: "وەی بەسەرچاو."

سەبری گورج هەستایە سەر پێ و هەڵگوردی کوڕی خستە باوەش ئامە خانەوە و خۆی چوو بەلای ئیشەکانیەوە.

* * *

ئەو شەوە ئامە خان و کاک حاجی لای سەبری مانەوە، بەتایبەتی چونکە سیروان و کوڕەکانیشی نەگەڕانەوە ماڵێ، هەتا درەنگانی شەو ئەمانیش هەر باس باسی گفتوگۆی حکومەت بوو، کە ئایا ڕاستە یان درۆ.

ئەو باسی خراپەکانی دەکرد و ئەوی تر باسی گفتوگۆ و مفاوەزاتەکەی پێشووی دەگێڕایەوە و فرتوفێڵ و پیلانەکانی حکومەتی دەژمارد، کە جاری پێشوو چییان کرد لە کێ و چ فیتێکیان نایەوە و بۆ کێ، هەروا ئەو سیانە بەیەکدا دەهاتن و جار وەکو شەڕی لێ دەهات و جار خاو دەبوونەوە، دنیاش تا دەهات سەرماکەی زیاتر دەبوو، بەتایبەتی کە لە ئێوارەوە ڕەشەباش هەڵی کردبوو، داروبەردی بەیەکەوە بەستبوو.

بۆ ڕۆژی دوایی، پاشنیوەڕۆ لە دوورەوە سەروکەللەی تۆفە دەرکەوت، ئامە خان ئەوەندەی نەمابوو سەلاوات لێ بدات لە خۆشیاندا و خۆیشی پێ نەگیرا، بەو سەرمایە چووە بەردەمی ماڵەکە و ڕاوەستا و بەدەم دەستڕاوەشاندن و خۆشیدەربڕین بەرانبەر بە هاتنی کاکە تۆفە، تۆفەش لە دوورەوە ئیشارەتی بۆ دەکرد کە "بڕۆرەوە ژوورەوە با سەرمات نەبێت و ئەوە بۆ لەوێ وەستاوی".

تۆفە گەیشتە جێ و لە بەردەم هەیوانەکەدا هەندێ خۆی تەکاند و گۆچانەکەی بە سنگەوە هەڵواسی و یەک دوو جامانە و ملپێچی لە سەری کردەوە و پێڵاوەکانی داکەند و کردی بە ژووردا.

هەموو بە خۆشی چوون بەپیریەوە، ئەویش هەناسەیەکی هەڵکێشا و دوو سێ قسەی بەم بەفر و زریان و هەلایە گوت.

لووتی سوور هەڵگەرابوو، دەست و پەنجەی تەزیبوون، قاچی سڕ ببوو لە سەرمان، دوای پشوودان و خۆگەرمکردنەوە، دەستی کرد بە باسی حەپسە خان و ئەوانەی لە ماوەتن، کە چەندیان بیر دەکەن و چەند دڵیان لایانە.

ئامە خان قورگی پڕ بوو لە گریان و چاوی خۆی سڕییەوە و گوتی: "وەڵا ئێمەش زۆریان بیر دەکەین، لە بەختی ئێمە دنیا بە قوڕ گیرا. دەڵێن چەند ساڵە سەرمای وا ڕووی نەداوە و نەبووە."

تۆفە دەستەکانی پان کردەوە لەبەر سۆپاکە و لووتی هەڵلووشی و گوتی: "نەوەڵا، دەڵێن دەمێ ساڵە سەرمای وا نەبووە، کوێخا مەولوود کە عومری هەشتا نەوەد ساڵە، دەڵێ لە ساڵی بەفرە هەرە گەورەکە تاکو ئێستا شتی وای نەدیوە."

تۆفە دەستی پێ کرد و چەند کەسێکی بەعومری کەشی ژمارد کە وایان گوتووە، ئینجا هەندێ کۆکی و بەدەم کۆکەوە گوتی: "باپیری بێستوونیش بۆی گێڕامەوە کە سەرمایەکی تریشی دیوە بە منداڵی، دەیگوت کەوا ئەم چەمەی بەردەممان وا بەستبووی کەوا ئەسپ و زەلام بەسەریدا هاتووچۆیان دەکرد."
دوای ئەم قسانە تۆفە ئاخێکی قووڵی هەڵڕشت و و گوتی: "کوڕە ئێوە دەڵێن چی، ئاگاتان لە وەزع نییە، کاشکی هەر سەرما بوایە."
ئامە خان بە پەرۆشییەوە کێشای بە سنگی خۆیدا و گوتی: "ئەیەڕۆ بەقوربان! خوا نەکا! بۆ چی بووە؟ خۆ ئێمە لەم دێیە لە دنیا دابڕاوین بە ناشکوری ناڵێم."
تۆفە مژێکی گەورەی لە جگەرەکەی دا و دەسرەکەی دەرهێنا و بە گرمۆڵەیی بە دەم و لووت و سمێڵیدا هێنا و نەرمە کۆکەیەکەی بۆ کرد و گوتی: "چۆن ئاگاتان لە هیچ نییە، ئەی شیروان و کوڕەکان هیچیان بۆ باس نەکردوون؟"
سەبری هەڵی دایێ و گوتی: "باسی گفتوگۆیەکەی حکومەت نەبێت؟"
تۆفە سەری بۆ لەقاند و گوتی: "با، ئەوە دەڵێم."
حاجی گوتی: "چییە، بۆچی ئەمە ڕاستە؟"
تۆفە کە دەیویست خۆی بە لێزان و شارەزای هەموو شت پیشان بدات، دەستی ڕاوەشاند و گوتی: "تازە هەموو شتێک بڕایەوە و دەڵێن وا گفتوگۆ دەست پێ دەکاتەوە."
سەبری گوتی: "تازە هەموو شتێک بڕایەوە و دەڵێن وا گفتوگۆ دەست پێ دەکاتەوە."
سەبری گوتی: "باشە ئەی تۆ لە ڕێگاوە سەرێکی بنکەی مەکتەبی سیاسیت نەدا بزانی شیروان و کوڕەکان دەیانگوت چی؟ ئەی بۆچی یەکێکیان نەهاتەوە لە دوێنێوە؟"
تۆفە دەستی دایە پیاڵە چایەکەی و لە سەبریی وەرگرت و گوتی: "ئەی من ئەمشەو لە کوێ بووم و لە کوێ نوستبووم؟ دەزانی دوو ڕۆژە من بەڕێوەم لە ماوەتەوە کە هەمووی سێ سەعاتە، فایی چی، خۆ ئێوە نازانن کە دەرەوە چۆنە، ئەمشەو من لای ئەوان بووم."
تۆفە دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "خوا ڕەحم کات، بەخوا زۆر ترساوم."
یەکەم جار بوو تۆفە بە ڕاستی و دڵپێوەبوونەوە باسی کارێک بکات وەکو ئەم جارە، لەبەر ئەوە زۆر بە مەلوولی و ناڕەحەتییەوە گوتی: "بەخوا پێشمەرگە هەموو مقۆمقۆیان تێکەوتووە، هەندیک دەڵێن ئەم گفتوگۆیەمان پێ خۆشە و قەیچێکە، با ئیتر ببڕێتەوە. هیی تریش دەڵێن وەڵا عاسمانیش بلێت دەست لە چەکەکانمان هەڵناگرین، لە سەرکەوتنداین و هێزیکی گەورەین و سەدان شەهیدمان داوە، گوایە لە ڕێی چی

وازبێنین و شوێن درۆی حکومەت بکەوین، وەکو دەزانین حکومەت کێیە و نیازی چییە."
تۆفە جگەرەیەکی تری داگیرساند و گوتی: "کوڕە کاکە هەر لە بەرچاوی خۆم ئەو شەوە پێشمەرگە بوون بە دوو بەشەوە و دەستیان دایە تفەنگ و دەمانچە لە یەک و سەد هەزار جنێوی پیسیان بە یەکتر دا و دەڵێن لە دوو سێ بنکەی تریش شتی وا ڕووی داوە."
گوێگرەکان ناڕەحەتی و داماوی لە چارەیان دەباری وەختێ گوێیان لەم قسانە بوو، بۆیە کاکە حاجی بە مەلوولییەکەوە گوتی: "ئەی هاوار! بەخوا ئەوە نیشانەیەکی خراپە!" هەردوو دەستی پان کردەوە و لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی ئاسمانی کرد و گوتی: "خوایە ڕەحم بەم کوردە هەژارە بکەیت و ناکۆکی و دوودڵییان نەخەیتە ناو، بەخوا بەرگەی هەموو شتێ دەگرین هەر ئەوە نەبێت ئەو ڕۆژە ئەو ناکۆکییە ڕوو بدات، ئەو ڕۆژە دەبێتە سەرەتای نەگبەتی و فەوتانی کورد، یاڕەبل عالەمین قەت قەت کورد تووشی ئەم نەگبەتییە نەکەیت."
سەبری بە سەرسووڕمانێکەوە ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "ئەیەڕۆ! ئینجا بۆچی هیچ لێپرسراو و سەرکردە لەو شوێنانە نین، کە دوو قسە بۆ پێشمەرگەکانمان بکەن و تێیانبگەیەنن تێیانبگەیەنن و نەهێڵن وابکەن."
بە ماتییەوە کێشای بە سنگی خۆیدا و بە ماتەمینێکەوە گوتی: "ئەوە بۆ شیروان وا شپرزە و تێکچوو بوو! هەرچییەکم لێ دەپرسی دەبوو بە فیشەکەشێتە و دەچوو بە ئاسماندا."
تۆفە سەری ڕاوەشاند و گوتی: "ئەوە هەفتەیەکە ئەم قسەیە بڵاو بووتەوە." نەختێ دەنگی نزم کردەوە، وەک لەگەڵ خۆی قسە بکات و حەز نەکات ئەوەندەی تر بەو قسەیە دڵیان ناڕەحەت بکات، لەسەرخۆ گوتی: "لێپەسراو و سەرکردەی چی؟ ئەوان خۆیشیان بوون بە دوو بەشەوە."
ئامە خان بە دڵێکی داخورپاوەوە دەمولێوی بە لکی سەرپۆشەکەی داپۆشی و سەیرێکی تۆفەی کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئۆی خوا نەتهێنێتەوە بۆ خۆت و دەنگوباست! خۆ بە جارێک دنیای بەقوڕ گرت!"
کاکە حاجی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "ئەی نەدەبوو یەکێ لە کوڕەکان بێتەوە؟ ئەی شیروان چیی دەکرد؟"
تۆفە بەدەم جگەرەداگیرساندنەوە گوتی: "شیروانی فەقیر بڵێ چی، هەر بەوەدا دەگات قسەیان بۆ بکات و پێیان بڵێت وامەکەن و دان بە خۆتاندا بگرن، تا وەزعەکە ڕوون دەبێتەوە و ئەو برادەرانە دەگەڕێنەوە لە سەفەر."

ئـامه خـان، که هەر لەبەر پەنــجەرەکە دانیشــتبوو، بە گەرمیـیەوە هەڵـبەزی و گـوتی: "ئۆخەی! وەڵا ئەوە نەورۆز گیان هاتەوە."
هەموو ڕاپەڕین و گوتیان: "ئەوچاتر! با بێت، بەشکم تێمانگەیەنەێت بزانین ئەمە چییە."
تۆفە ئەم قسەیەی پێ ناخۆش بوو، ڕووی کردە جەماعەت و گوتی: "ئەویش هەر ئەم قسانەتان بۆ دەکات، قسەی ئەو شاخ و باڵی نییە، وەڵا دەڵێی قەت ئیتر باسی هیچتان بۆ نەکەم!"
نەورۆز کردی بە ژووردا، ئەویش ئەوەندە خۆی پێچابووەوە، مەگەر هەر ئامە خانی دایکی بیناسیایەوە. سەلامی لە جەماعەت کرد و هەواڵی پرسین و هەر بە پێوە یەک دوو قسەی گاڵتەی لەگەڵ تۆفە کرد و هاواری سەبریی کرد، کە زۆری برسییە و یەک دوو ماچی هەڵگوردیشی کرد، ئینجا دانیشت.
باوکی بە پەرۆشەوە ڕووی تێکرد و گوتی: "کوڕم بەخێر بێیتەوە، پێش هەموو شتێک باسی وەزعمان بۆ بکە، لە دوێنێوە زۆر نارەحەتین و ئارامیمان لێ بڕاوە." نەورۆز بە ڕوویەکی خۆشەوە سەیری باوکی کرد و گوتی: "وەزعی چی؟ وەڵا شوکور وەزع خۆشە و هەر ئەم سەرما و بەفرە نەبێت دنیای ناخۆش کردووە، خەڵک خواخوایەتی هەر نەیەتە دەرەوە و لەبەر سۆپا هەڵنەسێت، لە دوێنێوە هەر دەمگوت ئێستا دەڕۆم و تۆزێکی تر دەڕۆم، کەچی هەرچەندم دەکرد تاقەتم نەبوو، بەتایبەت کە بیرم لەم سەر و هەورازە دەکردەوە."
باوکی بە زەردەخەنەیەکی کاڵی مەلوولەوە سەیرێکی کرد و گوتی: "دیارە دەنگوباسی گفتوگۆ و مفاوەزات کاری تێکردوویت و تەممەڵی کردوویت، ئەگینا خۆ ماشەڵا تۆ ئەوەتەی زستانە دەڵێی ئاسکی بەسەر ئەم گرد و شاخوداخ و هەورازانەوە، مانگێک لە گردەڕەش بوویت دەتگوت بەفرمان دەکوڵاند تاوەکو ئاو بخۆینەوە، ئەمە بۆ لەپڕ وات لێ هات."
حاجی لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "تۆ جارێ باسی ئەم دەنگوباسەمان بۆ بکە، ئەمە ڕاستە یان درۆیە؟"
نەورۆز کە هەر دەستی گەرم دەکردەوە و دەستی هەڵدەگڵۆفت و دەستی لەوە دەچوو کە زۆر تەزیو بووبن، ڕووی کردە باوکی و گوتی: "وەزع شوکور باشە و گفتوگۆیەکەش هێشتا هەر قسەیە و جارێ مەعلووم نییە."
ئامە خان سەیرێکی تۆفەی کرد و دوایی ڕووی کردە نەورۆز و بە سەرسووڕمانێکەوە گوتی: "ئەی تۆفە دەڵێت تەواو تازە بڕاوەتەوە، وا دەستی پێ دەکەن و پێشمەرگە بوونەتە دوو بەش و دەستیان داوەتە تفەنگ و دەمانچە لەیەک." ئینجا دەستی دا بە سنگی خۆیدا و گوتی: "ئێمە وا خەریکە زیڕە دەکەین لە داخاندا، ئەی ئەمە چییە؟"

نەورۆز دەستێکی هێنا بە سەر و ملی خۆیدا و گوتی: "نەبابە، دوو بەشی چی و حاڵی چی، ئەوە کاکە تۆفە بەسەهوو چووە و وانییە کە ئەو بیستوویەتی."
تۆفە مژێکی لە جگەرەکەی دا، کە زۆری کات لە پەنجەکانی جیا نەدەبووەوە و هەندێ سنگی دەرپەڕاند و گوتی: "دەڵێیت ئەمشەو لە بنکە نەبوویت یان خۆت خەوت لێ کەوتبوو، کوڕە چۆن هیچ نەبووە! ئەی ئەو دەست لە یەخە گیرکردن و شەڕەجنێوە چی بوو؟ خۆ عەریف و ڕەسوڵ و قالەی ئامە سوور خەریک بوون یەکتر بکوژن لەسەر ئەوە، من نەبوومایە دەستم بادا و دەمانچەکەم لێ سەند، خوا دەیزانی چی قەومابوو."
ئامەخان لە ژێر لێوەوە گوتی: "دیسانەوە خۆی تێخست، خۆزگە جارێک باسی ڕووداوێکت بکرایە بێ ئەوەی ئەم فشەکەرە خۆی تێخستایە، دایکم سەرلەشکر ئەوە، دختۆر ئەوە، حەکیم و ئەرستۆ و ئەقڵداری دونیا هەر ئەوە و کەسی تر نییە."
نەورۆز کە خەریک بوو بداتە پرمەی پێکەنین، گوتی: "کوڕە کاکە گیان من چۆن لەوێ نەبووم، ئەی هەر ئەو کاتە نەبوو جگەرەکەت لە کاک شیروان سەند و من بۆم داگیرساندی؟ کاکە پێشمەرگەش بەشەرن، ئەوانیش ڕەنگە هەزار نارەحەتی و تەگەرەی تایبەتی و گشتییان هەبێت، ئەوانیش وەکو خەڵکی تر تووڕە دەبن و دەچن بەگژ یەکدا و پەلاماری یەک دەدەن، هەموو کەس هەروایە، لە ناو خێزانێکدا ڕۆژی بزانە چەند دەماقاڵی و شەڕ دەقەومێت، نەخوازەڵا لە ناو ئەوانە، کە بەم سەرماوسۆڵەیە هەمیشە ئامادە و حازرن و ڕۆحیان لەسەر لەپی دەستیانە. کاکی من ئەوە ئەو دوانەش لەسەر شتێکی تر ناکۆکییان هەبوو، ئیتر ئەم باسی گفتوگۆیەیان کرد بە بیانوو."
تۆفە سەری ڕاوەشاند و گوتی: "چاک دەفەرمووی، با وابێت، بزانە دوایی قسەی کاممان ڕاست دەردەچێ."
سەبری بە سینییە نان و چێشتەوە گەیشتەوە ژوورێ و نانەکەی لە بەردەم نەورۆز دانا و بە پێکەنینەوە گوتی: "یاخوا هەردووکتان بەخێر بێنەوە، خۆ ئێستاش نەمانزانی مەسەلە چییە و ئاخری چی بوو..."
مامی بەدەم تەسبیحاتەوە گوتی: "ئیتر خوا ڕەحم بکات، من هەر ئەوەندە دەڵێم خوا نارێکی و ناکۆکی نەخاتە ناو ئەم برادەرانەوە و هیچ کات کورد تووشی ئەو نەگبەتییە نەکات، قەدیمی بە بە درۆیان نەگوتووە 'برا لە پشت برا بێت، مەگەر قەزا لای خوا بێت'. دوژمن بە هیچ شتێک زەفەرمان پێ نابات و ناتوانێت کورد لەناو بەرێت، بەوە نەبێت کە دوودڵییان بخاتە ناو و بیانکات بەگژ یەکدا، بەڵام کە لە پشت یەک بن و هەموو پشتی یەک بگرن و قسەیان یەک بێت، هەمیشە سەردەکەون و خەڵکیش حورمەتیان دەگرێت و دوژمنیشیان لێک دەبێتەوە."

نەورۆز بەدەم نیسکێنەهەڵقوڕاندنەوە گوتی: "بەڕسستی بابە گیان وایە و زۆر ڕاستە، بەلام ئەوەشت بیر نەچێت، ئەوانەی قازانج لە شێواندن و تێکدانی ڕیزی برایەتی دەکەن، هەمیشە لە پیلانی خۆیان ناکەون و ژەهری خۆیان هەر دەڕێژن و قسە دەبەن و قسە دەهێنن لە بەینی دوو برادا. خوا ئەوانە بگرێت و هەقە سەری ئەوانە پان بکرێتەوە، ئەگینا ئەوەتەی پارتی هەیە و شۆڕش دەستی پێ کردووە، هەموو لایەک یەکدەستن و سوێند بە سەری یەکتر دەخۆن."

نەورۆز بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە ڕوووی کردە تۆفە و ئەویش پێش پێی ئەو لە نانخواردن ببووەوە و خەریکی چاخواردنەوە بوو، کە هەر ناوی چا بوو، ئەگینا لە مەرەکەب دەچوو ئەوەندە خەست و کولاو بوو، چونکە تۆفە وای حەز لێ دەکرد.

نەورۆز ڕووی قسەی کردە ئەو و گوتی: "توخوا کاکە تۆفیق گیان قسەکانم ڕاست نین؟"

تۆفە قومێکی چاکی لە چایەکەی دا و نەختێ لە دەمیدا هێشتیەوە و بەلەزەتیش قوتی دا و ڕووی کردە نەورۆز و بە تەوسەوە گوتی: "بەڵێ قوربان، قسەت وەک نەخشی بەرد وایە." بە گەرمییەوە قسەکەی تەواو کرد و گوتی: "کوڕە تۆ چووزانی قسە بکەیت، قسەکردنیش خاوەنی خۆی هەیە."

سەبری دایە پرمەی پێکەنین و گوتی: "نەورۆز ئەشهەدوبیلا، کاکە تۆفە گیان ڕاست دەکات، تۆ چووزانی قسە بکەیت، قسەکردنیش خاوەنی خۆی هەیە."

ئیتر بە جارێک هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین، تۆفە نەبێت.

* * *

حەپسە خان بەدیار ئاگردانەکەوە دانیشتبوو، خەریکی چێشتلێنان بوو، لەبەر خۆیشیەوە بۆڵەبۆڵی دەکرد و تووڕە ببوو بەدەست داری تەڕ و دوکەڵیەوە، دەستێکی بە ئاگرخۆشکردنەوە بوو و دەستێکی بە چاو و دەم و لووتی خۆیەوە بوو.

قسەی بەم سەرمایە دەگوت، دڵیشی زۆر لە مەراقدا بوو، چونکە تا دەهات قسەوقسەڵۆک و باسی ناکۆکیی زیاتر دەبیست، هەر کەسەش شتێکی دەگێڕایەوە. دڵی لای کوڕەکانی و زاوا و خوشکەزاکانی بوو، دڵی لای کوڕی خەڵکی تر دەبوو، کە هەموویان لە لای وەک کوڕی وابوون و هەموویانی وەک ئەوان خۆش دەویست. دەترسا کە باسی ئەم ناکۆکی و دووبەرەکییە ڕاست بێت. ئەوێ کە شەوێ عەلی و حسێن خەریک بوون دەست بدەنە یەخەی یەک بۆ یەکەم جار لە بەرچاوی باوکیان، هەر بە تەواوی بڕستی بڕێ و تێیگەیاند کە بەڕاستی ئەمە چ خەمێکی کەمەرشکێنە. پێش ئەم قسانە وا دڵنیا و ئارام و دڵخۆش بوو، وای دەزانی دنیا هەمووی هیی ئەوە، کە یەکێ لە کوڕەکان دەهاتەوە و باسی شەڕی پێشمەرگەیان بۆ دەکرد کە لە کوێ

چییان کردووه و له فلان شوێن چەند سەرکەوتوون و ڕێگایان بە چ قافڵەیەکی عەسکەری گرتووە، گەز گەز باڵای دەکرد لە خۆشیاندا و دەستی دەکرد بە قوربان و لەدەورگەرانیان، کە باسی ئەوەشیان دەکرد لە شەڕێکدا پێشمەرگەیەک شەهید بووە، دەستی دەکرد بە گریان و دڵی دەگوشرا، وای دەزانی کە یەکێکی زۆر خۆشەویست و نزیکی شەهید بووە، بێ ئەوەی هەر چاویشی بەو شەهیدە کەوتبێ.

ئەم ژیانی لادێی و قوڕ و چڵپاو و بێحەمامی و پڕ لە هەزار کەموکوڕییەی لە لا سەیران بوو، چونکە هیوا و ئومێدێکی هەبوو.

زۆر جار مەسەلەکەی دەگوتەوە کە دەڵێت: "ماسی بگری، دەبێ قولەپێشت تەڕ بێت." ئەی خوانەکردە ئەگەر ئێستا وەزع وا نەما و ئەو برایانە بوون بە دوو بەشەوە و چوون بەگژ یەکدا، ئیتر ژیان بەلای ئەو و هەزارانی وەکو ئەو چ خۆشییەکی تێدا دەمێنێت و چ نرخێکی دەبێت و پاداشتی ئەم ڕەنج و تێکۆشان و خەباتی سەختی چەند ساڵەی کورد چیی لێ دێت؟

حەپسە خان بە دڵێکی گوشراو و چاوێکی پڕ فرمێسکەوە، بە مەلوولی لە خوا دەپارایەوە کە قەت ڕووداوی وا پیشانی کورد نەدەیت و ئاوێک بکەیت بەم ئاگرەدا و ئەم برایانە لەیەک نەکەیت.

لەم بیر و قسانەدا بوو کە لەسەر دەنگی نەوبەهاری بووکی هاتەوە سەرخۆ، کە لە هیوانەکەوە دەنگی هات و گوتی: "ئەرێوەڵا ئەوە کاکە تۆفە هاتەوە، یاخوا بەخێر بێتەوە، ئەوە بۆ وا دواکەوتیت!"

حەپسە خان برێ داری تری خستە ئاگرەکەی ژێر چێشتەکەی و و هەستایە سەر پێیان و ڕووی کردە لای نەوبەهار کە لە هیوانەکە ڕاوەستابوو و قسەی لەگەڵ تۆفە دەکرد. تۆفەش خۆی دەتەکاند و پێڵاوە پۆتینەکانی دادەماڵی و هەر کۆفولۆفی بوو لەتاو سەرما. حەپسە خان بەخێرهاتنی کرد و هەواڵی خوشکی و سەبریی کچی و ئەوانی تری پرسی و دوایی گوتی: "ئەوە بۆ دواکەوتی؟ هەفتەیەکە ڕۆیشتوویت؟"

تۆفە ئاوڕێکی لێ دایەوە و بە خێسەکەیەوە گوتی: "هەفتەیەکە ڕۆیشتوویت؟ قسەی بەرئاگردان دەکەیت، بۆچی تۆ دەزانی چەند بەڕێوە بووم و چۆن ئەو ڕێگایەم بڕیوە؟ لەمسەر شەوێک و لەوسەریش شەوێک لە بنکەی مەکتەبی سیاسی ماومەتەوە و لە دوو سێ هەورازدا خەریک بوو هەر بخنکێم کە ئەو ڕەشەبایە بە بەفرەوە دەیدا لە دەموچاوم، هەر هەناسەی لەبەر دەبڕیم."

حەپسە خان بە مەلوولییەکەوە گوتی: "دڵم خۆش بوو وام دەزانی ئامەی خوشکیشم لەگەڵ خۆت دەهێنێ بۆیە ئەوەندە دواکەوتیت."

تۆفە، کە هەر خەریکی خۆی بوو، بێ ئەوەی سەیری حەپسە خان بکات گوتی: "بە چی بمهێنایە؟ بە تەیارە یان بە پەڕەشووت؟"
حەپسە خان گوتی: "باشە باشە نەمانویست! حەواڵە بە خوا بێ! قسە وەرامدانەوەت چەند حازرە، دایم دەڵێی دەمانچەی و لەسەرپێی."
بە بۆنەی گەڕانەوەی تۆفەوە بۆ ماوەت، شەوێ ڕووناک و بێستوون و نەسرین و حسێن هەموو کۆمەڵ بوون لە ماڵی حەپسە خان و حاجی مەجید، ئەوانیش وا ناڕەحەت و بێتاقەت ببوون لەتاو ئەو قسەوباسانەی دەیانبیست، کەسیان جێیان بە خۆیان نەدەگرت، هەزار ئەوەندە بەفر و تۆف بوایە خۆیان هەڵدەکرد و دەچوونە لای یەک. ئەو شەوە هاتنی تۆفەیان کرد بە بیانوو و هاتن و لە دەوری یەک کۆ بوونەوە و سەری قسە و بنی قسەش هەر ئەو دەنگوباسە بوو. تۆفە سنگی دەرپەڕاندبوو و هەژدەر هەژدەر قسەی دەکرد و باسی ماڵی ئامە خان و کاکە حاجی و سەبری و ئەوانی بۆ دەگێڕانەوە، کە چییان گوتووە و چۆن ئەوانیش ناڕەحەتن و لە مەراقن، بەڵام وەکو شتێک بیری نەبوو یان نەیدەویست کە باسی شەڕی پێشمەرگەکان بکات، کە چۆن پەلاماری یەکیان داوە و چۆن دەمانچەیان لەیەک کێشاوە.
هەروەها باسی پاڵەوانیی خۆیشی بۆ دەکردن، کە وەکو ئەو نەبوایە دەستی بادانایە و دەمانچەی لێ بسەندنایە، یەکتریان کوشتبوو.
حەپسە خان سەیرێکی نەسرینی کرد و بە پەرۆشییەوە گوتی: "توخوا نەسرین سەرباقی دەردان، دراوسێ عەرەبەکەتان لە چیدان؟ لەو ڕۆژەوە باست کردوون ناڕەحەتم بۆیان."
نەسرین دەمی خۆی داپۆشی بە لکی سەرپۆشەکەی و پێکەنی و گوتی: "وەڵا بڵێم چی، خەڵک بەزەییشی پیایانا دێتەوە و پێکەنینیشی پێیان دێت، بەتایبەت بە کراس و کەوای ژنەکە." نەسرین قسەکەی تەواو کرد و گوتی: "ژنەکە زۆر بەسەزمانە، هەر دەگری و هەر شەڕ دەکات لەگەڵ دوو کوڕەکەی، پیاوەکەش زۆری کات لە بنکەیە، هەندێ جار حسێن لەگەڵ خۆی دەیهێنێتەوە بۆ لامان، منیش ژنەکەی بانگ دەکەم."
تۆفە هەڵی دایەوە و گوتی: "گوایە بۆچی دەگری؟"
نەسرین گوتی: "دەڵێت ئێمە فێری شوێنی وا سارد و بەفر نین و فێری ئەم ژیانە نەبووین."
تۆفە گوتی: "تۆش پێی بڵێ شوکری خوا بکە کە خۆت و مێرد و منداڵت گەیشتوونە ئێرە و شۆڕش داڵدەی داون، ئەگینا ئێستا مردبوون."

مژێکی لە جگەرەکەی دا و گوتی: "بەڵێ فێری ئێرە نین، فێری قەسر و خانووی خۆشن، دە با بیخۆن و بزانن کە خەڵک هەیە وا دەژی." لە ژێرەوە جنێوێکی دا بە خۆیان و گەورەیان.

پیاوە عەرەبەکە کاربەدەستێکی گەورەی سوپا بوو لە بەغدا، لە یەکێ لەو ئینقلابانە توانیبووی ڕابکات لەگەڵ ژن و منالی و خۆی بگەیەنێتە شاخ. حسێن بۆیە هەڵی دایێ و گوتی: "وەڵا پیاوەکە زۆر نەجیبە و ژن و ماڵەکەشی هەروەها، هەمیشە دەڵێت نازانم بە چ زمانێ من مەمنوونییەت بەرانبەر ئەم شۆڕش و پێشمەرگانە دەرببڕم کەوا خۆم و ماڵ و منالیان ڕزگار کرد و زۆر مەتحی کورد دەکات و دەڵێ قەت نەمدەزانی ئەوەندە پیاون."

بێستوون گوتی: "دیارە پیاوەکە بەحورمەتە، بەو هەموو پلە بەرزەی عەسکەرییەوە کە هەیبووە، کەچی خۆی دەخاتە ڕیزی پێشمەرگەیەکی بچووک ئەوەندە بێدەعیبیە."

تۆفە دیسان هەڵی دایێ و گوتی: "ئەوە لێی قەوماوە بۆیە وایە، بە خوا ئەگەر دەستی ببێت ئەویش لەوان خراپتر دەبێت، ئەوە ئێوە ئەمانە چۆن دەناسن." حاجی مەجید کە لە سەرووی ژوورەکە دانیشتبوو و کوردۆی کوڕەزای لە باوەشدا بوو یاریی لەگەڵ دەکرد ماچی دەکرد و تەسبیحەکەی دەکردە مل، وەرامی تۆفەی دایە و و گوتی: "کاک تۆفە وامەڵێ، هەر چاکە چاکە، چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە."

ئێستا ئەم پیاوە مادام پەنای هێناوەتە بەر شۆڕش، دەبێ بە چاوێکی بەزەییەوە سەیر بکرێت و بە هەموو تواناوە بپارێزرێت و حورمەتی بگیرێت.

* * *

ئەو زستانە سەختە ئاخری بڕایەوە، کە لە لای حەپسە خان و خوشکی و گەلێ خەڵکی تریش هەر لە بڕانەوە نەدەهات و لە لایان وابوو کە هەرگیز جارێکی تر گەرمیان نابێتەوە و ئەم بارە جلەی لەبەریانە جارێکی تر سووک نابێ و لەکۆڵیان نابێتەوە، کەچی نەک هەر بەفر و سەرما نەما، بەهاریش بە گوڵ و گوڵزاریەوە بە بۆنی گژوگیای دڵفڕێنەوە ئەویش هات و کۆن بوو وا هاوینیش دەستی پێ کرد، دارودرەختی ئەو ناوانە لقوپۆپی بڵاو کردبووەوە، بە گەڵای سەوز و جوان و میوەی جۆراوجۆر ڕازابوونەوە.

نزیک کانیاو و پلوسک و هەورازونشێو و دۆڵ و بناری کودستانی شیرین هەموو ببوونە هاوینەهەوار و پەنا و جێی پشوودانی ڕێبوار و شوان و مەڕومالات، ئێواران خەڵک دڵی دەکرایەوە کە بەقەد شاخەکانەوە دووکەڵ و تروسکە ئاگری نانکردن و چێشتلێنانی دێهاتییەکانیان دەبینی، کە بە زۆری خانووەکانیان بەجێ هێشتبوو و چووبوون بەدیار ڕەز و تووتن و زەراعەت و دەغڵ و دانیانەوە دانیشتبوون، لەو

کاتەدا دەنگوباسی دووبەرەکی و شەڕی براکوژی و پەلاماردانی یەکتری گەیشتبووە ئەوپەڕی، ماتەمینیی خەڵکی داگرتبوو، پیاوی ناسراو و پیر، پیاوی ماقووڵ و کەسی کوردپەروەر کەوتبوونە ناوبژی، بەڵام سوودی نەبوو، چونکە گێرەشێوین و ئەوانەی قازانجیان لەو ناکۆکییە دەکرد، هەمیشە لە گەڕدا بوون و بە خۆشییەوە نینۆکیان لە یەک دەخست، لە چەندین شوێن برا برای دەدایە بەر دەستڕێژی گوللە، حکومەتیش شایی و هەڵپەڕکێی بوو، ئەی بۆ نا، چی باشتر و خۆشتر بوو بۆ ئەو لەوەی کە کورد کورد بکوژێت و یەکتر قڕ بکەن و بێهێز و لاواز بکەونەوە بەردەستی و ئەویش بە کەیفی خۆی تۆڵەی بەرودوایان لێ بکاتەوە، ئاخری وای لێ هات کە زۆر ماڵی منداڵدار و خەڵکی پیر و نەخۆش، لە ناو دەست و پێی لاچن و بکەونە ڕێ و لە چەمەکە بدەن و بڕۆن بەرەو ئێران.
ئەو ماڵانەش دیسان ماڵی حەپسە خان و خوشکی و خێزانیان بوون، چونکە منالّی ساوا و کۆرپە و سەروبنیان هەبوو، هەروەها حاجی مەجیدیش کە نەخۆشیی دڵی هەبوو، چەند شەرەکە گەرم دەبوو، ئەو زیاتر پەرێشان دەبوو، ڕۆژی چەند جارێک لەهۆش خۆی دەچوو.

❊ ❊ ❊

بەختیار بەیانییەکیان بە هەڵەداوان گەیشتە ماڵێ و بە ئەسپایی بە دایکی و سەبری و ئەوانی گوت: "هەستن، هەروا ئەو شتانەی زۆر پێویستن کۆی بکەنەوە با بڕۆین دەربازتان بکەین، شەڕەکە گەیشتە نزیک ماوەت، وا ماڵی مامیشم بەڕێوەن."
ئامە خان چاوی زەق بوو و دەمولێوی وشک بوو و خۆی گرمۆڵە کرد و دانیشت و گوتی: "ئەیەڕۆ! قووڕ بە سەرم! دوور لە سەری ئێوە، خۆ ئەوە بوو بە ڕاست!"
بە هەردوو چەپۆک کێشای بەسەری خۆیدا و گوتی: "ئەی کوڕەکانی تر کوان؟" دوایی وەک شتێکی بیر بکەویتەوە، هەندێ هاتەوە سەر خۆی و گوتی: "بۆچی بڕۆین؟ دوێنێئێوارە عەبەی کاک فەتاح و پێشمەرگەکانی بێرەدا تێپەڕین، هاتن بۆ لامان و چایەکیان خواردەوە، کاکە عەبە بە من و سەبری و حاجیی گوت: 'دڵتان هیچ نەکات، ئەوەتا هێزەکەم لە سەروو گردەکەی نزیکتانەوەیە، ئاگام لێتان فەبێت هیچ ترستان نەبێت و مەشڵەژێن.'"
بەختیار بە زەدەخەنەیەکی تەوساوییەوە دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "عەبەی کاکە فەتاحت ئەوەتا پێش ئێوەش گەیشتووەتە ئێران بە ماڵ و منالّەوە." بەختیار پەلەی لێ کردن و گوتی: "زوو بکەن، دەی وەختی ئەم قسانە نییە، هەروا چەند شتێکی سووک و پێویست بێنن لەگەڵ خۆتان و حازر بن تاکو بتانبەین." بەختیار کە بینیی نائومێدی و

سەرلێشێواوی خەریکە هەرەس بە دایکی و ئەوان دەهێنێت و دەستەپاچە بوون و نازانن چی بکەن، بۆیە بە زەدەخەنەیەکی دەستکردەوە و سەیری کردن و گوتی: "خۆ نارۆین بە یەکجاری، هەروا بۆ چەند ڕۆژێک، ئیشەڵا زوو ئاو دەکرێ بەم ئاگرەدا و دەگەڕێینەوە، خەڵک زۆر کەوتوونەتە بەین و ناوبژی و بە گەرمی خەریکن."
باوکی بە مەلوولییەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی: "پەنا بە خوا، خوا ئاگرێکی ڕەحمەت بکا بە دڵی هەردوو لادا."
ئەوەندەی پێنەچوو شیروانیش هاتەوە، سەبریی بانگ کردە ژووری و چووە نزیکی و زۆر لەسەرخۆ وەکو هیچ نەقەومابێت، پەلاماری سەبریی دا و دوو سێ ماچی کرد، سەبری خۆی لەدەست ڕاپسکان و بە تووڕەییەوە گوتی: "ئەیەڕۆ! ئێستا وەختی ئەوەیە! ئەرێ ئەوە تۆ بۆ ئەوەندە خۆپەرست و کەمتەرخەمی!"
شیروان گوتی: "ئەمە چەند مانگێکە نان و ئاوم لە خۆم حەرام کردبوو، قوڕگم هاتبووە یەک، تازە ئەوەی لێی دەترسام قەوما، ئیتر منیش گوێ نادەمە هیچ، خوا دەیکرد هەر ئێستا دەکوژرام." جارێکی تر چوو بەلای سەبرییەوە و دوو سێ ماچی تری کردەوە و کوڕەکەی کردە باوەش و کەوتە ماچکردن و یاریکردن لەگەڵی، تاوەکو سەبری پەڕوپیتاڵ و هەندێ خواردن و کەلوپەلی حازر کرد بۆ ڕۆیشتن.

* * *

ئێوارە بوو، ڕۆژ خەریک بوو ئاوا دەبوو، تیشکی زەرد و بێتینی بەسەر لوتکە و هەندێ لێوار و کەناری شاخەکانەوە مابوو، دەتگوت لە تەریقیدا دەیەوێت خۆی بشارێتەوە و ئەویش زۆر دڵگیر و نارەحەت و بێدەسەڵاتە بەرانبەر بەو کردەوە ناشیرینەی کە ڕووی داوە و بە شەرمەوە لەو بەرزییەوە، چاوی لێیە کە چۆن برا پەلاماری برای خۆی دەدات و چەند بە دڵێکی پڕقین و دووژمنانەوە یەکتری دەدەنە بەر گوللە و دەستڕێژ، وەک حەیوانی کێوی و دڕندەیان لێ هاتووە و هیچ هەست و هۆشیان نەماوە و ناڵێن کە ئەمە بۆ و لەبەر چی؟ لەسەر چی وا لە یەک دەکەن؟ خۆمان لەناو دەبەین و خۆمان بە قڕ دەدەین؟ ئەو هەموو گەنج و قارەمان و خەباتکەری چەند ساڵە لە یەک دەکوژرێن، کە تاوەکو دوێنێ برا بووین لە سەنگەرێکدا و خۆشی و ناخۆشی و گریان و پێکەنینمان باوەشی دەکرد بە یەکدا و تێکەڵاو دەبوون و دەچوونە ناو یەک گیانەوە، بۆچی وا بێڕەحمانە خوێنی گەشی یەکتر دەڕێژن؟ ئێمەی بێکەس و تاکوتەنیا لەم دنیا فراوان و بەرینەدا و لە ناو ئەو دوژمن و ناحەزە زۆرەماندا، کە خواخوایانە لەناومان ببەن و بێهێز و بێدەوڵەت و بێناونیشانمان بکەن، کەچی ئەوەتا خۆمان ئاواتی دوژمنی

گەلە هەژارەکەمـان هێنـاوەتە دی و وا خۆمـان، خۆمـان لەبـاتیی ئەوان، یەکتـری لەنـاو دەبەین.
ئەو ئێوارەیە زۆربەی هەڵاتووەکانی شەڕی براکوژی بەرەو چەمەکە دەهاتن، بۆ ئەوەی بـپەڕنەوە بـۆ دیـوی ئێـران. ئەمـبەری چەمەکە کوردسـتانی عێـراق بـوو، ئەوبەری کوردستانی ئێران بوو، چەند خیزانێک بە منداڵ و گەورەیانەوە دانیشتبوون و چاوەڕێی پەڕینەوەیان دەکرد.
هەنـدێ پێشـمەرگە و خەڵکـی دێهاتەکـانی ئەو دەوروبەرەش خەریکـی لقوپـۆپی دارودرەخـت و گـوریس و تەنـاف بـوون، کە کەڵەک دروسـت بـکەن و ئەو خێـزان و خەڵکەی پێ دەرباز کەن، چونکە چەمەکە زۆر بەگوڕ و خوڕ بوو و زەلام و ولاخیشـی دەبرد و ڕادەماڵی لەگەڵ خۆی.
مـاڵی حەپسـە خـان و ئەوان هەمـوو گەیشـتبوونە ئەوێ و بە کەساسـی و مەلـوولی و سەرلێشـێواوی، بە چـاوی پـڕ فرمێسـکەوە دانیشـتبوون، تەنهـا تـۆفە و بەختیـار بە دیاریـانەوە بـوون، عەلـی لەگەڵ هێـزەکەی مـابووەوە، حسـێن چووبـوو بـۆ لایەکـی تـر، شیروان و سەبری و ئامە خان و حاجی ڕەوانە کردبوو و خـۆی نەدەزانـرا چـوو بۆ چ لایەک.
تـا دەشـهات خەڵکـی ئەو دەوروبەرە دەهـاتن بە دەنگوباسـی نـاخۆش و دڵتەزێـنەوە، خواردن و توێشوویان بۆ خۆیان و ئەو خەڵکەی سەچەمەکە دەهێنا، هەندێ مەنجەڵە چێشتی بۆ ئاشنا و خزمی دەهێنا، کە خەریکن بڕۆن.
چەنـد کەسـێکیش پەڕیبـوونەوە بـۆ ئەوبەر بـۆ ئەوەی ڕەزامەنـدیی دەوڵەتـی ئێـران وەربگرن تا خەڵکەکە بچنە نـاو دیوی ئەوانەوە، هیی وا هەبوو لەگەڵ ئاشـنا و خزمـی دەچوونە پەنایەک و دەبووە چپەچپیان، کە ئەم چەکە چاکەی نەباتە دیوی ئێران و بیدا، بەشکم چارەیەک بدۆزنەوە کە لێرە بۆی هەڵگیرێت
ئیتر دیمەنێکی یەکجار دڵناخۆشکەر، ماڵکاولکەر و پڕ شەرمەزاری بوو بۆ هەردوو لای پەلاماردەر و شەڕکەر و براکوژ.
ئینجـا ئەمە نەک هەر لەو نـاوچەیە وابـوو، بگـرە بە درێژایـی هەمـوو ولاتەکە وای لـێ هـاتبوو، لە شـارەکان ئەوانەی سـەر بە هەردوو لا لەسـەر جـادە و کـۆڵان و بـازاڕ یەکتریـان دەدایە بەر شـەق و تێلا و داروبەرد، منـاڵ و گەورە و لاو و گەنجی هەردوو لا دەگەڕانەوە ماڵەکانیان، هەموو بە سەری شکاو و دەمولووتی خوێناوشییەوە.
دیار بوو کە ئۆباڵی ئەم کوشتوکوتار و خوێنڕشتنە، ئەو ڕووداوە نالەبارەش هەمووی دەچووە مل و ئەستۆی سەرکردەکانی هەردوو لا، چونکە دەبوو ئەوان واز لە هەندێ

کەللەرەقی و خۆپەرستیی خۆیان بهێنن و بگەنە ئەنجامێک و نەهێڵن کە ڕۆژگاری ئەو میللەتە بێکەسە بگاتە ئەم ڕۆژە ڕەشە و دەبوو لەوە زۆر دووربینتر و لەخۆبوردووتر بن، کە بوون.

هەندێ سەرکردە هەبوو کە سەرەتای ناکۆکییەکە دەستی پێ کردبوو، دەیقیڕاند و دەیشیڕاند و خۆی سوور و شین دەکردەوە، لە کۆبوونەوەکاندا دەیگوت دەبێ وابێ و نابێ وابێ و هەر کەس بە قسەی لایەکەی تر بکات و ئەم ڕێککەوتنەی لەگەڵ حکومەت دان پێدا بنێت وایە و وایە و خائینە، من وا دەکەم و وا دەکەم، سندووقی فیشەک دەبەم و دەچم لەسەر ئەو گردە دادەنیشم و تا دەتوانم شەڕیان لەگەڵ دەکەم و لە دواییشدا کە دەرەقەت نەهاتم، فیشەکێک دەنێم بە تەپڵی سەری خۆمەوە، کەچی کە شەڕی براکوژییەکە دەستی پێ کرد، ئەو پێش هەموو کەس خۆی گەیاندە شار و کەسوکاریشی بە پەلە لە بەغدا خەریکی پاسپۆرتی بوون، تا زووە بۆی دەرچێت بەرەو دەرەوەی وڵات.

شەو داهاتبوو، خیزانەکانی حاجی مەجید و برای پەڕیبوونەوە ئەودیوی ئێران و لە نزیک چەمەکە لە شوێنێکی تەختی دەوروبەر تاشەبەردی زل زل، یەکی بە قەدەر چارەکە شاخێک دانیشتبوون، کەلوپەل و شتەکانیان لەو ناوە بڵاو کردبووەوە، کە زۆریان تەڕ ببوون لە وەختی پەڕینەوەدا. منداڵدارەکانیش بە تاریکی و کوێرە کوێرە خەریکی گۆڕین و نواندنی مناڵەکانیان بوون.

ئامە خان سەری توند جەڕاندبوو و پشتوێنی ناوککەوتنەکەی بە پشتەوە بەستبوو و هەر ئاخ و ئۆف و بۆڵەبۆڵی بوو بەدەست جلەکانیەوە، کە چۆن وشکیان بکاتەوە و وا کۆڵنجی کرد و سکیشی هاتە ئێش.

حەپسەی خوشکی هەندێ ئارام بووەوە دوای ئەوەی چاوی بە کوڕ و زاوا و خوشکەزاکانی کەوت، کە هەموو بە سەلامەتی پەڕیبوونەوە دیوی ئێران. حاجی مەجید جێگایەکی بچکۆلانەیان بۆ داخستبوو، ئەویش پاڵ کەوتبوو و براکەشی لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو، ورتە ورت قسەیان دەکرد، بە کەساسی و بە دڵێکی تەنگەوە. زۆری خەڵکەکەش بڵاو بوونەوە و هەندێ هەر یەکسەر سەر شاخەکان کەوتبوون و کەوتبوونە ڕێ بەرەو دێهاتەکانی ئێران.

ماڵی حەپسە خان و ئەوان ئەو شەوە لەو شوێنە مانەوە تاکو بەیانی، کە ڕۆژ بووەوە ئەوانیش کەوتنە ڕێ بەرەو ئەو شاخە بەرزانە، دوو سێ وڵاخیان پەیدا کردبوو بۆ حاجی مەجید، کە نەخۆش بوو، هەروەها مناڵدارەکانیش کە بە نۆرە سوار ببن. لای ئێوارە گەیشتنە شوێنێکی قووڵی بەرین، کانیاوێکی خۆش لە دامەن شیوەکەوە

هەڵـــدەقولا، کە وەک ئەشـــکەوتێکی بچـــووک وابـــوو و لە دەروبەری بەرد و چەو و زیخێکی پاکوتەمیز بوو.
جەمـاعەت بێهێـز و مانـدوو لەبەر هەتـاو هەڵقرچـاو و سـووتاو، بە دڵێکـی پـڕ داخەوە گەیشـتنە شـیوەکە، بە هەڵەداوان یەک لە دوای یەک خۆیـان گەیانـدە سـەر کـانییەکە منداڵدارەکان، کە لە خەڵکی تر ماندوو بوون و بە خۆیـان و منداڵەکانیانەوە دانیشـتن و کەوتـنە خـۆفێنککردنەوە و شـایەتمانهێنان، هەموویـان خەمـی حـاجیی نەخۆشـیان بـوو، تۆفە زەوقی قسەکردن و فیشاڵکردنی نەمابوو و تووڕە و ناڕەحەت دەهاتە بەرچاو.
لە ڕێگا هێشـتا نەگەیشـتبوونە شیوەکە، ئامە خـان هـاواری لـێ هەسـتابوو و قسـەی بە هەمـوو کەس دەگوت لەتـاوا، تۆفە لێی ڕاپەڕی و پێی گوتبـوو: "بۆچی پێت ناخۆشـە؟ ئەمە شوێنەکەیە کە بە سـەعات دادەنیشـتین و بە دووربـین سـەیرت دەکرد و دەتگوت: 'وەی دایە، شاخ و دێهاتی دیوی ئێران چەند خۆشـە، ئەوانەی ئێمە چەند ناخۆشـن، دە ئیتـر لەجیـاتیی دووربـین خـۆت سـەیریان بـکە، وا ئاواتـت هـاتە دی، ئەمە شـوێنە خۆشەکەتە.'"
ئامە خانیش فرمێسکی خۆی سڕیبووەوە، دوعـایەکی لـێ کردبـوو، گوتبـووی: "سـەیری ئەم هەڵەوەرە ناکەن، ناهێڵێ داخێکی دڵی خۆمان دەربکەین، وەی باوکەڕۆ من لە کوێم! دەزانی کە ئێرە وایە، لە دوورەوە ئەو شـاخ و دێهاتـانە ئەوەنـدە جوان دیـار بـوون هەر دەتگوت بەهەشتن، کەچی ئەم ڕێگاوبانە خەسـت و گەرم و پڕ دڕکوداڵ و دووپشـک و مارە دەرچوو."
شیوەکە ناوی شیوی شەوکوێران بوو، کە شـەو داهـات حەپسـە خـان گـوتی: "ڕەحمەت لە باوکی ئەو کەسـەی ئەم ناوەی لەم شیوە ناوە، ئەشـهەدوبیلا هەقـی خۆیەتی، پەنـا بە خوا، ئینجا ئەوە ئێمە چۆن ئەمشـەو لێرە بنووین، خـۆ هەر مـار و دووپشـک و دڕنـدە دەمانخۆن، بەتایبەت کە چاو چاو نابینێ."
حاجیی مێردی کە هەندێ ئـارام ببـوو، بە ناچـاری هـاتبووە سـەرخۆ، بە مەلـوولییەکەوە گوتی: "دڵی خۆتان ناڕەحەت مەکەن، کار نییە خوا چاکی نەکات."
سەبری هەڵی دایە و گوتی: "بابە گیان، تۆ خۆت ناڕەحەت مەکە، ئێستا بەمەش ڕادێین، ئێرە ئەوەی باشە کە تاشەبەردەکانی زۆر گەورە و ساف و پاکن و وەک سـەکۆ وان و بۆ خۆمان لەسەریان دەنوین."
ڕووناک هەر زوو چووبووە تەنیشت دایکیەوە، سەری نـابوو بە سنگیەوە و لە ترسـاندا خـۆی گرمـۆڵە کردبـوو. بەختیـاری بەسـەزمانیش سـەرەڕای دڵتەنگیـی خـۆی و مەراقـی

خۆی هەر خەریکی دڵدانەوەی دایکوباوک و پوور و مام و پوورزا و ئامۆزاکانی بوو، بەتایبەتی کە تێشوو و خواردنەکانیشیان ئەوەندەی نەمابوو.
لەپڕ حەپسەخان گوتی: "ئوهـ خوا! نازانم چیم لێ بکات، دە بڵێ ژنەکە حەواڵە بە خوا بی، ئەوە ئەو توورەکە کولیچەخورمایەت بۆ لەبیر چووەوە! ئا ئێستا مناڵەکان بۆ خۆیان دەیانخوارد." دوایی دەستی برد بۆ سەر و سەرپۆشی، لەبەر خۆیەوە گوتی: "کولیچە و گاڵگاڵی چی، بۆچی چیمان لەبیر مابوو!"
سەبری هەڵی دایە و بە پەرۆشییەوە گوتی: "ئەی بە من دەڵێی چی؟ بە ملی شکاوم توورەکە کۆلێرەبەڕۆنەکەم لەسەر سندووقەکە دانا، کە بیدەمە دەست بەختیار، ئەوەندە بانگیان کردم کە چووم بزانم چییە، ئیتر بیرم چوو هەر لە شوێنی خۆی مایەوە، شەوێ لەسەر چەمەکە بیرم کەوتەوە، چەندم خەفەت خوارد."
ئامە خانیش دەستێکی دا لە سەری خۆی و گوتی: "ئەی ئەو هەموو مریشکە قەڵەو و هێلکەکەرەمان هەبوو، دەمانگوت هەر دوانیان سەر دەبڕین، یاخود هەر بە ساغی بیانهێنین، ئێستا بۆ خۆمان دەمانکوڵاند."
تۆفە، کە هەردوو قاچی درێژ کردبوو، خەریکی سەروپۆتەڵاک و جامانەکەی بوو، وەرامی دایەوە و گوتی: "مریشکت لە چیا دەکولاند؟ کاسە و کەوچکت لە کوێ بوو؟" سەرێکی بادا و گوتی: "ئاخر دەڵێن زۆر قسە دەکات و وەرامەکانی حازرە و زۆر هەڵەوەرە!"
بەختیار لە نزیکیەوە دانیشتبوو و بە ئەسپایی سیخورمەیەکی لێ دا و بە چرپە گوتی: "قەیناکە، بەقوربان، دڵیان پڕە، با بۆ خۆیان دوو قسە بکەن، ئەوەندە مەحکەمەیان لەگەڵ مەکە."
کاکە حاجی لەولایەوە هاتە قسە و گوتی: "دیارە زۆرتان برسییە، بۆیە ئەوەندە باسی خواردن دەکەن." لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "لە شەڕی دووەمی جیهانیدا چەند عەسکەرێک لێیان دەقەومێت و لە هاوڕێیەکانیان بەجێ دەمێنن و ڕێگا گوم دەکەن، ماوەیەک بەو حاڵە بەجێ دەمێنن، ئیتر زۆریان برسی دەبێت، یەکێکیان بەوی تر دەڵێت: 'توخوا ئەگەر باسی دەعوەتی ماڵی باوکی دەستگیرانەکەتمان بۆ نەکەیتەوە، کە چی و چییان بۆ لێنابووی.'" حاجی بە زەردەخەنەیەکی مەلەولەوە و بە تاریکی کە لە تەنیشت براکەیەوە دانیشتبوو، گوتی: "ئێوەش وەکو ئەو عەسکەرانەتان لێ هاتووە، ئەو باسی کولێرەبەڕۆن دەکات، ئەوانی دیکەتان باسی کولیچە و گاڵگاڵی و مریشکەکوڵ دەکات."
لەو کاتەدا خسپەخسپ و دەنگەدەنگێک پەیدا بوو لە بەرزاییەکەی کە فەیروانییە سەر شیوەکە، تۆفە و ڕێبوار ڕاپەڕین و قیڕاندیان: "زەلام کێیێ؟!" ژنەکانیش دڵیان داخورپا، کە ئاخۆ ئەوانە کێ بن. بێستوون لەوسەرەوە قیڕاندی و گوتی: "خۆمانین خۆمانین!"

که گەیشتنە لایان، بێستوون و حسێن بوون، هەواڵی جەماعەتیان پرسی و هەندی دڵیان دانەوە و گوتیان: "وا ئیتر ئەوەندەتان نەماوە، ئێستا دەگەنە ئەو دێیە و لەوێ مشووری شوێنمان بۆ خواردوون، ماڵی کابرایەکی حاجییە، خانوویەکی زۆر گەورەی هەیە، تەنها یەک کچ و ژنێکی پیری هەیە، گوتوویانە کە بێن و بەخێر بێن و بە سەر چاو." بێستوون قسەکەی تەواو کرد و گوتی: "کابرای خاوەن ماڵ ئاشنای خاڵمە، زۆر جار دەهاتە دیوی ئێمە و دەهاتە ماڵی خاڵم، یەک دوو جار دیومە لەوێ." بێستوون بە پەلە خۆی گەیاندە لای ڕووناک و چووە لایەوە دانیشت.

حسێن گوتی: "خەمتان نەبێت، ئەوەندەتان نەماوە، ئێستا پشووی تەواو دەدەن ئیشەڵا."

باوکی پرسیی: "ئەی کوڕەکانی تر چییان لێ هات؟"

حسێن وەرامی دایەوە گوتی: "کاکە عەلی لەگەڵ دوو سێ برادەر چوون بۆ سەردەشت، کە قسە بکەن لەگەڵ ئێرانییەکان، چونکە ناهێڵن کەس بە چەکەوە بێت و ئەوەی چەکی پێ بێت دەڵێن دەبێ چەکەکان دانێن و کەی ویستتان دەتاندەینەوە، وەختێ کە گەڕانەوە."

مامی دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "لا حەولە وەلا قوەتە ئیلا بیلا!"

تۆفە ڕاپەڕی و بە نارەحەتی و شپرزەییەوە گوتی: "کەواتە چەکیش دەکرێن؟"

حسێن ویستی لەبەر دڵی باوک و مامی هەندێ قسەی دڵنیاکەر بکات، بۆیە گوتی: "خۆ شاری بێساحێب نییە، چۆن دەبێ ئەو هەموو هێزە بە چەکەوە بچێتە خاکی دەوڵەتێکی ترەوە."

بێستوون خۆی گورج کردەوە و گوتی: "بەتایبەتی شا، کە دەڵێن ناهێڵن چەک بە دەست پیاوی خۆیانەوە بێت، چ جای هێز هیی پێشمەرگە بێت."

بێستوون لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "دەڵێن شا بڕوای بە کەس نییە، هەمیشە تفەنگەکانی لەشکرەکەی خۆیشی لە شوێنێکن گوللەکانی لە شوێنێکی ترن، تۆپەکان لە شارێکن و گوللەتۆپەکان لە شارێکی ترن."

حسێن وەک ویستی ئەم قسانە لەبیر بەرێتەوە، گوتی: "ئێوە دەزانن ماڵێکی زۆر هاتوون و گەیشتوون و شوێنی خۆیشیان خۆش کردووە و دانیشتوون."

حەپسە خان بە کزییەکەوە گوتی: "کێ و کێ هاتوون؟"

حسێن گوتی: "ماڵی کاکە عەبە، فەتاح کە خۆی هەڵکێشابوو ئاگای لێتان دەبێت، ئەوەتە خۆی و ماڵ و منداڵی لەوێن خانووشیان پەیدا کردووە، لەسەر ڕێگاوە سەرێکم دان دەتگوت مانگێکە لەوێن، نان و چێشتیان لێ نابوو و منداڵەکان بۆ خۆیان لەو بەردەمە یارییان دەکرد، دەتگوت نە بایان دیوە نە باران."

نەسرین سەری ڕاوەشاند و گوتی: "پەنا بە خوا، هەندێ کەس چەند هاونتەچین و هەر لە خۆشیی خۆیان دەگەڕێن، ئەو ماڵە قەت پەکیان ناکەوێت، لەسەر بەدی ڕەقیش هەر جێی خۆیان دەکەنەوە و بەلای دیواریشدا تێپەڕن بە دەستیان بێت لایەکی لێ دەکەنەوە."

سەبری لێوێکی هەڵقورتاند و گوتی: "ئێوە جارێ ڕاوەستن، بەخوا دوو ڕۆژی پێناچێت هەموو ئەهلی دێیەکە دەکەن بە ئاشنای خۆیان بە زمانی لووس وایان لێ دەکەن کە هەرچی شیر و ماستیان هەیە بۆ ئەوانی بێنن."

حەپسە خان بانگێکی حسێنی کرد کە لە نزیک باوکیەوە هەڵترووشکابوو، گوتی: "ئەرێ ڕۆلە، نانێ شتێکتان نەهێناوە؟ خۆ مناڵەکان مردن لە برساندا." حسێن گوتی: "ئەی چۆن!"

بێستوونیش ڕاپەڕی، کە دەستی ڕووناکی لە ناو دەستدا بوو و لە خوای دەخواست کە دنیا لەوەش تاریکتر بێت، بۆ ئەوەی تا پێی بکرێت زیاتر ڕووناک بگوشێت بە خۆیەوە و تێر ماچی بکات، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت. بێستوون بە گەرمییەوە گوتی: "ئای ئای، خۆ لەکن خۆمان خواردنمان بۆ هێناون، کەچی هەر لەبیریشمان نەما."

حسێن و بێستوون گورج هەستان و دەستیان دایە کۆڵەکەیان و خستیانە بەردەم حەپسە خان و ئەوان. ئەوانیش لێی کۆمەڵ بوون، لەبەر شەوقی لایت و تیشکی ئاگری چالێنانەکەی تۆفە، دانیشتن لە دەوری دەستەوارە نان و سەتڵە ماستەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی، پاشنیوەڕۆ، جەماعەت گەیشتنە دێیەکە، خاوەن ماڵ هاتن بەپیریانەوە، پیرەژنەکە لەگەڵ کچەکەی دەستیان کردە ملی ژنەکان و ڕێگایان پیشان دان کە لە کوێوە بچنە ماڵێ.

ژنە خاوەن ماڵەکە دوو سێ جار بەدەم چاوسڕینەوە لە فرمێسک گوتی: "یاخوا بەخێر بێن، ڕۆحم دەرچێ بۆتان، بەخوا لەو ڕۆژەوە گوێمان لەو قسەوباسە ناخۆشانەتان بووە هەر ئاگامان لە خۆمان نەماوە، بەڕاستی ئەم ڕووداوەی ئێوە بێئومێدی کردین، دڵمان بە ئێوە زۆر خۆش بوو." مێردەکەشی پیاوەکانی بردە لایەکی تر، ئەویش هەر ئەم چەشنە قسانەی دەکرد.

دەرودراوسێیان کۆمەڵ ببوو، لە دوورەوە سەیریان دەکردن، ئەوانیش هەریەکە قسەیەکیان دەکرد. مناڵەوردکەی ئەو دەوروبەرە هاواری یەکتریان دەکرد و بە یەکتریان دەگوت: "کوڕینە وەرن وەرن وا هەندێکی کەش هاتن!"

فاتمە خان کە کچی خاوەن ماڵەکە بوو، تەمەنی نزیکەی چل ساڵ دەبوو، هێشتا شووی نەکردبوو، هەموو شتێکی ماڵەکە و دایکوباوکی هەر ئەو بوو.

کچەکە ڕووی لە منداڵەکان کرد و تووڕە بوو و دەری کردن، لەوە دەچوو کە منداڵەکان لێی بترسن، چونکە هەر قیراندی بەسەریاندا کەس لەو ناوە نەما.
فاتمە خان کەڵەگەتێکی ناوەندی بوو، نە قەڵەو بوو نە لاواز، ئەسمەرێکی خوێنشیرین و گورجوگۆڵ دیار بوو. دەستبەجێ پەلاماری کەلوپەلی دان و ژوور و جێی پیشان دان و ئاو و مەسینە و لەگەنی خستە بەردەستیان.
خانووەکە کە لە سەرپەڕی دێیەکە بوو، بەقەد شاخێکی بەرزەوە بوو، کە ڕست و یەکسەر سەربان و هەیوان و پەنجەرەی چەند ژوورێکی دەیڕوانییە دێهاتەکانی دیوی عێراق، بەتایبەتی دێیەکەی ئامە خان و سەبری.
دوو ئاخوڕ و کادانی زۆر گەورە و درێژی تێدا بوو، لەویوە بە دوو سێ پێپلیکەی بچووک خەڵک سەر دەکەوت، ئینجا هەیوانێکی درێژ و بەرین بوو، ژوورەکانی بە ڕیز لەسەر بوو، هەمووشیان گەورە و خۆش بوون. خوارووی هەیوانەکە جێی ئاگردان و چێشتلێنان بوو، نیمچە دیوارێکی لە بەردەمدا دروست کرابوو، لەبەر هەوا و ڕەشەبا. دەوروپشتی خانووەکە هەمووی دارودرەختی جۆراوجۆر بوو هەر لە هەنارەوە تاوەکو توو و شۆڕەبی و مازوو و بەلاڵوک. توویەکی یەکجار گەورەش لقوپۆپی گەیشتبووە سەر سەربانەکەیان، وەکو کەپر لایەکی تەواوی سەربانەکەی کردبوو بە سێبەر، لەبەر ئەوە ئێواران هەر زوو خاوەن ماڵەکە دەچووە بن ئەو سێبەرە خۆشە دادەنیشت و خزم و ئاشنای لێ کۆمەڵ دەبوون، لە دوای ئەوەی فاتمەی کچی بەرەو لاکێش و سەرین و حەسیری بۆ دەبردنە ئەوێ و تێکڕای دێیەکە هەموو هەر شینایی و تووتن بوو، لەگەڵ گوڵەبەڕۆژە و گەنمەشامی، هەروەها تەماتە و ترۆزی و خەیار و شتی تریشیان هەبوو.

* * *

تۆفە هەر زوو کەوتە جووڵە و فەرمان دەرکردن بەسەر ژنەکاندا، هەروەک دەیویست خۆی دەرخات لە بەرچاوی ماڵەکە، بەتایبەتی فاتمە خانم، کە ئەو شتێکە لە ناویاندا و دەسەلاتدارە.
هەمووی دوو سەعات بوو گەیشتبوونە جێ، کە تۆفە خۆی قیت کردبوو، هەندێ بووژابووەوە و کەوتبووە هەڵڕشتنی قسەی نەستەق و زۆریشی پێنەچوو فاتمە خانی بردە ئەولاوە و کەوتە چرپەچرپ لەگەڵی. ڕووناک و دایکی چاویان لێ بوو، ڕووناک دەمی خۆی گرت و دایە پرمەی پێکەنین، سەری خستە پشت دایکی.
دایکی بە ئەسپایی کێشای بە خۆیدا و لە ژێر لێوەوە گوتی: "ئەی قوڕ بە سەرمان بێت، بە خوا تازە تیا چووین، ئێستا حەیامان دەچێت لە لای ماڵەکە، لەوانەیە هەر دەریشمان

بکەن."  حەپسە خان هەستا و خۆی گەیاندە ئامە خان و نەوبەهار و ئەوانی تر، بە چرپە و نارەحەتییەوە گوتی: "ئەیەڕۆ، چاوتان لەو تۆفە خواگرتووەیە چۆن خۆی قیت کردەەرتەوە، وا کچەکەشی بانگ کردە ئەو لایەوە نازانم چیی پێ دەڵێت، بەخوا دەترسم ئابڕوومان بەرێت و بکەوێتە چاوبرکێ لەگەڵی." نەسرین کچەکەی دا بە شانی خۆیدا و گوتی: "هیچ شتێک لە تۆفە دەمچیکەنە دوور نییە." سەبری بە ئەسپایی گوتی: "ڕاوستن، ئێستا بانگی دەکەم و قسەی لەگەڵدا دەکەم.

ئەو وای گوت، تۆفە بە زەدەخەنەی سەرلێوان و ڕوویەکی گەشەوە هاتە لایان. سەبری سەیرێکی کرد بە چرپە و لەسەرخۆ گوتی: "ئەوە چیت بە کچەکە دەگوت؟ هێشتا بسمیلا هەمووی دوو سەعاتە!" نەسرین هەڵی دایە و گوتی: "بەو حاڵە جوانەش کە تیایدا بووین." ئامە خان دەستی خستە سەر ڕوومەتی خۆی و بە کەساسییەکەوە گوتی: "ئەی نابێ هەر زوو ماڵەکە شارەزای عیلم و مەعریفەی خۆی بکات."

تۆفە هەروا سەیری دەمی دەکردن و دەتگوت خەیاڵی لای ئەوان نییە و دڵ و هۆشی لە شوێنیکی ترە. دوایی ناچار بەرانبەر بەو هەموو هێرشەیان هاتە قسە و بە هەندێ تووڕەییەوە گوتی: "ئەوە چیتانە، ئەوە چیتانە، فاتمەم بانگ کرد و پێم گوت کە ئەگەر بتوانیت دەمانچەکەم بۆ بشاریتەوە، خۆ بەخوا ئەگەر دنیاش هەستێت دەمانچەکەم تەسلیمی دەوڵەت ناکەم."

سەبرتی بە تەوسەوە گوتی: "ئۆخەی، شکور ناوی کچەکەش بوو بە فاتمە، باشە ئەی فاتمە گوتی چی؟"

تۆفە بە بزەیەکی خۆشەوە گوتی: "پێی گوتم وەی بەسەر چاو، هەر ئێستا دەچم وا بۆت دەشارمەوە، کە باپیری دەوڵەتیش نەیدۆزیتەوە."

حەپسە خان گوتی: "باشە ئەی بۆ بە باوکەکەیت نەگوت؟" ئامە خان دیسان بە مەلوولییەکەوە گوتی: "ئەی چۆن، تاوەکو کچەکەی ڕاوەستابێت چۆن بە باوکی دەڵێت."

تۆفە دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "ئێوە هەروا بن، هەروا دانیشن و بگرین و بکێشن بە خۆتاندا و هەر خەریکی ئاخ و ئۆف بن، ماڵتان نەشێوێ دنیاتان لەبەرچاو خستین."

چیتر لەسەری نەڕۆیشت و لێی دا چوو بۆ ناو پیاوەکان.

* * *

مانگێک بوو کە ماڵی حەپسە خان و خوشکی و خێزان و ئەو خەڵکەی تریش کە دەرباز ببوونە دیوی ئێران، لە دێیەکی باوکی فاتمە دانیشتبوون و چاوەڕێی ڕووداو و دواڕۆژی خۆیان دەکرد، کە ئاخری بۆ کوێیان دەبەن و چییان لێ دێت.

لەو ماوەیەدا چەند خزمێکی حاجی مەجید و حەپسە خانیش گەیشتنە لایان و تێکەڵی خێزانەکەیان بوون، لە ناو ئەو کەسانەدا دوو کوڕی خوشکەزای هەردوو حاجی بوون. یەکێکیان هەندێ مناڵکار بوو، هەروا دەوری بیست ساڵ دەبوو، ئەوی دیکەشیان خاوەن ژن و ماڵ بوو.
ئەو کەسانەی هاتبوونە دیوی ئێران، دەوڵەت بە پەنابەری قبووڵی کردبوون و خەریکی مشوورخواردنی شوێن و ڕێیان بوون، کە بەرە بەرە لەسەر سنوور دەیانهێڵن، هەروەها دەوڵەت دەستی کرد بە ناردنی خواردەمەنی و ئازووقە بۆ هێزی پێشمەرگە و خێزانەکانیان، تا ئاوڕت دەدایەوە قافڵەی ئێستر و بارگیر بە خرنگ و هۆڕی زەنگۆڵەی پێشەنگەوە دەگەیشتە لایان، بە فەردە برنجی سەدری نایاب و ئارد و شەکر و تەنەکە ڕۆنی شا پەسەند و کارتۆن و سندووقی تایت و سابوونەوە.
ئەوەندە زەخیرەی زۆریان بۆ هات، کە هەموو ئەهلی دێیەکەش، بەتایبەتی فاتمە خانم نانیان کەوتبووە ڕۆنەوە.
ئەوەی لە هەموو کەس زیاتر ئەو لێشاوی زەخیرە و ڕۆن و برنجەی پێ خۆش بوو، سمایلی خوشکەزا هەرزەکارەکەی هەردوو حاجی بوو، چونکە تا بڵێی نەوسن و حەزی لە خواردن دەکرد.
هەموو جار بە بیانووی ئاگرکردنەوە و دارشکاندن و یارمەتیدانی حەپسە خانی خاڵۆژنیەوە، لە وەختی چێشتلێناندا خۆی دەخزاندە چێشتخانە و بەینی مەنجەڵ و کاسە و کەوچکەوە، ئەمیشە سەر ئەژنۆ و ئەملاولای شەرواڵەکەی سمە چەور و ڕۆناوی بوو، چونکە ئەوەندە خۆی لە مەنجەڵە قبووڵی و پڵاوەوە هەڵسوو لە وەختی بنکرلێکردنەوەدا. تۆفە توانجی زۆری تێدەگرت و ناوی نابوو گورپە، بەڵام ئەو هەر گوێشی لێ نەبوو و ئاوڕیشی لە توانجەکانی تۆفە نەدەدایەوە. تۆفە زۆر جار پێی دەگوت: "ئەم شەڕی براکوژی و دەربەدەرییە لە لایەک و ورگی تۆ لە لایەک."
هەرچەندە لە دەرەوە دەنگی زەنگۆڵەی پێشەنگ بهاتایە و کەسێک بیگوتایە: "ئەرێوەڵا وا دیسان شتومەکیان بۆ هێناین!" سمە ڕادەپەڕی و دڵی خۆش دەبوو لە دوورەوە بە شەوقەوە سەیری دەکرد و دەچوو بەپیریانەوە و ئاوڕی لە ماڵ و خێزانی خاڵەکانی دەدایەوە و پەنجەی هەڵدەبڕی و دەیگوت: "کورە بەخوا هەر لە خۆی دێت، هەتا حەوت پشتی باوکیشت هەر شاهەنشا بوون، خانەدان و دنیادیدە وادەبێت، ئەوە کێ دەڵێت دوو جەزیرەکەی خوار بەسرە هیی ئەوان نییە؟ وەڵا باوکم ئەشهەدوبیلا تا سەروو مزگەوتی حاجی حانیش هەر هیی ئەوانە، ئیتر چییە."

جەماعەتیش بەو دڵتەنگی و سەرلێشێواوییەوە دەیاندایە قاقای پێکەنین و دەکەوتن بە گازی پشتدا و فرمێسک لە چاویان دەردەپەڕی.
تۆفە بێجگە لە فاتمە خان سێ چوار کچی تریشی پەیدا کردبوو، بەیانیان دوای چاخواردنەوە دەچووە ناو دێیەکە و لەوێشەوە سەری زەراعەت و ناوتووتنی دەدا و لەوێ ئەو کچ و ژنانەی ئیشیان دەکرد خەریکی ئاودان و بژارکردن بوون، بۆ خۆیان تێر بە تۆفەیان ڕادەبوارد و پێدەکەنین، ئەوانیش هەر زوو شارەزای قسە و فیشاڵەکانی بوون، بەڵام یەک دوو بێوەژنیان تێدا بوو، بەڕاستی مەراییان بۆ دەکرد و هەریەکەیان حەزی دەکرد، کە بەشکەم تۆفە بیانهێنێت و ئێوارانیش کاتی گەڕانەوەی مەڕومالاَت بەرەو ئاوایی و حەیوان دۆشین، تۆفە خۆی دەگەیاندە ئەوێش و دوو سێ کچ و ژنی کردبوو بە دۆست و ئاشنای خۆی، کە بە قسەی پێدەکەنین و ڕوویان خۆش بوو لەگەڵی، کە ئێوارانیش دەگەرایەوە ماڵی دەکەوتە مەرایی و خۆنزیککردنەوە لە فاتمە خانم.
ئامە خان و خوشکی و کچەکان لە بەینی خۆیان باسیان دەکرد و لەم جۆرە جووڵانەوانەی تۆفە نارەحەت دەبوون و زۆر جاریش دەچوون بە گژیدا و هەریەکەیان شتێکی پێ دەگوت: "ئەوانە ئێستا لێقەوماو و پەنابەرن و دەبێ حورمەتی خۆیان و خانەخوێیەکەشیان ڕاگرن."
تۆفەش دەمی دەکرایەوە و تێیان بەردەبوو و دەیگوت: "من چی بکەم، بۆ هەر کوێیەک دەچم دەورم لێ دەدەن و حەزم لێ دەکەن."
ئامە خانیش دەیگوت: "ئەی دایکم بووە بە سوورەی حەفتاگرە و لە ژێر لێویشەوە دەیگوت: 'ئەی حەزت لێ دەکەن؟ ئەوە حەز لە کوێت دەکەن؟ ئاخۆ چ فیشاڵ و درۆیان بۆ هەڵدەڕێژی ئەوانیش پێت پێدەکەنن!'"
حەپسە خانیش ڕووی دەکردە خوشکی و بە چرپە دەیگوت: "کچێ خوشکم ڕەنگە بە خەڵکی دێیەکەی گوتبێ ئاخ چ سەرلەشکە و ئامرهێزێکە."

* * *

دووبەرەکی و شەڕی براکوژی، ئاژاوە و بەرەڵاییەکی یەکجار خراپی خستە ناو هێزی پێشمەرگەی هەردوو لا و ئەوانەی چووبوونە دیوی ئێران، هەموو بێئیش و بێکار و بێتاقەت بە بێزاری دانیشتبوون و بەشێکیشیان بێورە و سەرلێشێواو ببوون، بەتایبەتی کە گوێزرانەوە بۆ ناو شارەکان، ئیتر هەندێکیان بە تەواوی بەرەڵا بوون و کەوتنە قومارکردن دەستبڕین و ئارەقخواردنەوە و چوونە شوێنی خراپ و خەیاڵیان دایە ئەوپەڕی بەدخوویی.

ئینسان دەحەپەسا و سەری سوور دەما کە چۆن ئەم کەسەی دەڵێن وای لێ هاتووە و وا باسی دەکەن، ئەمە ئەو کەسەیە کە چەند مانگ لەمەوپێش قارەمانێک بوو و سنگی خۆی دەنا بە گوللەوە و خۆی دەخستە ئاگرەوە و بە ڕۆژی ڕووناک دەچوون معاون و مودیری ئەمنی حکومەتی لە ناو جێگا و نوێنی خۆیان دەردەهێنان و دەیگرتن بە دیل، یان ئەوە چۆن ئەو کەسەیە کە بە سکی برسی و بە تفەنگە شڕێکی کۆنی چەند ساڵەوە بەرەنگاریی لەشکری حکومەت دەبوو، کە بە تازەترین و سامناکترین تانک و تۆپ و دەبابە و فڕۆکەوە هێرشی دەهێنایە سەریان، یان لەپڕ سەیریان دەکرد پێشمەرگەکان هەندێکیان دیار نەماون، دوایی بۆیان دەردەکەوت کە پەڕیونەتە دیوی عێراق و خۆیان تەسلیمی حکومەت یان لایەکی تر کردووە، یەک دوانێکیش لەو ورەنەماوانە کە خۆیان بێئومێد و سەرلێشێواو بینی، خۆیان کوشت. بەڵام بەشێکی هەرە زۆریشیان هەر لەسەر ورە و بڕوای خۆیان مابوونەوە، بێ ئەوەی هیچ گۆڕین یان ڕووداوێک کاریان تێبکات.

* * *

هەرچی بەرەی دیوی عێراقیش بوون، ئەوانیش هەندێکیان دوای بەینێک سارد بوونەوە و هۆشیان هاتەوە بەر خۆیان و تووڕە و ناڕەحەت بوون لەم ڕووداوی براکوژییە. هیی وا هەبوو سەری خۆی دادەخست و چاوی پڕ دەبوو لە فرمێسک و سەرزەنشتی خۆی دەکرد، کە وەیش ئەوە چۆن دەستی گرتی پەلاماری هاوڕێی چەندساڵەی خۆی بدات و وا بیداتە بەر دەستڕێژ.

بە جارێ ڕۆژانی ڕابردوو پێکەوە خەباتکردنی نهێنییانی بیر دەکەوتەوە، کە فڵان ساڵ چیان کردبوو پێکەوە و فڵان ڕۆژ چوون خەریک بوون لە نوقتەی تەفتیش بگیرێن، کە وەختێ کەلوپەلی نهێنیی پارتییان پێ بوو، دەیانویست دەربازی بکەن، کە ئەوجارە لە کەرکوک گیران، بەو حاڵەش چەند قسەی پێکەنین و گاڵتەیان دەکرد، کە دایکی یەکێکیان دەگات بۆ سەردانیان چۆن فەرق و جیای نەدەکردنەوە و هەر دەتگوت هاتووە بۆ سەردانی دوو کوڕی، کە گیراون و چۆن دەگریا بۆیان و بەو نەبوونی و حاڵی خۆیشیەوە چیی بۆ کوڕەکەی بهێنایە، بۆ ئەمیش هەروەکو ئەمیش هەروەکو ئەوی دەهێنا. لەبەر ئەوە ئەو کەسە یەکسەر هەڵدەستایە سەر پێ و بۆ ئەوەی بتوانێت نەختێ بیانوو بە دڵ و دەروونی خۆی ببڕێت، دەچوو بۆ لای کەسوکاری ئەو هاوڕێ یان خزمەیەوە و پەشیمانیی خۆی بۆ دەردەبڕین و دەستی دەدا بە یەکدا، کە بە داخەوە ئەو لەو کاتە لەوێ نەبوو، لە شوێنێکی دوور بوو، ئەگینا قەت نەیدەهێشت شتی وا بقەومێت و توخوا چیتان پێویستە و سەری پێوە نییە لە ڕێی ئەواندا. بەشێکی

تریش لەوانە لە بیانوو دەگەڕا و هەر کەسێک پێی بگوتایە پێت خوار داناوە، تووڕە دەبوو و پەلاماری چەکەکەی دەدا و بە دزییەوە دەپەڕییەوە بۆ دیوی ئێران و دەچوو تەسلیمی ئەوانەی ئەوێ دەبوو، لەگەڵ سەدان حەکایەت و قسەوقسەڵۆک و دەنگوباسی ڕاست و درۆ، بەشێکی تریشیان دنیایان بۆ تەخت ببوو، کەوتبوونە لرفلێدان و ڕاوڕووتی خەڵک و دەستبڕین و بلۆف و ساختە بۆ خۆدەوڵەمەندکردن و خانوو و ئۆتۆمبێل و زەوی کڕین و بە فشەفش و سنگدەرپەڕاندن، چوون لە خانوو و قەسری خۆش خۆشی حکومەتدا دانیشتن و کەوتنە سەفەری ئەورووپا و ئەمەریکا و ئەملاولا و کەوش و کڵاشی باوک و باپیریان لەبیر چووەوە و بووژانەوە و لە خۆ گۆڕان.

* * *

ئێوارە بوو، حەپسە خان و خوشکی گەڕانەوە بەرەو ماڵی فاتمە خانم، سەبری و نەوبەهار پێشیان کەوتبوون. حەپسە خان بە هەنکەهەنک دەڕۆیشت و بە نارەحەتییەوە بە خوشکی گوت: "بەخوا ئەگەر ئەم وەزع و ڕووداوانەم بە خەوی شەویش بهاتنایەتە بەرچاو، هەر زوو دڵم دەپچڕا و نەدەگەیشتمە ئەم ڕۆژە، ئەیەڕۆ چۆن دەربەدەر و سەرگەردان بووین و لە ماڵ و حاڵی خۆیشمان بێبەش بووین! وەرە لەبەر دوژمنیش وات لێ نەهاتبێ، برا و ئامۆزا و هاووڵات و هاوڕەگەز و هاوخەباتت وایان لێ کردبێت. ڕاستە ماوەتیش هەر لادێ بوو، بەڵام لەوێ سەربەست و پڕهیوا و سەربەرز بووین و بە هەزار شاری دنیام نەدەگۆڕییەوە. ئەوەتا ئێستا لێرە ئەوەندە نزیکن بە چاو دێ و ماڵەکانمان دەبینم و خەڵکی ئێرەش هەموو هەر کوردن و ماڵیان ئاوا بێ خەڵکی باشیشن، کەچی هەر غەریب و داماو و سەرکزین."

ئامە خان، کە هەر خۆی بەکێش دەکرد و دڵیشی پڕ ببوو، بە قسەکانی خوشکی دەستی برد بۆ چاوی خۆی و بە کەساسییەکەوە گوتی: "لە هەمووشی ناخۆشتر ئەم هەموو ڕێگابڕینە و چوونە ناو شیو و پەنابەرد و ناو دار و بێشەیەوە بۆ چوونە سەرئاوێک."

حەپسەخان لکی کەواکەی هەڵکردەوە و ڕووی کردە خوشکی و گوتی: "ئەوەیان هەر سەرباقی دەردانە." حەپسە خان ئاهێکی زۆر بەکوڵ و دڵی هەڵڕشت و گوتی: "ئەی ئەوەی کە نازانین چیمان لێ دێت و ڕەوانەی کوێمان دەکەن، دەڵێن گوایە هەفتەی داهاتوو دەست دەکەن بە گواستنەوەی ئێمە و ماڵەکانی تر."

خوشکی وەرامی دایەوە و گوتی: "نازانم، کوڕەکانیش بۆ وا کەم کەم سەرمان دەدەن؟" حەپسە خان وەک بیەوێت نهێنییەک بە خوشکی بڵێت، دەنگی نزم کردەوە و گوتی: "کچێ خوشکم هاتوچۆی ئەوانیش بە حیسابە، خۆ وەکو لای خۆمان نین کە بە

سەربەستی و بە کەیفی خۆیان بێن و بڕۆن، لێرە دەبێ هەموو جووڵانەوەیەکیان بە ئینجازەوەرگرتن بێت."
لێرەدا تۆفە لە دوورەوە ئاوڕی لە جووتە خوشکەکە دایەوە و هاوارێکی لێ کردن و گوتی: "ئەوە بۆ پێ هەڵناگرن؟ لەبەر ئێوە نەبوایە ئێستا دەمێک بوو لەماڵەوە دەبووین، خێرا بکەن درەنگە."

* * *

شەوێکی فێنک و خۆش بوو، مانگ لە پەنا لوتکە شاخەکەی پشت سەربانەکەی ماڵی فاتمە خانم هاتبووە دەرێ و شەوقێکی زێڕی دڵفرێنی بەو ناو و دەورووبەرەدا بڵاو کردبووەوە، مەنگی و هێمنی و خۆشییەکی دابوو بەو گرد و شیو و پەناوپاسارە.
خەڵکی دێیەکە بێدەنگ و کپ ببوون، وەکو ڕۆژ و شەوی هەمیشەییان کفت و ماندوو، هەر کەس لەسەر نیمچە سەربان و دەروهەیوانەکانیان وەک نیوە بێهۆش کەوتبوون و لێی نوستبوون، خێزانەکانی حەپسە خان و خوشکی ئەوانیش لە سەربانە پان و بەرینەکەی ماڵی خانەخوێیەکان لەسەر ئەرز بە ڕیز جێگایان لێ داخستبوو و هەر لە زووەوە هاتبوونە ئەوێ و بە کۆمەڵ خەریکی ورتەورت و قسەکردن بوون لەگەڵ یەک، بەشێکیان خەویان لێ کەوتبوو لەگەڵ مناڵەکانیان.
ڕووناکیش کەوا بە دڵێکی پڕ ئارەزووەوە بە درێژایی ڕۆژ چاوەڕێی بێستوونی کردبوو، کە دەبوایە ئەو ڕۆژە بێت سەری سەری لێ بدات، کەچی بۆی نەکرابوو بێت، ئەویش بەو داخەوە خەوی لێ کەتبوو.
تۆفەش وەک شتێ بەزەیی بە ئامە خاندا هاتبووەوە، لە لای ئەو و کاکە حاجی دانیشتبوو و قسەی بۆ دەکردن و زۆریش دەیویست دڵی ئامە خان بداتەوە، چونکە نیوەڕۆ هەندێ دەمەقاڵێیان ببوو، لەبەر ئەوەی کە ئامە خان بەپێی ساویلکەیی و دڵپاکیی خۆی قسەی کردبوو و پێی گوتبوو: "تۆفە گیان، خۆ ئێستا دنیا تۆزێک هێمن بووەتەوە، ئەوە ناتوانیت لەگەڵ کەسێکدا بڕۆیت سەرێکی ماڵی ئێمە و سەبری بدەیت و ئەو جانتا کەوایانەشم بۆ بێنیت، ئەمە دوو سێ شەوە سەرمام دەبێت و بزانە ئەو مریشکە چاکانەشم چییان بەسەر هات."
تۆفەش ببوو بە فیشەکەشێتە و تووڕە ببوو، پێی گوتبوو: "کەوا و کراسی چاکت بۆ دەهێنم! قسەی خۆش دەکەیت، بۆچی هەر بەقەد سەر هەویرێکیش ئەرزمان بە دەستەوە ماوە تاوەکو بتوانم بچم شتت بۆ بێنمەوە؟! ئیشەڵا بۆ نامانکەی بە شەهیدی کەوا و کۆڵوانە!"

لەبەر ئەوە تۆفە هاتبوو کە دڵی بداتەوە و قسەوباسیماڵە پەڕیوەکانی بۆ دەگێڕایەوە، کە ئەوانیش چەند ناڕەحەتن و دایکی کامیان نەخۆش کەوتووە و بووراوەتەوە، منداڵی کێ لەسەر دارتووەکە بەربووەتە خوارەوە و سەری شکاوە و کام بووک و خەسوو شەڕیان بووە و خەسووەکە تۆراوە و پەڕیوەتەوە دیوی عێراق.
ئیتر تۆفە لەو جۆرە قسانەی بۆ دەکردن، بەدەم مژ لە جگەرەدانەوە هەندێ لەولای ئامە خان و کاک حاجییەوە حەپسە خان لە تەنیشت ڕووناکی کچیەوە ڕاکشابوو خەیاڵی دەکردەوە. حاجی مەجیدی مێردیشی بێهێز و بێتاقەت دەستی نابووە ژێر سەری خۆی و بە پاڵکەوتوویی و بە دڵێکی گوشراوی تەنگەوە چاوی بڕیبووە تروسکە چرا و لۆکسی دێهاتی ئەوبەری سنوور، کە دیوی عێراق بوو. بە دەستی بوایە باڵی دەگرت و خۆی دەگەیاندە ئەوێ، وا چاوی تێبڕیبوو دەتگوت منداڵە و لە باوەشی گەرمی پڕ ئارام و سۆزی دایکی بە زۆر دەرهێنراوە و دەمێ ساڵە لەو باوەشە دوور خراوەتەوە و ئارەزووی ئەوەیە کە بە پەلە و هەرچی زووتر بچێتەوە لا،ی تاوەکو تێر دەست بکاتەوە ملی.
لەپڕ ژنەکەی لەسەرخۆ وەک چرپە ڕووی قسەی تێکرد و لە خەیاڵی دا و پرسیی: "ئەرێ ئەوە ڕاستە کە دەڵێن گوایە سبەی ڕەوانەمان دەکەن بۆ تاران؟" حاجی هاتەوە سەر خۆ و گوتی: "سبەینێ کوڕەکان دێن بۆ لامان و هەموو شتێکمان پێ دەڵێن. دەڵێن ماڵەکان دابەش کراون بەسەر شارەکاندا و زۆریان چوونەتە ئەو شارەی پێشمەرگەکانیان لێ داناوە."
حەپسە خان گوڕی دایە خۆی و دانیشت و بەچرپەوە گوتی: "ئەی بۆچی ئێمە دەچینە شارێکی تر؟" حاجی وەرامی دایەوە و گوتی: "وەڵا من ئەوە نازانم، هەر چۆنێک بێت سبەینێ کە عەلی و ئەوان هاتن هەموو شتێکمان لێ ڕوون دەبێتەوە."
ژنەکە بە مەلەولێکەوە گوتی: "دەڵێن دیسان دەبێ بە پێ و بە ولاخ بڕۆین، بەخوا هێزمان تیا نەماوە و دڵمان بە بەریەوە نەماوە، ئۆ خوایە بەقوربانی بەشت بم!" حاجی بەزەیی پێدا هاتەوە و هەندێ خۆی گورج کردەوە و گوتی: "ناشکور مەبە خوا خراپتری لایە، بەس نەبوو شکور کوڕەکانت بە سەلامەتی دەرچوون. ئەوەتا بزانە چەندەها کەس لە هەردوو لا کوژراون و بە خوتوخۆڕایی لەکیس دایکوباوک و ماڵ و منداڵیان چوون، لەکیس ئەم کوردە قوڕبەسەرە بێکەسە چوون، تۆ بزانە بە چەند ساڵی تر کوڕی وا پێدەگەن و وا گەورە دەبن و دەکەونە خەباتکردن و وەک ئەمانەیان لێ دێ، ئێستاش وا بەفیڕۆ لەدەست چوون و بە دەستی برای یەکتری، کاشکی لە شەڕەکەدا بوایە و بە دەستی دوژمن و حکومەت بوایە، ئەوسا دەمانگوت شەڕە و

شۆڕشە و چوونە جەبهەیە و خەبات هەروا دەبێت، دەکوژرێن و دەشکوژن لە ڕێگای ڕزگاری و ئازادیی گەل و نیشتمانەکەیاندا شەهید کران، بەڵام وەرە بزانە ئەوە نەگبەتی و ماڵوێرانی، کە برا برای دەداتە بەر گولله و دەستڕێژ و دوژمنیش سەیریان بکات و دڵی خۆش ببێت و ئاواتی بێتە دی."

حاجی ڕاست بووە و دانیشت و داوای چۆڕێ ئاوی کرد لە حەپسە خان، ئەویش دەستی برد بۆ شەربەکەی نزیکیان و هەندێ ئاوی بۆ تێکرد و ئیتر قسەی نەکرد، زۆریش لەبەر ئەوە بیری کەوتەوە کە مێردەکەی نەخۆشە و نابێ ئەوەندە سەر بکاتە سەری و ئەوەندەش خۆی نارەحەت پیشان بدات لە بەرچاوی. ئاوەکەی خواردەوە و جامەکەی دایە دەست و لەسەرخۆ گوتی: "ئەمیش دەبڕێتەوە، دنیا هەروا نامێنێ، ئێستا هەردوو لا پەشیمان دەبنەوە، کە بۆیان ڕوون بووەوە و زانییان چەند بێکەسن و ئەو کەسانەی جار بە جار دەست بۆ لایەکیان درێژ دەکات، ئێستا زۆر چاک بۆیان دەردەکەوێت کە ئەوە لەبەر خاتری چاوی ڕەشی ئەوان نییە و لەبەر مەسڵەحەت و دەسکەوتی خۆیانە و بۆیەش پێیان دەڵێن خاڵە، تاوەکو چۆلەکەیان پێ بگرن و ئەو ڕۆژەی دەست کەوت و قازانجیان لەوەدا نەما، دەبینن چۆن دەستیان لێ بەردەدەن و خواخوایان دەبێت کە لەناویان بەرن."

ڕۆژی دوایی لای نیوەڕۆ عەلی و کوڕەکانی کردیان بە ماڵدا، دوای سەلام و چاک و چۆنی و هەواڵپرسین و قسەوباس، نانیش پێ گەیشت، سفرەیەکی دوورودرێژ ڕاخرا، پڵاوی سەدری بۆن خۆش و شلەی سێو تێکرا. سمە گوربەش لەسەری هەیوانەکەوە لە ناو مەنجەڵ و کاسە و کەوچکدا خۆی سەرقاڵ کردبوو و کەوتبووە بنکرکراندن، گوایە هەندێ لە کوڕەکانیش حەزیان لێ دەکرد و چاوەڕوانی سمە بوون کە بۆ خۆی و بۆ ئەوانیش بنکر بێنێ، تاکو پێکەوە بیخۆن. سمەش هەرچیی لێ دەکردەوە جارێ خۆی دەیخوارد و بە چنگ کەوتبووە ناوی، کوڕەکان هاوارێکیان لێ کرد، کە خێرا بکە وەرە نانەکەت بخۆ، ئەی کوا بنکر؟ سمە بە گوویی پڕەوە جوابی دانەوە و گوتی: "ئێوە نانەکەتان بخۆن، عافیێتتان بێت، منیش وا هاتم، بنکرەکە زۆر ڕەق بووە پێوەی، بە زەحمەت بۆم لێ دەکرێتەوە."

ژنەکانیش لە ژوورێکی تر دەوری سفرەی خۆیان دابوو، منداڵدارەکان خەریکی خۆیان و منداڵیان بوون.

ڕووناک لە خۆشیی هاتنی بێستوون نەیدەزانی چی دەخوات، نەوبەهار یەک دوو جار لەسەر سفرەکە هەستا بە بیانووی کوردۆی کوڕیەوە، کە نەیویست نان بخوات و لە باوەشی ڕای کردە هەیوان، ئەمیش شوێنی دەکەوت و دەنگیشی بەرز دەکردەوە.

"کـوڕە ڕۆڵە وامەکە، دە وەرە نـانەکەت بخـۆ، لە بەیـانییەوە دەمـت بـۆ هـیچ نەبـردووە."
نەوبەهـار ئەم قسـانەی دەکـرد و چاوێکیشـی لەو ژوورە بـوو کە عەلیـی مێـردی لەگەڵ پیاوەکان نانیان دەخوارد، کە بەشکم ئەمە خوایە عەلی گوێی لە دەنگ و قسـەکانی بێت و بێت بەدەنگیانەوە.
سەبرییش بەدەم نانخواردنەوە لە دڵی خۆیدا هاتن و بینینەکانی شیروانی دەژمارد، کە لە کەیەوە پێکەوە دانەنیشـتوون و ئەوەتەی پەڕیونەتەوە بـۆ ئێرە، بەم جـارەوە چـوار جارە کە هەروا بەسەر پێوە سەری دابن.
ئەگەرچی سەبری زۆر بەورە و دڵقایم بوو، بەڵام دیار بوو بەرانبەر بە خۆشەویستیی شیروان و دوورکەوتنەوەیان لە یەک، زۆر بێورە و دەستەپاچە نەبوو.
نەسرین لە هەموویـان خەیـاڵ پرشـوبڵاوتر بـوو و سـەری دنیـای لـێ هـاتبووە یەک، کە نەکـا حسـێن بنێـردرێتە شـوێنێک و ئەمـیش بـۆ شـار و شـوێنێکی تـر، لە دڵـی خۆیـدا دەیگوت: "ئینجا ئەگەر وابوو من چی بکەم؟ لەبەر باوک و مامیشم ڕووم نییە بڵێم ئەو لە کوێ بێت منیش دەچـم بـۆ ئەوێ." پەرۆشـی و مەراقی دوورکەوتـنەوە لە حسـێن و سەردان و هاتنی بە ئیجازە بۆ لای مێشکی شێواندبوو، بێ ئەوەی دەری ببڕێت یـان بە کەس بڵێت.
حەپسـە خـانیش کەوا هـیلاک و مانـدوو لەسـەر سـفرەی نـانخواردن لە تەنیشـت خوشکیەوە دانیشتبوو. خوشکی ئاوڕێکی لێ دایەوە و گوتی: "ئەرێ بەشـی مـاڵی فـاتمە خانمت نەنارد؟"
حەپسە خان دەستی دایە نانە تیرییەکە و پارچەیەکی لێ کردەوە و لەجیاتیی کەوچک هەر بەو پارچە نانە بۆ خۆی هەندێ برنجی کردە قاپەکەیەوە و سەیری ئەملاولای کرد و ڕووی کردە خوشـکی و گـوتی: "ئەی بێقەزا بی، بەخـوا تـا بـرنجەکەم دەمـی کێشـاوە چوار جار تۆفە هاتووەتە سەرم و گوتوویەتی: 'درەنگە، بەشی ماڵی فاتمە خانم تێکە بـا بۆیـان بەرم، گونـاحن، ئێسـتا بەسـەزمانانە بـووراونەوتەوە لە برسـاندا، پەنـا بە خـوا خەریک بوو چوار چاوم کات.' ئاخری وابزانم پڵاوەکە دەمـی تەواوی نەکێشـابوو، پێـی تێکردم و بـردی بۆیـان، یـاڕەبی نۆشـی گیانتـان بێـت، خـۆ خـۆم حەز دەکەم و هەمـوو ڕۆژێک بـۆم نـاردوون، بەڵام تـۆفە حەواڵە بە خـوا بـێ، تـووڕەم دەکـات ئەوەنـدە دێـتە سـەرم و دەڵێـت دەی زوو بۆیـان تـێکە، دوێنـێ هـاتە سـەرم و گـوتی: 'مـاڵی فـاتمە دوو میوانیان هاتووە، تۆزێ زیادیان بۆ تێکە، چاوت لێیە بۆ بەرچایی بەیانیان چۆن هەمـوو ماسـتەکەیان دەخەنە بەردەسـتتان و بەردەمتـان، بێجگە لەو هەمـوو هـێلکە و تەمـاتە و ترۆزییەشیان کە بۆتانی دەهێنن.'"

وا دیار بوو ئامە خان داخی ئەو ماستەی لە دڵدا بوو، بۆیە گورج هەڵی دایە و گوتی: "ئۆهـ لەو ماستە جوانە، خۆ دەڵێی چڵکاوە، ترش ترش هەروک بە لیمۆندۆزی هەوێن کرابێ وایە." سەبری بەدەم نانخواردنەوە، ڕووی کردە دایکی و پووری و گوتی: "دە بڵێن چی هەر ئەوەیان هەیە، دە وەرە هەقی چاکە، هەموو ڕۆژێک لە دەمی خۆیان دەگێڕنەوە و بۆ ئێوەی دەهێنن، کەچی سەیری قسەشیان بکە، ئەوە لەجیاتیی سوپاسیان بکەن، ماستی شیرین و سەرتوێژی قاڵبیان لە کوێ بۆ بێنن، بەسەزمانانە هەر ئەوەیان هەبوو." حەپسە خان گوتی: "ئەیەڕۆ، خۆ لەبەر شتێک وا نالێین، یاخوا ماڵیان ئاوا بێ، وەڵا قەت لە چاکەیان دەرناچین و زۆریش مەمنوونیانین، بەڵام ئامەی خوشکت ڕاست دەکات، ماستەکەیان زۆر ناخۆشە."
لەو کاتەدا تۆفە گەیشتە لایان و گوتی: "ماستی چی؟ ئەوە باسی چی دەکەن؟" سەبری بە گورجی جوابی دایەوە و گوتی: "هیچ نییە، دەڵێن ماست و دۆکە زۆر مزر و خۆشە."
جەماعەت تێگەیشتن کە سەبری لە ترسی دەمی تۆفە وای گوت و لە ژێرەوە هەموو بە زەردەخەنەوە سەیری یەکتریان کرد.
پاش سفرەهەڵگرتن کوڕەکان چوونە لای حەپسە خان و ئەوان. عەلی کوردۆی کوڕی گرتە باوەش و چوو لە بەینی دایکی و نەوبەهاردا دانیشت. بێستوون و ڕووناک بە بیانووی ئیشێکەوە چوونە ژوورەکەی ئەولا و ئەوندەی پێنەچوو گەڕانەوە لای جەماعەت و دیسانەوە چوونە هەیوانەکە، لەوە دەچوو کە بۆ پەنایەکی چۆڵ دەگەڕان کە تۆزێ بە سەربەستی قسە بکەن و بە دزی ئەم خەڵکەشەوە دوو سێ ماچی یەکتری بکەن.
نەسرین بە ماتی دانیشتبوو و گوێی هەڵخستبوو، سەبری تووڕە و ناڕەحەت دەهاتە بەرچاو، ئامە خان لە تەنیشت نەورۆزی کوڕییەوە بوو، چەند جارێک لەسەر یەک دەستی بە شان و پشتی کوڕەکەیدا هێنا و گوتی: "دایکت بمرێ، ئەوە بۆ ئەوەندە بێڕەنگ دیاری، خۆ نەخۆش نیت؟" نەورۆز بە دڵپێوەبوونێکەوە سەیرێکی دایکی کرد و گوتی: "نەوەڵا نەخۆش نیم، بەڵام دیارە هیلاک بووم بۆیە وا دێمە بەرچاوت، شوێنەکەمان هەندێ دوورە لە ئێوەوە." دەستی خستە سەر شانی دایکی و سەری خۆی نووساند بە سنگیەوە و گوتی: "تۆ چۆنی چۆن! خۆ ناڕەحەت نیت؟ قەیناکە، ئێستا دەتانبەنە شوێنێکی باش." ئامە خان وەرامی نەدایەوە، چونکە قورگی پڕ بوو لە پیش و گریان. حەپسە خان ڕووی کردە عەلیی کوڕی و کوڕەکانی تر و گوتی: "ئێستا چیمان لێ دەکەن؟ ڕاستە دووسبەی دەبێ بڕۆین؟" عەلی گوتی: "ئاخر، بۆیە هاتووین تاوەکو تێتانبگەیەنین. دووسبەی دوانیوەڕۆ دەکەونە ڕێ بەرەو بانە و لەوێشەوە دەتانبەن بۆ

تاران." حەپسە خان بە مەلوولییەوە گوتی: "ئێوەش دێن لەگەڵمان یان چی دەکەن؟" عەلی گوتی: "نا، ئێمە لە دواییدا بە نۆرە دێین بۆ لاتان. چونکە ئێمە دەبێ لەگەڵ پێشمەرگەکان بین و هەر کەسەو لەگەڵ دەستە و هاوڕێی خۆی بڕوات، تاوەکو دادەمەزرێین و بزانین چۆن دەبێت." نەسرین بە ماتییەکەوە گوتی: "ئینجا بە خێری ئەمە تاوەکو کەی وا دەبێ؟" حسێن بە زەردەخەنە و گەرمییەوە دەستی خستە سەر شانی و گوتی: "جارێ تۆ خەمت نەبێ، پێش هەموویان من دێم بۆ لاتان." سەری بردە نزیکی و چرپەیەکی کرد بە گوێیدا، هەردووکیان پێوە دەستیان کرد بە پێکەنین.

حەپسە خان گوتی: "ڕێگاکە زۆر دووره تاوەکو بانە؟ ئاخۆ دیسان چیمان بەسەر بێت بەو ڕێگە سەخت و شاخوداخەوە، ناشێ دیسان هەر تۆفە و بەختیاری بەسەرزمانمان لەگەڵ بنێرن!" حەپسە خان جاوی پڕ ببوو لە فرمێسک و بە قورگێکی گیراوەوە گوتی: "وەڵا من خەمی ئەو پیرەمێردە فەقیرەمە، خۆمان قیروسیا." شیروان بە پەرۆشیەوە هەڵی دایێ و گوتی: "خەسوو گیان، دڵی خۆت نارەحەت مەکە، خۆ هەروا ناڕۆن، خەڵکی شارەزای دەوڵەتتان لەگەڵ دێن، ئاخر ئێمە میوانی ئەوانین، بۆ مامیشم ئیشەڵا هیچ نابێت، ڕێگاکە هەمووی عەسکەرە، دکتۆر و موکتۆریان هەیە، خوا پێویستیتان پێ نەکات، هەر ئەوەندەش گەیشتنە بانە، ئیتر لەوێوە بە ئۆتۆمبێل دەتانبەن بۆ تاران." سەبری بە تووڕەییەوە گوتی: "ئەم بەزمی تارانە چ بوو، بۆ ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبەن بۆ ئەو شوێنەی دەچن؟!" شیروان دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "دە وەرە چاکە بکە! چەند ڕۆژە هەوڵی دنیامان داوە لەگەڵ ئەوان تاوەکو قبووڵیان کردووە، کەچی ئەمانیش ناڕازین. دە توخوا کەس هەیە وا بڵێت؟ تاران دەست کێ دەکەوێت! خەڵکی منەت دەبات هەر بۆ چەند ڕۆژێک بچێت ببینێت، دەڵێی ئەورووپایە، ئەوەندە خۆشە." سەبری دیسانەوە بە تووڕەییەوە گوتی: "ئەو ئەورووپا و بەهەشتەمان ناوێت، دەمانەوێت لەگەڵ ئێوە بین، بە تەنیا بەڕەڵای کوێمان دەکەن، غەریب، بێزمان." عەلی سەیرێکی جەماعەتی کرد و گوتی: "ئەشهەدوبیلا ئەمە هەمووی خەتای حسێن بوو، ئەو لەسەر ئەم چوونی تارانە سوور بوو و هەوڵی بۆ دا."

هەموو بە جارێ ڕوویان کردە حسێن، کە بۆچی وای کردووە. حسێن منگەمنگێکی کرد و گوتی: "وەڵا لەبەر باوکم هەوڵم دا و حەزم کرد بچن بۆ ئەوێ، خەستەخانەی چاکی لێیە، دەڵێن دکتۆرەکانیشیان زۆر باشن." عەلیی برای هاتە جواب و گوتی: "دیارە لەوێ خەستەخانەی باشی لێیە، بەڵام لە شارەکانی تریش لێیەتی." ئامە خان چاوی خۆی بە پشتی دەستی سڕییەوە لە فرمێسک و گوتی: "وەڵا حسێن ڕاست دەکا، لەبەر کاکە حاجی هەر ئەوێ باشترە، کوڕەکانیش هەر دێن و دەڕۆن و سەرمان دەدەن."

دیار بوو ئامە خان لە دڵی خۆیەوە ئەو قسەیەی دەکرد، ئەو لە کویێ ئاگای لە دڵی سەبری و نەسرین بوو کە چەندیان پێ ناخۆش بوو و دڵیان لەسەر چەند لێی دەدا و لە داخی ئەم قسەیەی کە ئەو کردی و لە کوێ ئاگای لە هەست و هۆشی ڕووناکە، کە هەر نزیک بێت لە بێستوون بەردی ڕەقیشی لە لا دەبێت بە خۆشترتن شوێنی دنیا. هەروەها کەی ئاگای لە فرمێسکەکانی نەوبەهار بوو لە تۆزێ لەمەوپێش لە ژوورەکەی ئەولا لەگەڵ عەلی باوەشیان کردبوو بە یەکدا و چۆن بەدەم هەنسکەوە چرپاندی بە گوێیدا و گوتی: "ئەوە کەی ئەم حاڵە دوایی دێت؟" چۆن عەلییشی گوشی بە خۆیەوە و دەمی نابووە سەر ڕوومەت و گەردنی و بەدەم ماچەوە پێی دەگوت: "نازانی چەندت بیر دەکەم، هەر دامەزراین یەکسەر دێم بۆ لاتان و یەک دوو هەفتە دەمێنمەوە."

* * *

خێڵی حەپسە خان و حاجی مەجید و براکەی سێ ڕۆژ بوو بەڕێوە بوون بەرەو بانە، هیلاک و ماندوو شوێنی یەک کەوتبوون، هەندێ جار بەشێکیان فەکەوتنە دواوە، نەیاندەتوانی ئەو شاخوداخە سەختە ببڕن، بەشەکەی تریش کەوا پێش کەوتبوون، کە فەیانبینی ئەوانی تر دواکەوتوون، دادەنیشتن چاوەڕێیان دەکردن و ئەگەر لە دوورەوە دیار نەبوونایە، دڵیان دەکەوتە مەراقەوە بۆیان و هەریەکەیان قسەیەکی دەکرد بەدەم بۆڵەبۆڵەوە.

مناڵە وردەکان دەگریان و سوور هەڵگەڕابوون، لەبەر تینی ئەو هەتاوە گەرم و تیژە، هەرچەندە دایکەکانیان مناڵەکانیان داپۆشیبوو، زۆریان هەوڵ دەدا کە بیانپارێزن و هەر ئاگایان لە شان و قۆڵی سڕ و ماندووی خۆیان نەمابوو لەبەر ئەوان، یەکی سەردۆشەکێکی گەورەیان دابوو بەسەر سەری خۆیان و مناڵەکانیان خستبووە ژێری و وەک چادریان لێ کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر فایدەی نەبوو.

ئامە خان و خوشکی لەبەر سێبەری داربەڕوویەکدا دانیشتبوون پشوویەکیان دەدا، جامێ ئاویان بە دەستەوە بوو، ئەو دەیگوت: "بەخوا تێرم خواردەوە با بۆ تۆ بێت." ئەوی تریشیان وەرامی دەدایەوە و دەیگوت: "دە قومێکی کەشی لێ بخۆرەوە و هەندێکیشی بکە بە دەموچاوتدا، تەرمۆزەکە هیی تریشی تیا ماوە." هەردووکیان تووڕە و ناڕەحەت و دڵپڕ بوون، زۆریشی لەبەر مناڵە وردەکان و حاجی مەجیدی نەخۆش بوو، سەبری و نەسرینیش لەولاوە خەریکی تیروتوانج گرتن بوون لە کابرای ڕێبەریان، کە گوایە بۆیە دەوڵەت لەگەڵی ناردبوون کە ڕێگاوبانیان پیشان بدات و ئاگای لێیان بێت.

سەبری پێی دەگوت: "ئەرێ برام، تۆ لە دوێنێئێوارەوە دەڵێیت ها ها ئەوەتا گەیشتین، ئەوەندەمان نەماوە، تەنها ئەم دوو گردە ببڕین و هەڵگەڕێنەوە ئەودیو ئیتر تەواو گەیشتین، لە دوێنێوە حەوت گرد و سێ شاخمان بڕی و هەر نەگەیشتین!"

بەختیار و تۆفەش چرپەچرپیان بوو کەوا چاوت لێیە سەبری چۆن دەچێ بەگژ ئەو پیاوەدا، عەیب و شوورەیی ودەزانێت ئەویش ئێمەیە، بەختیار دەیگوت: "ئێستا خۆمی دەگەیەنمێ و بێدەنگی دەکەم."

هەردوو حاجییش لەگەڵ سمەی خوشکەزایان و قەتارچییەکە گەیشتبوونە تەختاییەکی خۆشی پڕ دارودرەختی گەورە گەورەی چڕ، کە سەریان نابوو بەیەکەوە و سێبەرێکی یەکجار خۆشیان لێ دروست ببوو، بەتایبەتی کە ئاوێکی تەنکی ڕوونیش بە ژێریاندا تێدەپەڕێ و ئەوەی خۆشتریشی کردبوو ئەو بۆنە خۆشە نمەدارەی کە لەو ناوە بڵاو ببوونەوە، کە تیکەڵاو بوو لەگەڵ بۆنی گەڵای دارگوێز و گوڵەژاڵە و دارمێو و پونگە و گژوگیای قەراغ ئاوەکە.

هەردوو حاجی بەپەرۆشەوە چاویان لە ڕێگا بوو، کە کەی منداڵ و ژنەکان بگەنە ئەم شوێنە خۆشە و بەشکم پشوویەک بدەن و ئیسراحەتێک بکەن، سمە چەند جارێک لە خاڵەکانی چووە پێشەوە و گوتی: "ئەرێ خاڵە گیان، ڕەنگە ئێستا زۆرتان برسی بێت، دەڵێن چی دەست بکەم بە سفرە دانان؟" کاکە حاجی گوتی: "ئەوەندە خەمی منداڵەکانمە هەر هیچ شتێکی کەم بیر نەماوە." حاجی مەجیدیش گوتی: "جارێ خەمی نانخواردنت نەبێ، با ئەوانیش بگەن دوایی." حاجی زەردەخەنەکەی شاردەوە چونکە زانیی کە سمە نیازی خۆیەتی و ئەمان دەکات بە بیانوو، سمەش لە دڵی خۆیدا جارێک دەیگوت: "دەڵێی چی بچم بزانم چییان لێ هات." جارێکیش دەیگوت: "بە هەزار حاڵ گەیشتوومەتە ئێرە، تاقەتم لە کوێ بوو بگەڕێمەوە بزانم ئەوان بۆ نەگەیشتن، ئێستا خۆیان هەر دەردەکەون."

سەبری و نەوبەهار و منداڵەکانیان گەیشتن و لە وڵاخ دابەزین و بە پەلە چوونە سەر ئاوەکە و کەوتنە دەست و دەموچاو شتنی خۆیان و منداڵەکانیان، ئەوانی تریش لە دوورەوە دەرکەوتن، کە بەرەو لای ئەوان دەهاتن.

ئەوەندی پێنەچوو تۆفەش گەیشت، سەروجامانەکەی داگرت و قاچی ڕووت کرد و چووە ناو ئاوەکە و بە مست کەوتە شڵپە شڵپ و سەر و دەموچاو شتن و ڕووی کردە سمە و قەتارچییەکان و دەستی درێژ کرد بۆ لای ئەوانەی بەڕێوە دەهاتن و گوتی: "دەی باوکەکەمن، بگەنە ئەوانە و یارمەتییەکیان بدەن."

دوای ئەوەی سمە و زەلامەکان ڕۆیشتن بۆ لای حەپسە خان و ئەوان، حاجی مەجید بە سەرسووڕمانەوە بە تۆفەی گوت: "ئەوەتا ئەوان وا هاتن، ئەم قوڕبەسەرانەش هیلاک و ماندوون، بۆ کوێت ناردن." تۆفە هاتە پێشەوە لێیان، سەیرێکی ئەملاولای خۆی کرد و دەنگی نزم کردەوە و گوتی: "بە ئەنقەست وام گوت، قسەم هەیە پێتان

بڵێم با کەس گوێی لێ نەبێت، دار و دیوار گوێی هەیە." ئینجا لە ئاوەکە هاتە دەرەوە و ڕووی کردە سەبری و گوتی: "حەزم نەکرد چووی بەگژ ئاغای حەسەن دا، ئەو فەقیرە چی بکات، ئەو بۆ دڵخۆشیی ئیوە وا دەڵێت."

تۆفە پەنجەی هەڵبڕی و گوتی: "ئەمە کوردە و کوردی زۆر خۆش دەوێت و زۆر کوردپەروەرە."

سەبری، کە هەندێ حەسابووە و فێنکی بووەوە و هێشتا ئاو بە دموچاو و ئەگریجەیەوە مابوو، وەرامی تۆفەی دایەوە و گوتی: "ئەمە کوردە و کوردی زۆر خۆش دەوێت؟ وەڵا ئەمە دەستبڕ و فێڵبازێکە نەبێتەوە و هەموو کوردیش دەفرۆشێت بۆ دەستکەوتی خۆی و بۆ جاسووسییش هاتووە لەگەڵمان و ساختەچییەکیشە بێوێنە، ئەوە لە دوێنێوە ئاگام لێیەتی هەر چاوی بڕیوەتە ئەو سندووقە چایە و هەموو جارێک دەچێت دەستێکی لێ دەدات و دەڵێت با بزانم باش بەستراوە، چای عێراق زۆر خۆشە. تمەز ئەم تەماعی تێکردووە، ئاخرییش وازی نەهێنا سندووقەکەی پێ داگرتین و بەو ئێوارەیە کەوتە تەقە تەق و بزمار هەڵکەندن و بە زمانە لووسەکەی وای لە دایکم کرد، من نەبوومایە هەر هەمووی دەدایە بۆ خۆی، من نەمهێشت و گوتم ئێمە ئەم هەموو خێزانە فێری ئەو چایەین دوایی لەوێ چی بکەین."

سەبری دەستی هەڵبڕی و گوتی: "بۆچی هەر ئەوە؟ ئەو هەموو قاپە وەرشاو و سینییەشی لە دایکم سەند بێجگە لەو سەرین و ئەو دوو لێفە چاک و جوانە." تۆفە بە سەرسووڕمانەوە گوتی: "ئەو قاپانەی لە دێیەکەی فاتمە خانمان کڕی؟" "نەوبەهار گوتی: "بێقەزا بێت ئامۆژنیشم چەند خۆشباوەڕ و دەستبڵاوە، دە بڵێ توخوا خەڵک چۆن نوێن دەبەخشێت، لەم حاڵەشدا کە ئێمەی تیاین!" سەبری بە تووڕەییەوە گوتی: "هەرچەندە شەڕێکی چاکیشم لەگەڵ دایکم کرد، بەڵام فایدەی چی تازە قسەکەی کردبوو، خۆ ئیشەڵا ناچین لێی بسەنینەوە، بە بیانووی ئەوە لێی سەندبوو کە گوایە ئێستا دەچنە تاران و دەتانبەنە خانووی خۆشی پڕ ناومالّی دەوڵەتەوە، ئیتر ئەم شتە زیادانەتان بۆچییە."

سەبری وەکو تێگەیشتوو و زانا ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "ئاگاتان لە دەمتان بێت، قسەومسەتان لەژێر دەرنەهێنێت ها، ئەوە پیاوی ساواکە." تۆفە سەری سووڕما و گوتی:

– ساواک چییە؟!

– یەعنی پیاوی ئەمن، وەکو زۆڵەئەمنی لای خۆمان.

تۆفە سەری داخست و قسەی نەکرد و بێدەنگ بوو، چونکە لە ڕێگا و بەدەم ڕۆیشتنەوە هەموو هەمانەکەی بۆ کابرا خاڵی کردبوو و هەرچی ئاغای حەسەنی لێی پرسیبوو، ئەمیش بە پوخت و جوانی وەرامی دابووەوە و بۆی باس کردبوو.

نەوبەهار بە پەرۆشی و ترسەوە سەیرێکی تۆفەی کرد و گوتی: "بەقوربانە، کەواتە زۆر وریا بن، باسی هیچی لا مەکەن لە ڕێی خوادا." تۆفە بە بڕواوە دەستی کردەوە و دەستی هەڵبڕی و سەری بادا و گوتی: "من؟ بۆچی من ئەم نەوعە کەسانە ناناسم؟ قوڕ بە سەریان، ئەو خورمایەی ئەوان دەیخۆن ناوکەکەی ئەوەتا لە گیرفانی مندایە."
سەبری لە دڵی خۆیدا گوتی: "دیسان دەستی پێ کرد و کەوتە قسەی زل هەڵڕشتن." ئینجا ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "باشە باشە لەشت ساغ بێت، ئینجا کێ حەدی هەیە فێڵ لە تۆ بکات."
تۆفە لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئای هاوار! خۆ من هەموو شتێکم بۆ ئەم کابرا حەرامزادەیە گێڕایەوە، هەمووشی بە خۆهەڵکێشانەوە، تاوەکو باسی ئێستگەکەشم بۆ کرد، بەڵام باش بوو ئۆخەی شکور فریا نەکەوتم پێی بڵێم لە کوێ هەڵگیراوە و چۆن شاردراوەتەوە."
تۆفە یەکەم جار بوو قیڕە و شاتەی سەبریی پێ خۆش بووبێت، چونکە لەو کاتەدا کە ئەم باسی بۆ کابرا دەکرد، سەبری هیلاک و تووڕە ببوو و هاواری تۆفەی کردبوو، کە بچێت بەلایەوە، چونکە کوڕەکەی ڕقی گرتبوو و داوای لە تۆفە کرد کە بێت بەلایەوە و هەندێ ئاوی بۆ بهێنێت. تۆفە کەوتە گێژاو و ترسەوە بیری لە قسەکانی خۆی دەکردەوە، کە چیی گوتووە و چی نەگوتووە، بۆچی ئەوەندا گەوج و خۆش باوەڕ بوو، چۆن ئەو کابرا جاسووسە بە زمانی لووس خۆی کرد بە برای باوک و دڵسۆزی کورد و کوردستان و ئەمیش وا کوێرانە سنگی خۆی بۆ کردەوە. تۆفەی شڵەژاو کە بیری کەوتەوە کەوا چەند جارێک لە کاتی پشوودان و نانخواردندا ئەم کابرایەی دەبینی دەچووە پەنا بەرد و شوێنی تەنیا و شتی دەنووسی، تاوەکو جارێک ئەم لێی پرسی: "ئاغای حەسەنی ئەوە چی دەنووسیت؟" ئەویش پێکەنی و گوتی: "وەڵا هەندێ حیساباتم هەیە با لەبیرم نەچێ." تۆفە مێشکی ورووژا و کەوتە مەراقەوە و هەموو کردەوەکانی ئاغای حەسەنی بیر کەوتەوە کە چۆن دوێنێئێوارەکە گەیشتنە نزیک ئەو دێیە و ئەو و بەختیار ویستیان بچنە ناو دێیەکە بەشکم نەختێ ماست و نان و هەندێ شت بۆ مناڵەکان بکڕن، کەچی نەیهێشت و گوتی: "نا، ئێوە نابێت بچن، چیتان ئەوێ من دەچم بۆتان دەکڕم." ئاشکرایە ئەوە نەیویستووە بچن قسە لەگەڵ خەڵکی دێیەکە بکەن. تۆفە ئەوەشی بیر کەوتەوە شەوێ کە بە ناو دێیەکدا تێپەڕین و خەڵکی دێ یەکە یەکە چاویان بەمان کەوت بەپەرۆش بوون بۆیان و دوو سێ کەس بە خێرایی چوون ئاو و دۆیان بۆ هێنان و چەند ژنێکیش بۆیان گریان و ئەم کابرایە ئەوەندەی پێ ناخۆش بوو و لە یەک دوانێکیان تووڕە بوو و گوتی: "بەردەممان چۆڵ بکەن و بڕۆن و لاچن."

ئەوەشی هاتەوە بیر کە لە کاتی کەوتنەڕێ و خواحافیزی لەگەڵ ماڵی فاتمە خانم و دەرودراوسێیەکان خەڵکەکە بە سڵەمینەوە سەیری ئەم کابرایەیان دەکرد و گوێشی لێ بوو کە یەک دوانێکیان بە چرپەوە بە یەکتریان گوت: "ئەم باوک سەگە کەی پەیدا بووە!"
ئیتر تۆفە بە جارێک دڵی کرمێ بوو لە کابرا و هەرچی قسە و کردەوەیەک کرابوو و نەشکرابوو دەهات بە مێشکیدا و لە دەوری ئاغای حەسەنیی کۆ دەکردەوە. تۆفە بە زوویی خۆی گەیاندە بەختیار و سمە و دوو کوڕەکەی خزمیان لە بابەت ئاغای حەسەنییەوە بە درێژی قسەی بۆ کردن.
جەماعەت هەموو گەیشتنە ژێر درەخت و سێبەرە خۆشەکەی لای حاجی و ئەوان و خۆیان هەڵڕشت و کەوتنە سەروپووتەڵاک و دەموچاو شتن. شوێنەکەیان زۆر بەدڵ بوو، زۆریان کەوتنە گیان گیان و دەربڕینی خۆشی و هەندێکی تریشیان گوتیان وەڵا با ئەمشەو لێرە تێر ئیسراحەت بکەین. ئاغای حەسەنی لەوێوە هەڵی دایە و گوتی: "نا، ئێرە باش نییە، ئەم ژێر درەخت و دارانە پڕە لە مار و جانەوەر و لەبەر ئاوەکەش هەر باش نییە و هەمیشە لەم ناوە چەتە هەیە و خەڵک ڕووت دەکەنەوە."
تۆفە خۆی پێ نەگیرا، چونکە داخیشی لە دڵدا بوو، هاتە قسە و هەندێ دەنگی بەرز کردەوە و ڕووی کردە کابرا و گوتی: "ئەمە چ بوو ئاغای حەسەنی، بە هەر شوێنێکدا تێپەڕین تۆ گوتت پێ هەڵگرن ئەم ناوچەیە باش نییە چەتەی هەیە و خەڵک ڕووت دەکەنەوە، ئەوەتی بەڕێوەین ئەمە چەند بنکەی عەسکەریی ئێوەمان تووش بووە و هەر خەریکی ڕاکردن و تەدریب و تاقیکردنەوە و هەر جاوید شاە جاوید شاهیانە، ئیتر چەتە و ڕێگری چی، ئێستا کەی زەمانی خەڵک ڕووتکردنەوە ماوە."
ئاغای حەسەنی بە شەیتانییەکەوە پێکەنی و گوتی: "پیاو خراپ لە هەموو کاتێک و لە هەموو شوێنێک هەیە. من لەبەر ئێوەمە، نەوەکا تووشی شتێک ببن دوایی دەوڵەت ملی من دەگرێت و دەڵێت بۆ بە ڕێگای باش و سەلامەتدا نەتهێنان." قسەکەی درێژە پێ دا و گوتی: "ئەگەر هەندێ پەلە بکەن و پێ هەڵگرن، ئەمشەو ئیشەڵا لە بانە دەنون و لەوێ ئیتر پشووی باش دەدەن."
تۆفە سەری داخست و چووە ئەولایەوە و بە تووڕەبوونەوە چەند قسەیەکی بە ژێر لێوەوە کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: "وەڵا سەگباب چەتە و ڕێگر و دەستبڕ لە تۆ زیاتر نییە."
حەپسە خان و ئەوان دوای پشوودان و نانخواردن هەستان و پێشی هەموویان کەوتن تاوەکو بچنە پەنایەک و دەست بە ئاو بگەیەنن، لە ڕێگا ڕووناک قۆڵی هەڵماڵی بۆ دایکی

و گوتی: "سەیر بکە دایکە، ئەمشەو دەبێ شتێک پێوەی دابم، ئەها قۆڵم چیی لێ هاتووە." دایکی و پووری کێشایان بە خۆیاندا و ناڕەحەت بوون، چونکە قۆڵە ناسکە سپییە خرپنەکەی ڕووناک هەموو سوور ببوو و ئاوساو بوو، وا دیار بوو کە شتێ گازی لێ گرتبوو.
دایکی بە پەرۆشییەوە گوتی: "ئۆهـ دایکت بمرێ، بۆچی دەزانی ئەمشەو ئێمە لە کوێ نوستبووین؟ بەخوا کە بەیانی ڕاست بوومەوە و ڕاپەڕیم و کێلە قەبرەکەم دی لە ژوور سەرم، هەر سڕ بووم، ئەمشەو ئێمە لە ناو قەبرستاندا نوستبووین." حەپسە خان کێشای بە سنگی خۆیدا و گوتی: "پەنا بە خوا قەبرەکەش دەلاقەیەکی زۆر گەورەی تیا بوو، لایەکیشی ڕووخابوو و هەر مێرووولەی ڕەشی گەورە گەورەی لێ دەهاتە دەرێ، دەچوونەوە ناوی، یەکی بەقەد قالۆنچەیەک دەبوون، هەر نازانم چۆن شەو تێمانبەرنەبوون. ئۆهـ ڕۆحم دەرچی بۆ ئەو منالە ورد و ناسکانە." ئامە خان ڕاپەڕی و بە ترسەوە گوتی: "ئای قوڕ بە سەرم نەبێت، بەخوا کەواتە ئەمە ئەو مێروولانە بوون کە گازیان لێ گرتووم، چونکە نیوەشەو بەو مردوویی و هیلاکییە لەسەر شیشێکی ئاگر خەبەرم بووەوە کە کرا بە لوولاقی قاچمدا، ئەوندە خەواڵوو و ماندوو بووم، دەستێکم بۆ برد و گورج نوستمەوە." ئامە خان گوتی: "ئەیەڕۆ! با سەیرێکی بکەم." دەرەلنگی ئاوەڵکراسەکەی بەرز کردەوە، کە سەیری کرد جێگای گازی پێوە دیار بوو، بەڵام وەکو هیی ڕووناک نەئاوسابوو و زۆر سوور نەببووەوە.
تاریکەشەو بوو نزیک سەعات دە، خێڵ هەموو لەسەر تەپۆڵکەیەک لە قەراغ جادەیەکی خۆڵاوی دانیشتبوون، هەندێ حەسابوونەوە، بەتایبەتی کە شەوەکەشی فێنک و خۆش بوو، بارەکانیان لەولای خۆیانەوە خستبوو و کۆمەڵ کردبوو. ئاغای حەسەنییش بەشە کەلوپەلەکەی خۆی لە شوێنێکی تەنیا کۆمەڵ کردبوو، زوو زوو دەچوو بەلایانەوە و دەیخستنە سەر یەک، قەتارچییەکان پارەی خۆیان وەرگرتبوو و ڕۆیشتبوون.
ئاغای حەسەنی وەکو فەرماندەر و خاوەن دەسەڵات بەسەر سەریانەوە دەگەڕا و دەهات و دەچوو. ئەمانیش کزۆڵە دانیشتبوون چاوەڕێی فەرمان و قسەیان دەکرد، دوای ئەوەی سەعات دە بە نزیکەی یازدە لە دوورەوە لایتی دوو ئۆتۆمبێل دەرکەوت. ئاغای حەسەنی بە شەوقەوە گوتی: "ئەوا ماشێنەکان هاتن تاکو بتانبەن، ئیتر خۆتان ئامادە بکەن." ڕووی کردە جەماعەت، کە وەک عەسکەری شکستە بە سەروپووتەڵاکی شێواو و بە قاچ و پشتی کووڕ و سڕەوە، خۆڵاوی و تۆزاوی لە بەرهەتاو، ڕەشداگەڕاو و پێست سووتاو دانیشتبوون، ڕووی تێکردن و گوتی: "کە سواری ماشێنەکان بوون، دەبێ سەرتان ڕووت بکەن تاوەکو لە ناوشار کەس وا نەتانبینێت."

تۆفه به شـپرزەییەکەوە دەسـتی برد بـۆ سـەروجامانەی خـۆی و دەسـتی پێدا هێنـا و توندتری کـرد و هەسـتایە سـەر پـێ و بە پەرۆشـییەوە گـوتی: "بـۆ؟ بـۆچی لەو شـارە سـەروجامانە و سـەری بەسـتراو عاجبـاتییە؟ مەگەر ئەوانـیش کـورد نـین؟" ئاغـای حەسەنی گوتی: "کاکە ئەوە ئیشی ئێمەیە، ئێمە وا بە باشی دەزانین." تۆفە خەریک بوو هەڵچێـت و بچێـت بەگژیـدا، کە حـاجی مەجیـد هەڵـی دایـێ و دەسـتی دایە کـڵاو و جامانەکەی خۆی و دای گرت، هەروەک تۆفە خـاو بکاتەوە گوتی: "دە قەیچێکە، ئەوە قسەکردنی بۆچییە، ئێمە میوانین، خاوەن ماڵ چۆنی ویست میوان دەبێ وابکات." تۆفە دەستی خستە سەر سەروجامانەکەی و هەندێ دوور کەوتەوە لێیـان و لە ژێر لێوەوە چەنـد جنێـوێکی دا بە ئاغـای حەسـەنی و گەورەی و چەنـد دوعایەکیشـی کـرد، لەو کەسانەی بوون بە هۆی ئەوەی ئەم خەڵکە ماڵ و حاڵ و وڵاتی خۆی بەجێ بهێڵێت و وا بکەویتە ژێر دەست و ڕەحمەتت یەکێکی وەکو ئەم دەستبڕ و دز و هیچوپووچە.

ئـامە خـان لە ژێر لێوەوە بۆڵەیەکی لێوە هـات و گـوتی: "ڕەزامـان بە ڕەزای خـوا، بەم ئاخری عومرە بـا ببین بە عـالمۆدە!" کچەکـانی بە ئەسـپایی پێدەکەنین، حەپسـە خـان بە بێدەنگی دەکوڵا لەبەر پێکەنینی بە قسەکانی کابرا و بە جوابی تۆفە و سـەری ڕووتـی مێردەکەی و قسەی خوشکی.

* * *

ئۆتۆمبێـل گەیشـتن، دوو لانـدرۆڤەری درێـژ بـوون، ئۆتۆمبێلچییەکـان دابەزیـن، ئاغـای حەسەنی کەوتە ورتەورت لەگەڵیان بە فارسی، شتەکانیان بار کرد لەسەر ئۆتۆمبێلەکان و جەمـاعەتیش هەسـتان سـوار بـوون بە سـەری ڕووتەوە، هەنـدێکیان هەسـتی خۆشییەکیان کرد بەوەی کە خۆ ئەوە ئۆتۆمبێلە سواری دەبن و وا دەچن بۆ شار، ئیتر ڕزگاریـان بـوو لە کەر و وڵاخ و ڕێگـای سـەخت و مێشـومەگەز و مـار و دووپشـک و پەیین و تەپوتۆزی لادێ، هەندێکیشـیان وا سـەیری ئۆتۆمبێل و ئەو دوو کـابرا لێخـوڕە جل ئەفەنـدییەیان دەکـرد، دەتگـوت قەت و هـیچ کـات نە شـاریان دیبـوو و نە سـواری ئوتۆمبێل و قەمەرەی جوان بوون و نە ئەلەکتریکیان چاو پێ کەوتووە.

* * *

ئۆتۆمبێلەکان کەوتنە شوێنی یەک، جادە خۆڵەکەیان بڕی و چوونە سەر جادەی قیرتاو، شەو درەنگ بوو، کەسی وا بەسەر جادە و شـەقامەکانەوە نەمـابوو، جەمـاعەت هەندێ بووژانەوە کە چاویان بە شار و فلکە و ئەلەکتریک و خانوو کەوت.

ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو ئۆتۆمبێلەکـان لە خێراییـان کەم کـردەوە و لە بەردەمـی ماڵێکـدا ڕاوەستان و ژن و پیاوەکان دابەزین و بردیاننە ژوورێ لەگەڵ کۆڵ و بارەکانیـان، دوو

ژووری گەورە و خۆشـیان پیشـان دان و لەوێ دابەش کـران، ژن لە ژوورێـک پیـاو لە ژوورێک.
ئاغـای حەســەنییش ون بـوو و نەمـا و لەگەڵ ئۆتۆمبێلچییەکـانی ڕۆیشـت، ئەمـانیش تێگەیشـتن کە ئیتـر ئەو ئیشـی نەمـا و ئەوەتـا ئەمـانی دایە دەسـت دوو زەلامـی تـر. هەروەهـا سەیریشـیان کرد کە ئەم خـانووە ئەگەرچـی لە مـاڵی خێزان و ژن و منداڵدار دەچێت، بەڵام هیچ ژنێک دیار نەبوو، هەندێکیان لە دڵی خۆیاندا گوتیـان شـەو درەنگە، ڕەنگە ئەوان نوستبن و ئەم دوو پیاوەش کە هاتن بەپیرمـانەوە و ژووریـان پیشـان دان لە کوڕ و بـاوک دەچـوون، یەکێکیـان هەر بیسـت سـاڵ دەبـوو، ئەوەی تریشـیان خـۆی دابوو لە شەست.
خێزانەکان دوای چوونەسەرئاو و چوونەحەمـام و دەسـتوپل و دەموچـاو و قـاچ و قـۆڵ شتن، هەموویـان بە نـۆرە و یەک لە دوای یەک لە خۆشـیی ئاودەستی پـاک و خـۆش و سەرگیراو بە دەرگا و لە خۆشیی حەمام و سەرشـۆرک، هیـی وایـان هەبـوو بەو شـەوە درەنگە دوو سێ جار چوو، دەتگوت هەنگی لە داردا دۆزیبووەوە.
ئەوەندەی پێ نەچوو کوڕە منداڵکارەکەی سـاحێب مـاڵ بە سینییە چـاوە لەگەڵ بەختیـار هاتە لای ژنەکان و خستیە بەردەستیان، هەر زوو ئـامە خـان دەسـتێکی لە خوشکیەوە ژەند و بە چرپەوە گوتی: "ئەیەڕۆ، چایەکان چەند زەردن، ئەڵێی ئاوی دڵۆپەن."
بەختیـار و کـوڕەکە چـوونە دەرێ، لە هەیـوانەکە کـوڕەکە ڕووی کـردە بەختیـار و بە فارسـی هەنـدێ قسـەی لەگەڵ کـرد. ئەگەرچـی بەختیـار سـەری بـۆ لەقانـد و بە زەدەخەنەوە سوپاسێکی بۆ کرد، بەڵام هیچ لە قسەی کوڕەکە نەگەیشت لە نـاوی شـام زیاتر. بەختیار چوو دانیشتەوە لای باوکی و مامی و ئەوان، بەڵام لە دڵدا هەر بیری لە قسـەکانی کـابرا دەکـردەوە و لە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: "خـوایە ئەوە باسـی چیـی لەگەڵ کردم، وا بە پەلە و خێرا قسـەی دەکرد ڕەنگە وای زانیبێ کە بلبلم لە فارسـیدا، خـوایە گیان شامی چی؟ کێ باسی شامی کردووە، تۆ بڵێی وابزانێ خەڵکی شامین یـان لەویوە هاتووین؟"
هەرچۆنێک بوو ناوی شام لە بەختیار بوو بە مەراق بێ ئەوەی قسە بکات.
زۆری پێ نەچوو کوڕەکە هاتەوە بەختیاری بانگ کرد، مشەما و قاپی بە دەستەوە بوو، گوتی: "بە خانمەکان بڵێ ڕێم بکەن تاوەکو شامەکەیان بۆ دانێم."
بەختیـار خەریـک بـوو بـداتە پـرمەی پێکەنـین و تێگەیشـت کە کـوڕەکە باسـی شـێوی کردووە، کە ئێستا بۆیان دێنێت. پێکەنینی بەخۆی هـات و لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: "ئەوەیە کە زۆر جار دایکم و پوورم دوعا دەکەن دەڵێن 'یا شامی غەریبان'، دەبوو بزانم، منیش

لەوساوە دانیشتووم بیر لە شام دەکەمەوە، وام دەزانی کوڕەکە دەڵێت ئێوە خەڵکی شامن یان ڕەوانەی ئەوێتان دەکەن، چۆن لێم ببوو بە مەراق!" دواتر سەریکی بادا و بە ڕوویەکی کراوە و دەمێکی بە زەردەخەنەوە هاتە لای دایکی و ئەوان لەگەڵ کوڕەکە و گوتی: "هەندێ خۆتان لادەن، ئاغای موعینی نانتان بۆ دادەنێت." ئەوانیش کەوتنە خۆیان و هەڵکشان بەرەو ژوور، هەندێکیان خەواڵوو بوون و نوستبوون، حەپسە خان بانگی کردن، ئەوانیش هەستان.

نەوبەهار بە چرپەوە گوتی: "وەڵا زۆرم برسی بوو، خەریک بوو بڵێم ئەرێ شتێکمان پێ نەماوە بیخۆین." ڕووناک دەمی خۆی گرت و پێکەنی و گوتی: "خێریان بنووسێت، پارشێومان دەدەنێ." سەبری گوتی: "دیسان زۆر قسە مەکەن، بە بێدەنگی نانەکەتان بخۆن، ئەوەندە لەسەری مەڕۆن."

تۆفە لە دیوی پیاوەکان مات و بێدەنگ دانیشتبوو، چونکە وەزع و حاڵەکەی پێ خۆش نەبوو، بۆیە هیچ کەیفی نەبوو.

سمە دوو سێ جار هەستایە سەر پێ و گوتی: "تۆ بڵێی ئەو کوڕە پێویستی بە یارمەتی نەبێت، نەچم یارمەتییەکی بدەم؟" بەختیار بە پەلە گوتی: "یارمەتیی کەسیان ناوێت، ئەوان بە فارسی قسە دەکەن و تۆ چووزانیت چی دەڵێن." سمە بە زەردەخەنەوە سەیرێکی بەختیاری کرد و گوتی: "کورە ئاسانە، پیاو خەیاڵی بداتێ تێدەگات، هەندێ قسەیان لە کوردی دەچێت." تۆفە دڵی پڕ بوو، داخی لە دڵدا بوو، بە گەرمییەوە هەڵی دایێ و بەدەم مژ لە جگەرەدانەوە و بە دەمی گیراوەوە گوتی: "کوڕە لایبە، زمان و قسەی چی، کوردی و عەرەبی تێکەڵاو بکە ئیتر دەبێتە زمانی ئەوان." بەختیار دایە پرمەی پێکەنین و گوتی: "باشە، کە کوڕەکە هات و وتی بە ژنەکان بڵێن ڕێگا بکەن سفرە دادەنێن، تێگەیشتی چیی گوت؟" تۆفە سەری ڕاوەشاند و گوتی: "ئەی چۆن تێنەگەیشتم." بەختیار لە دڵی خۆیدا گوتی: "حەرام بێت ئەگەر هەر زانیبێتت کە چی دەڵێت، کە قسەکەی کرد وا واقت وڕما، دەتگوت کوڕەکە فرەنسی قسەی دەکرد."

دوو ڕۆژ بوو حەپسە خان و خوشکی خێزانیان لەو ماڵە بوون لە شاری بانە، پاکوتەمیز ببوونەوە، جلیان گۆڕیبوو، دەست و قاچ و قۆڵ و سەر چەند جار شۆرابوو، سەرپۆش و لەچک سپی هەڵگەڕابوون. مناڵە وردەکان حەسابوونەوە و لەسەر فەرشی کرمانی کەوتبوونە گاگۆڵکێ، کوردۆی نەوبەهار کە لەوان گەورەتر بوو، ئەو بۆ خۆی بەملاولادا ڕای دەکرد، جار جار دەچووە لای باپیری و ئەوان و جار جار دەهاتەوە لای ژنەکان.

ئاغای موعینی و زەلامەکەی تریش قەت نەدەبینران، تەنها کاتی نانخواردن نەبوایە. لە چێشتخانەکەوە دەرگای بچووک هەبوو، لەوێوە دەچوونە بازاڕ و دەهاتنەوە ژووریٚ، دەرگای حەوشەش بە کلیل داخرابوو و کلیلیش لە گیرفانی خۆیاندا بوو.

ئەو ڕۆژە تۆفە تاقەتی چوو و بێزار بوو، دوو سیٚ جار چووە حەوشە و گەڕایەوە ژووریٚ، ڕووی کردە بەختیار و گوتی: "ئەوە بۆ لەم کوڕە ناپرسیت، دەمەویٚ هەندیٚ جگەرە بکڕم، دەمەویت بچمە ناوبازاڕ." بەختیار بە زەردەخەنەیەکی ساردەوە گوتی: "کاکە تۆفە گیان، منیش بەقەد تۆ فارسی دەزانم، ئیتر بۆچی خۆت پێی نالێیت؟" تۆفە سەری با دا و گوتی: "بلێم چی، ئەوەتەی هاتووین هەر تۆ بانگ دەکات و قسە لەگەڵ تۆ دەکات." بەختیار پێکەنی و گوتی: "ئەوە حەزی لە ناوەکەم کردووە، ناوەکەم ئاسانە بۆیە هەر من بانگ دەکات."

کاکە حاجی گوتی: "وەڵا بە قسەی من دەکەن پێیان مەڵێن، ڕەنگە ڕازی نەبن کە ئێوە بچنە بازاڕ." تۆفە بە ناڕەحەتی و بێزارییەوە گوتی: "کەواتە بلێن ئێمە لێرە حەپسین!" کاکە حاجی سەری داخست و بە کەساسییەکەوە گوتی: "ئەرێوەڵا حەپسین، ئەی چین، لیرە ئێمە ناتوانین لە قسەیان دەرچین." تۆفە بە تووڕەبوونەوە و بە توندی گوتی: "دە یاڕەبی خوا ئەم حاڵە ببڕیٚ، خۆزگەمان بە ژێر دەوەن و دڕکوداڵی لای خۆمان." بەختیار هاتە قسە و گوتی: "ئینجا کاکە تۆفە کامە سەگباب دوور لە باوکم و مامم وا نالێت، ئەرێوەڵا نەک ژێر دڕکوداڵ، من دەڵێم کاشکی هەر لە ماوەت بکوژرامایە و نەگەیشتمایە ئەم حاڵە، بەڵام دەڵێی چی، براکانمان بە لۆریی حکومەت هاتنە سەرمان، ئیتر دەسەڵاتمان نەما."

تۆفە گوڕی دایە خۆی و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئێستا دەچم پێیان دەڵێم کە دەمەوێت بچمە دەرەوە جگەرە بکڕم، خوام لەو خوایە بلێن حاڵیٚ حسێبیٚ."

دوای بەینێک بە دزییەوە هەستا و چووە بەردەرکی ژووری دوو زەلامەکە و بە ئەسپایی لە دەرگاکەی دا و یەکێکیان بۆی کردەوە، تۆفە سەلامێکی کرد و پاکەتە جگەرە بەتاڵەکەی پیشان دا و گوتی: "ئاغا جگەرە ماکو." ئینجا بە کوردی تەواوی کرد و گوتی: "دەمەوی بچم بۆ بازار بیکڕم." یەکێکیان ئیشارەی کرد و بە فارسی گوتی: "باشە، وەرە لەگەڵم دەتبەم بۆ ئەو دوکانە." تۆفە بە شەوق و خۆشییەوە سەلامێکی تری بۆ کرد و گوتی: "باشە ئاغا، ڕاوەستە با بچم پارە بێنم." ڕای کردە لای حاجی و ئەوانی تر، هەموو لەشی پێدەکەنی و بە گەرمییەوە گوتی: "کوڕە چووم پێم گوتن، گوتیان وەی بەسەرچاو، ئەوە بۆ زووتر قسەت نەکرد وەرە با بڕۆین، قەیدی نیس، قەیدی نیو!" بەختیار بە پێکەنینەوە گوتی: "باشە چۆنت پیٚ گوت؟ چۆن تێگەیشتی

لێیان؟" تۆفە سەرکەوتوانە گوتی: "پاکەتەکەم پیشان دا و گوتم ئاغا ماکو جگەرە." هەموو کەوتن بە گازی پشتدا لەبەر پێکەنین، حاجی مەجید گوتی: "کورە باوکم ماکو عەرەبییە." حاجیی براشی بەدەم پێکەنینەوە گوتی: "ئاخر ئەوە ناڵێت زمانەکەیان کوردی و عەرەبی تێکەڵاوە، ئیتر چیتان دەوێت، خۆ ئەو توانیی تێیانبگەیەنێت، حەز دەکەن با بە تورکی گوتبێتی." تۆفەش پێکەنیلەگەڵیان و پارەی برد و ڕۆیشت لەگەڵ کورەکە.

ژنەکان پاڵ کەوتبوون و تێر نوستبوون و حەسابوونەوە و لەبەر ئەوەی بێئیشوکاریش بوون، ئیتر خەیاڵیان دابووە دارودیوار و کەلوپەلی ماڵەکە. لە ژوورەکەشیان ڕەسمێکی گەورەی شاهەنشا و شاژن هەڵواسرابوو، زوو زوو سەتری ئەو ڕەسمەیان دەکرد و هەریەکەیان شتێکی دەگوت. ئەمیان دەیگوت: "کچەکە، ژنی شا چەند جوان و چاو و برۆ مەستە." ئەوی تریان دەیگوت: "دەڵێن کچی زابت و ئەفسەرێکی بچووک بووە، خوا لەم هەموو کچە خانەدان و جوانانە ئەم بەختەی داوەتێ کە شا ئەوی بەدڵ بووە." ئامە خان سەری ڕادەوەشاند و دەیگوت: "پەنا بە خوا لە بەختی ئەم شایە، هەرسێ ژنەکەی یەک لە یەک جوانتر بوون." حەپسە خان هەڵی دەدایێ و دەیگوت: "ئۆ ئۆهـ هەرسێکیان نەدەگەیشتە ژنی یەکەمی. خوشکەکەی مەلیک فاروقی میسر، ئەو زۆر جوان بوو، ناوی فەوزیە بوو." سەبری زانایانە و خوێندەوارانە دەیگوت: "ئەم ژنەی خوێنگەرمە، بەڵام وەکو دوانەکەی تر جوان نییە، لووتی دەڵێی ژاپۆنییە." ئامە خان دیسان سەری بۆ ڕادەوەشاند و دەیگوت: "ئەمیان بەختی جوانە، ناوچەوانی جوانە، جوانیی بۆچییە."

لەو کاتەدا کورە ئیشکەرە خاوەن ماڵەکە دای لە دەرگا و سەلامی کرد و دیسان مشەمای سپیی هێنایە پێشەوە، کە نان بخۆن. دای خست و چووە دەرەوە کە خواردن بێنێت.

حەپسە خان دایە قاقای پێکەنین و گوتی: "ئەیەڕۆ خۆ وەکو دابەستەمان لێ هاتووە، ئەمە چوار ڕۆژە هەر دەخۆین و دەنوین، کەس نییە بێت بەلامانەوە و پێمان بڵێت چی دەکەین و بۆ کوێ دەچین و کەی دەڕۆین."

ئامە خان بە ماتییەکەوە گوتی: "کەممان بەسەر نەهاتووە، دە با دوو ڕۆژیش وابین."

* * *

بۆ سبەینێ پاشنیوەڕۆ خەبەریان بۆ هات کە ئامادە بن سبەینێ بەیانی زوو دەکەونە ڕێ بەرەو تاران. بەیانی زوو دوو لاندرۆڤەر هاتنەوە، دیسان جەماعەت بە کۆڵ و باریانەوە سوار کران و بەرەو تاران کەوتنە ڕێ، بۆ شەوێ لە یەکێ لە شارەکانی سەر ڕێگا نوستن، بۆ ڕۆژی دوایی ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتنە دەوروبەری تاران.

تاران له دوورەوە و له بەرزاییەوە ئەوەندە جوان بوو، هەر دەتگوت دەریای ئەستێرە و لاله و چراخانە، ڕێگا و شەقامەکان که بۆی دەچوون هەمووی پانوبەرین و ئەمبەر و ئەوبەریان بە دارودرەخت ڕازابووەوە، تابلۆ و ڕەسمی پڕوپاگەندە و ئیعلان بەرە بەرە دەردەکەوتن و قەڵەبالغی و ڕێچکەی ئۆتۆمبێلی جۆراوجۆریش دەستی پێ کرد، ئۆتۆمبێلەکانی خێڵیش کەوتنە ناویان و گەیشتنە ناوشار، شارێکی پێشکەوتوو و ئاوەدان، لەمبەر و ئەوبەری جادە و شەقامەکانی هەموو بینای بەرزی چەند چینی و ئوتێل و فرۆشگای گەورە گەورە و لە هەموو شتێک زیاتر، کە سەرنجی سەبریی ڕاکێشا، دوکانی گوڵفرۆش بوو، له دڵی خۆیدا گوتی: "بەڕاستی دیارە میللەتێکی بەزەوقن، ئەوەی لای ئێمە باسی نەبێت دوکانی گوڵفرۆشییە، لە هەموو ئەو بەغدا گەورەیەدا وابزانم یەک دوکانی گوڵفرۆشیی تیایە یان دوان، ئەویش ئەگەر یەکێک بیەوێت چەپکێ گوڵ بەرێت بۆ خەستەخانە بۆ سەردانی ئاشنایەکی، دەبێ دوو سێ سەعات ڕێگا بڕوات تاوەکو دەگاتە مەیدانی سەعدوون چەپکێ گوڵ بکڕێت." لچی هەڵقورتاند و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەویش کوا، مەگەر ئەوانەی زۆر مەدەنی و پارەدارن، ئەگینا لای ئێمە کێ گوڵ دەبات بۆ کی، بەڵام تۆ سەیری ئەو هەموو دوکانی گوڵفرۆشییەکە لێرە."

هەندێ لە جەماعەت لە ناو ئۆتۆمبێلەکان چاویان زەق ببوو، هەر سەیری ئەمبەر و ئەوبەریان دەکرد.

منداڵدارەکان تاقەتیان چووبوو، چونکە شەقام و ڕێگای ئۆتۆمبێل زۆر قەڵەباڵغ بوو، لە زۆر شوێندا ئۆتۆمبێلەکان هەر دەچەقین و بەینێک ڕادەوەستان و منداڵیش دەگریان.

ماوەیەکی باش بە ناو شاردا ڕۆیشتن، چەند شەقام و فلکەی گەورە و بچووکیان بڕی، ئینجا ئۆتۆمبێلەکان لایان دا و شوێن یەک کەوتن و چوونە ناو شەقامێکی تری ئەمبەر و ئەوبەر، کە بینا و خانووی بەرزی سپیی چوار چینی هەبوون و لە بەردەم خانوویەکی دەرگا ئاسنی گەورەدا ڕاوەستان و بە جەماعەت گوترا کە ئیتر دابەزن، هەموو دابەزین و کۆڵ و بار داگیرا.

حەپسە خان لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەی خوایە لەسەر تۆ، بزانین چییە کە لە چارەمان نووسراوە." ئامە خان بەدەم بۆڵەی ژێر لێوەوە گوتی: "هەر ئەم جارە کۆڵ و بار و پڕیاسکەمان دانەگرت، قوڕ بە سەرمان نەبێت، وەڵا هەر عەینی قەرجمان لێ هاتووە، کۆڵ بە کۆڵەوە و هەر ڕۆژە لە شوێنێک."

خێڵ چوونە ژووری، دوای ئەوەی کوڕێکی ئەفەندی کە لە کوڕەکانی خانووەکەی بانە دەچوو، گورج هات و دەرگای بۆ کردنەوە و ئەلەکتریکی بۆ داگیرساندن،

ئۆتۆمبێلچییەکـان لەگەڵـی کەوتـنە قسـەوباس و چرپەچـرپ و ئەمانیـان دایە دەسـت کوڕەکە و خۆیان بە پەلە سوار بوونەوە و ڕۆیشتن.
خـانووەکە گەورە و خـۆش بـوو، سـێ چینـی بـوو، حەوشـێکی چوارگۆشـەی هەبـوو لە ناوەڕاستیدا حەوزێکی شینی جوانی هەندێ گەورەی تیا بـوو، سـێ دەورەی حەوشـەکە هەمـووی دارودرەخـت و گـوڵ و ئینجـانە بـوو، هەروەهـا لە حەوشـەکەدا پێپلیکـانەیەک هەبوو دەچووە چینی یەکەم، بە درێژایی قەراغی پێپلیکەکەش ئینجانە گوڵ دانرابوو.
حەپسـە خـان و ئەوان سـەرکەوتنە سـەری، بەدەم سـەیرکردن و چـاو لە یەک بـڕینەوە هەروەک بە یەکتری بڵێن: "چەند خانوویەکی خۆشە، تۆ بڵێی هەر لێرە بمێنینەوە یـاخود هەر ئەمشەو لێرە دەبین و سبەینێ دەمانبەنە شوێنێکی تر." سەیری یەکتریان دەکرد.
خانووەکە ئەگەرچی هەنـدێ کـۆن بـوو، بەڵام بۆ ئەو خێزانە زۆر بـاش بـوو، دوو سـێ حەمـامی تیـا بـوو، ژوورەکـان گەورە گەورە بـوون، دەتگـوت مەکتەبە، کەلوپەلیشـی تیـا بوو وەکو نوێن و کورسـی و قەنەفە، ژوورەکـان هەمـوو داخرابـوون بە فەرش و قـاڵی، ئەگەرچـی هەنـدێ کـۆن بـوو، بەڵام جـوان و ڕێکوپێـک بـوون. چێشـتخانەیەکی گەورە و باشیشی تیا بوو لەگەڵ قاپ و مەنجەڵی زۆر.
خێڵ کەوتنە مقۆمقۆ و چرپەچرپ، ئەم دەیگوت: "وای تاران چەند خۆشـە!" ئەوی تریـان دەیگـوت: "تـۆ بڵێـی لەم خـانووەدا بمێنین؟!" ئەمەی تریـان دەیگـوت: "ئەم خـانووە چەنـد گەورە و باشـە دەڵێـی بـۆ ئەم خێـزانە زۆرەی ئێمە کراوە!" یەکێکـی تـر سـەری دەبـردە نزیـک ئەوەی تـرەوە و دەیگـوت: "چییە ئەم کوڕە لەم خـانوەدا دەژی و لە خـاوەن مـاڵ دەچێت؟!"
هەفتەیەک بوو جەماعەت گەیشتبوونە تاران، پێشـیان گوترابـوو کە ئێوە ئیتـر لەم خـانووەدا دەژین، تاوەکو لێرەن و ئەم کوڕەش کە لێرەیە لەگەڵتان دەبێت، مشووری خـواردن و بـازاڕ و هەمـوو ئیشـوکارێکتان دەخـوات، ئەوەش ئاشـکرا بـوو کە دەبـوو خێـڵ بـکەونە ژێـر چاودێریی ئەو کوڕەوە، کە بە ناوی پاسەوانی مـاڵەکە و چێشـتکەرەوە لە لایـان دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئاگای لە هەموو جووڵە و هەستان و دانیشتنیان بێ و ئاگاداری ئەوە بێ کە کـێ هاتوچۆیان دەکات و کێ پەیوەندییان پێوە دەکات، بەتـایبەتی کە تـاران پڕ بوو لە کوردی ئێرانی، کە بەشی زۆریان لەژێر چاودێریی ساواکدا بوون و جووڵانەوەیان هەمـوو دەژمێرا و دەشـیانزانی کە ئەگەر بـزانن ئەمـان هـاتوون بـۆ ئێرە، ڕەنگە هەر زوو بـێن بـۆ لایـان و پەیوەندییان پێوە بکەن، کە ئێرانیش ئەوەی پێ خۆش نەبوو.
ساواک یان دەسگای ئەمن، ئەوسـا لە ئێران خۆیـان حیسـاب بـوون و تێکڕا دەسـەڵاتی تەواویان بەسەر هەموو دەسـگاکانی تری دەوڵەتدا هەبوو، تەنها دوژمنایەتییـان لەگەڵ

هێزی سوپادا هەبوو، هەردوو لا زۆر ڕقەبەرایەتیی یەکتریان دەکرد بەپێی قسەی ئەو کەسانەی شارەزای حاڵ بوون. ئەگەرچی خێزانەکانی حەپسە خان و ئەوان لە سەرەتاوە بوونی ئەو کوڕەیان لەو خانووەدا زۆر پێ ناخۆش بوو، بەتایبەتی ژنەکان. ئامە خان دەیگوت: "ئەیەڕۆ دایکم، ئەمە نامەحرەمە چۆن لەگەڵمان بژی، چوونە حەمامێکە، سەرڕووتییەکە، بەنی ئادەم لە ماڵی خۆیدا هەزار شت دەکات، ئینجا ئەمە لەپڕ بۆ ئیشێک بێت و بە سەری ڕووت یان بە نەوعێکی تر بمانبینێت، ئەمە چۆن دەبێت!" کاکە حاجییش پێی دەگوت: "ئینجا تۆ هەر ڕازی مەبە، کچێ ئەوە قسەی چی دەکەیت، ماڵی چی و خۆتی چی، ئێستا ئێمە وەک دەسبەسەر واینە. خۆیان چۆنیان حەز کرد وادەکەن، ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین." هەروەها کچەکانیشی پێیان ناخۆش بوو و دەیانبۆڵاند، بەڵام وردە وردە لەگەڵی ڕاهاتن، بەتایبەتی کە کوڕەکە لەشی سووک و پاکوتەمیز و ئازا و زیرەک بوو، سێ ژەمە نان و چێشتی پاکوتەمیزی بۆ ئامادە دەکردن، وەختی نانخواردن بانگی دەکردن: "خانم سفرە حازرە."

ئاغای ڕەزائی، کە ناوی کوڕەکە بوو، ئەگەرچی چێشتی بۆ لێدەنان و بازاڕی بۆ دەکردن و گۆشت و زەخیرەی بۆ دەکڕین، بەڵام دەبوو یەکێ قاپەکانی بۆ بشوات و چێشتخانەکەی بۆ پاک بکاتەوە، هەروەها خێزان دەبوو خۆیان ماڵەکە پاک بکەنەوە و ئیشەکانی تریان بکەن.

تۆفە و سمایل و دوو کوڕەکەی خزمیان، کاوە و کامەران، لە ژوورێکی چینی خوارەوەی ماڵەکە و لە بەرانبەر ژووری ئاغای ڕەزائیدا بوون، چێشتخانەکەش هەر بە تەنیشتیانەوە بوو و لەگەڵ حەمام و تەوالێت و ئەو شوێنە پێویستیانە و هەموو ئەوانە لەسەر هۆڵێکی گەورە بوون، کە لەوێشەوە پێپلیکەیەک دەچووە سەرەوە بۆ هەرسێ چینەکەی تر، هەروەها ژوورێکی گەورەی بە شووشە کراویش دەیڕوانییە سەر حەوشەکە بۆ پاراستنی گوڵ و گوڵزار، کە لەبەر سەرمای زستان کرابوو.

تۆفە هەر دوای هەفتەیەک گوتی: "بە تەواوی فێری فارسی بووم." دەچووە دوکانی دەوروپشتی خۆیان، کە زۆر جار ئاغای ڕەزائی خۆی نەیدەپەرژا تۆفە یان یەکێ لە کوڕەکانی تری دەنارد، کە بچن شتێکی بۆ بکڕن، شتی بچووک وەک شقارتە یان دەسکێ کەرەوز، یان کولێرە و نان، چونکە شتە گەورەکان خۆی هەر زوو دەیکڕین.

ڕەزائی زۆرتر تۆفەی بانگ دەکرد، وەکو شتێک ئەویش لێی تێگەیشتبوو و دەیویست گێچەڵی پێ بکات و پێی ڕاببوێرێت، تۆفەش زۆر داخ لە دڵ و ناحەزانە لەگەڵی دەجووڵایەوە و ڕەفتاری دەکرد، هەمیشە لە ژێر لێوەوە جنێوی پێ دەدا. جارێکیش چوو بەگژیدا و قیڕاندی و هەروا بە کوردییەکی پاراو لێی ڕاپەڕی و گوتی: "بۆچی ئێمە

قاپت بۆ بشۆین و چێشتخانەت بۆ پاک بکەینەوە، کە چێشتخانەکە هی تۆ بێت قاپەکانیش خۆت بیشۆ." حەپسە خان و ئەوان بە دزییەوە تۆفەیان بانگ کرد و چوون بەگژیدا و پێیان گوت: "لە ڕێی خوادا دەمی خۆت بگرە و حەیامان مەبە، ئێمە ئەم هەموو کەسە لەمماڵەداین، دە با قاپی خۆمان خۆمان بیشۆین." تۆفە هەڵچوو و گوتی: "قەیناکە ئەگەر خۆمان هەقمان هەبوایە بەسەر چێشتخانە و هەق و حسابەوە، ئەوسا بە خۆشییەوە هەمووی هەر خۆمان دەمانکرد، بەڵام تۆ سەیری بکە ئەو وا تەماشامان دەکات، دەڵێی ئێمە خزمەتکاری باوکین و هەر ئەمرمان بەسەردا دەکات." حاجی مەجید هەڵی دایە و گوتی: "کاکە گیان بەس نییە، ئەو خواردنەکەتان بۆ حازر دەکات و دەیخاتە بەردەستتان، ئەی ئەگەر ئەوەشی نەکردایە و هەروەکو ئاغای تەواو بەسەرتانەوە بگەڕایە و ناچار بوونایە ئێوە سینیتان بخستایەتە بەردەمی، ئەوسا دەتگوت چی؟" حەپسە خان هاتە قسە و گوتی: "کوڕی بابی دان بە خۆتدا بگرە، بزانین خوا چیمان لێ دەکات، ئینسان قسەیەکیش بۆ دز بکات، وەڵا کوڕەکە خراپ نییە و زۆر لەشسووکە و زۆریش بەخزمەتە." تۆفە خێسەیەکی لە حەپسە خان کرد و گوتی: "ئەرێوەڵا لەشسووکە، بۆچی لەشسووک نابێت، ئەوە قازانجی خۆی تیایە." تۆفە دەنگی نزم کردەوە و لێیان هاتە پێشەوە و بە چرپە گوتی: "ئێوە چووزانن، کاک عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە کە ئەمانە چی دەکەن." بەختیار بە حەپەساوییەوە گوتی: "کاک عەبدوڵڵا کێیە؟" تۆفە دیسان بە چرپەوە گوتی: "پیاوی ئەو ماڵە مەهابادییەیە، بەڵام توخوا ناوی مەبەن لای کەس، ئەوەتا ماڵەکەیان لە سەرووی کۆڵانەکەی ئێمەوەیە، هەموو جارێک لە نانەواخانەکە پێم دەگات و دەڵێت: 'بەخوا سەید محەمەد و ماڵەکەیان وەختە دڵیان دەربێت بۆتان، بەڵام ناوێرن بێن بەلاتانەوە لەبەر دەوڵەت و ئەم پیاوی ساواکەی لە لاتانە.' ئینجا ئەو هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە و گوتی: 'ئێستا ئەم کابرایەی لای ئێوە چەندتان بۆ سەرف دەکات، سێ ئەوەندە دەنووسێت و لە دەوڵەتی وەردەگرێت و نیوەی بۆ خۆی نیوەکەی تریشی بۆ ئەوی لە خۆی گەورەترە.' ئەمانە هەموویان گەورە و بچووکیان هەروا شەریکەدزن و ئەمە ئیشوکاریانە." سەری ڕەواشاند و گوتی: "ئەی چۆن، خۆ لەبەر خاتری چاوی کاڵی ئێمە نییە، بۆ قازانجی خۆیەتی." ئەم جارە کاکە حاجی هاتە قسە و گوتی: "کوڕە ئێمەی دەربەدەر و هەڵهاتوو هەقمان چییە بەسەرەوە، ئەوە ماڵی خۆیانە و ئیشوکاری خۆیانە، ئێمە بۆ حەیای خۆمان بەرین، خۆمان پیاو خراپ بکەین، بە ئێمە دەگۆڕێن، ئێمە هەر دەبێ دەست بە کڵاوی خۆمانەوە بگرین، با نەیبات تاوەکو بزانین خوا چی دەکات."

هەرچۆنێک دەبوو بە هەموویان تۆفەیان بێدەنگ دەکرد و خاویان دەکردەوە و بەینێک ئەویش سەری خۆی کز دەکرد و سەیری دەمی ئاغای ڕەزائیی دەکرد، تا پاش چەند ڕۆژێکی تر، دیسان شتێک ڕووی دەدا یان دەهاتە پێشەوە، کە لە توانایدا نەدەما قوتی بدات، لەبەر ئەوە دیسانەوە بەزمێکی تری هەڵدەگیرساندەوە و قرەیەکی تری دروست دەکرد.

ڕۆژێک کە دیسانەوە تۆفە بەزمێکی نابووەوە، حەپسە خان بە نارەحەتییەوە گوتی: "بەخوا دایکم کە عەلی و کوڕەکان سەریان داین پێیان دەڵێم ئەم هەڵەوەڕە بەرنەوە لای خۆیان، با بچێتەوە ناو پێشمەرگە، ئەمە سەرمان بە فەتارەت دەدات." خوشکی وەرامی دایەوە و گوتی: "ئەرێوەڵا، دەستم لەسەر دڵمە، چونکە هەڵدەستێت و دادەنیشێت دەڵێت لە گۆڕی باوکی ئاغای ڕەزائی دەبەم، ئەم قسەیە بۆتە وێردی سەر زمانی، ئەو ڕۆژە پێم گوت: 'ئەرێ ڕۆڵە تۆ دەزانی گەورە کێیە و تۆ باسی کێ دەکەیت؟ ئێستا گوێی لێ دەبێت خوا دەزانێت چیمان بەسەر دەهێنن.' کەچی زەق سەیری کردم و گوتی: 'ئەی چۆن نازانم باسی کێ دەکەم، ئاخر منیش بۆ ئەوی ڕەوانە دەکەم.'" سەبری لەولاوە بە تووڕەبوونەوە هەڵی دایە و گوتی: "ئەم خواگرتووە سەری لێ تێک چووە، وادەزانێت جەنابی کە بە هەڵهاتوویی هاتووە بۆ ئێرە ئیتر دەبێ ئەمان بیخەنە سەر سەریان، ئاخر بە چیتەوە نەگبەت؟ نازانێ ئێستا ڕەنگە لە دڵی خۆیاندا چەند بە سووکی سەیرمان بکەن، چونکە بووین بە دوو بەشەوە، یەکتریمان قەلاچۆ کردووە و لەبەر حکومەت یان دوژمن ڕامان نەکردووە و لەگەڵ برا و ئامۆزا و هاوولاتیی خۆمان وەکو دڕندە و حەیوانی کێوی بەربووینەتە گیانی یەک و خۆمان کرد بە گاڵتەچیی عالەم و ئێستا هەموو کەسیش بە سووک و بێقەدرمان سەیر دەکەن، هەروەها ئەوانەی تریش لە ولات وەک پیاو و دەسەنەخۆری حکومەت سەیریان دەکەن، بێقەدر و سووک و جارێ ئیشیان پێیانە، بۆیە پشیپشیمان بۆ دەکەن، هەروەک ئەمان کە بۆ ئێمەی دەکەن و ڕەنگە ئیشێکیان بە ئێمە بێت و ڕەنگە ڕامان بکێشن، کە هەر بە تەواوی ببین بە پیاویان. بە زیاد نەبێ، یاخوا بمانکوژێ و تووشی ئەوەمان نەکات."

حاجی مەجیدی باوکی ئاخێکی زۆر بەکوڵی هەڵڕشت و گوتی: "وەڵا کچم ڕاست دەکەیت، ئینجا ئەگەر کورد حاڵی وانەبوایە و قەومێکی خۆخۆر و بێگانەپەرست نەبوایە، بۆچی تاوەکو ئێستا هەروا دەمانەوە؟ ئەوەتا سەیر بکە ئەوانەی پەرە مریشک و قاز و گەلا دەگرن بەبەر خۆیانەوە لەجیاتیی جل و دەموچاو و سنگ و پشتیان ڕەسمی ئەژدیها و مار و دوپشکی لەسەر دەکێشن، بوون بە خاوەن دەوڵەت و کورد

هەروا ماوەتەوە. هەمووشی لەبەر ئەوەیە کە ئاوها هەمیشە دووبەرەکییان تێکەوتووە و هەر خەریکی یەکتر کوشتن و لەناوبردن بوون. خۆ لە سەرەتای شۆڕشدا و تاوەکو ئەم دووبەرەکییە دوابڕاوە شوومەمان کەوتە ناو، لە حکومەت زیاتر جاشەکان دەهاتن بەگژ شۆڕشدا، دەزانی چەند جاشی خۆفرۆش هەیە، ئەی ئەمانە کورد نین چین. دە با هەموو یەک بووینایە، بزانە هێز هەبوو دەرەقەتی کورد بێت." حاجی بە کەساسییەکەوە دەستی دا بەیەکدا و گوتی: "بەڵام دەڵێی چی، قەومێکی خۆخۆرین، هیچ کەسێکمان حەز ناکات ئەوی ترمان نینۆکی هەبێت خۆی پێ بخورێنێت، بەڵام با بێگانە هەموو هێز و خۆشیی دنیایان هەبێت، قەیناکە پێمان خۆشە و دەیانخەینە سەر سەرمان." سەیرێکی دانیشتوانی کرد و گوتی: "هەروا شتێکی بچووکتان بۆ بگێڕمەوە، چەند ساڵ لەمەوپێش کوڕێکی خەڵکی سلێمانی لە کولییەی پۆلیسی دەرچوو و یەکسەر لە سلێمانی کردیان بە پۆلیس." سەیرێکی حەپسە خانی کرد و گوتی: "تۆش دەیانناسی، کوڕەکەی کاک غەفوور." حەپسە خان بە مەلوولییەوە گوتی: "ئەیەڕۆ، چۆن نایانناسم، سەردەمێک دراوسێی ماڵی ئامەی خوشکم بوون." ئامە خانیش سەری لەقاند و گوتی: "زۆر ماڵێکی باش بوون، هەر دەتگوت یەک ماڵین، خۆزگەم بەوسا." حاجی کەوتەوە قسە و گوتی: "ئینجا ڕۆژێک حەسەنی موزەمید هات بۆ لام و گوتی: 'خاڵە حاجی، مستەفا بەگ ناردوومیە خزمەتت، کە بەشکم بە معاون عەلییەکە بڵێیت کە ئەو ئیشەی مستەفا بەگ زوو ڕاپەڕێنێت، چونکە لەسەر ئەو ماوەتەوە.'" حاجی بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە گوتی: "منیش بە سەرسووڕمانەوە سەیرم کرد و گوتم: 'ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت، مستەفا بەگ کێیە و معاون عەلی کێیە و ئیشی چی؟' کەچی پێم دەڵێت: 'وەڵا خاڵە گیان مستەفا بەگ لەگەڵ من لە خانوویەکداین، نائیب عەریفە، خەڵکی حللەیە، ئینجا کاغەزی تەرفیعەکەی لە بەردەستی معاون عەلییەکەی کوڕی غەفووری سەر چوخمەکە دایە.' منیش ئەوەندە تووڕە بووم بووم هەر خەریک بووم هەستم و بیدەمە بەر شەق، پێم گوت: 'هەی نانەجیب، ئەمە معاون عەلی چونکە خەڵکی سلێمانییە و خەڵکی لای خۆمانە و دەیناسین، بوو بە معاون عەلییەکە و ناووناتۆریشت لە باوکی نا، بەڵام کابرای تر، مستەفا بەگە، چونکە خەڵکی حللەیە و بێگانەیە و خواش دەزانێت چ تیرەیەکیشە.' وەڵا هەر بە دەرکردن دەرم کرد و گوتم: 'وەڵا تۆش و مستەفا بەگەکەشت شەق بەرن پێی ناڵێم، دە بڕۆ دەی ناپیاو.'"

حەپسەخان نارەحەت بوو لەبەر مێردەکەی، چونکە زۆر ورووژاو تێک چوو کە ئەم قسانەی دەکرد، بۆیە بە پەرۆشەوە ڕووی تێکرد و گوتی: "دە توخوا خۆت وا نارەحەت مەکە، یاخوا خوا تۆفە بگرێ." سەبرییش لەبەر باوکی شڵەژا و گوتی: "بابە گیان تۆ

خۆت نارەحەت مەکە، وەڵا خەتای ئێمەیە کە ئەم قسەوباسە ناخۆشانە لە بەردەمی تۆدا دەکەین و لەبیرمان دەچێت کە نابێ ئەوەندە سەغڵەتت بکەین."

* * *

نەوبەهار لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو، هەندێ جل و کەلوپەلی کوردۆی کوڕی قەد دەکرد، دوای ئەوەی نواندبووی، هەروا دەستی دەدایە پارچە جلێک و خەیاڵی دەڕۆیشت بۆ لای عەلیی مێردی. "خۆ گوتی هەر دامەزراین ئیتر دێم بۆ لاتان، کەچی وا بۆ سێ مانگ دەچێت هەر دیار نەبوو. خۆزگە ئێستا لەپڕ دەیکرد بە ماڵدا، وای چەند خۆش بوو، کە ئێواران لە لای خۆمان سەری دەردەکەوت و یەکێ لە بەردەرگاوە دەیگوت: 'وا کاکە عەلی هاتەوە.' چەندە دڵم لە خۆشیاندا ڕادەچنی و دەگەشایەوە، ئەگەرچی نزیکیشم بوو و ڕۆژی جارێک دوو جار سەری لێ دەداین، کەچی من هەر وام دەزانی کە لە شارێکی دوورەوە دێت کە دەیان گوت وا کاکە عەلی هاتەوە، ئەوەندەم پێ خۆش بوو."

نەسرینیش تاقەتی چووبوو بۆ حسێن و لە دڵی خۆیدا گلەیی لێ دەکرد و دەیگوت: "ماشەڵا، چاک هات بەلامەوە، بەخوا ئێستا لەوێ دەچەقێت و دەچێتە ناو ڕووداوەکانی خۆیانەوە و هەر ئێمەشی بیر نامێنێ، ئەو هەموو جارێک وابووە، لای خۆیشمان کە دەهات سەرمان بدات ئیتر پێی نەدەبوو بڕواتەوە بنکە و کە دەشچووە ئەوێ، بیری نەدەکەوتەوە بێتەوە ماڵێ، بەڕاستی کوڕێکی کەمتەرخەمە."

بەڵام سەبری ئەوەندە مات و دڵتەنگ بوو، کە لەسەر بچووکترین شت هەڵدەچوو و دەچوو بەگژ هەموویاندا، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵێکی زۆری دەدا کە لەبەر باوکی و مامی قسەی خۆش بکات و دڵیان بداتەوە، زۆر جاریش سەرزەنشی خۆی دەکرد، کە بۆچی ئەوەندە ڕەق و وشک و توورەیە، لە کن خۆی خوێنەوار و پێشکەوتوو و خەباتکەرە و دەبێ ئەو ئەم ڕووداوە کارەساتانەیان لا ئاسان بکات، ورەیان بەرز بکاتەوە و نەسیحەتێکی ئەو کوڕ و لاوە بەسەزمانانەی پوورزا و خزمی بکات، کە وەک دیل و حەپس دەست لەسەر دەست و ئەژنۆ لەم خانووە دانیشتوون بێپارە و گیرفانی خاڵی، یەکێکی وەکو سمایلی پوورزای کە لە ماڵی خۆیدا و لای دایکوباوکی تاوەکو بەیانیان لەخەو هەڵدەستا، دەبوو دوو شیش گۆشتەکەی بە برژاوی و لەگەڵ تەماتە و سەوزە و پیاز و نانی تیریی فەریک لەسەر سینی چاوەڕێی بکردایە، وا ئێستا لێرە لات و ملکەچ بە دیاریانەوە دانیشتووە، خواخوایەتی ئاغای ڕەزائی قسەیەکی لەگەڵ بکات و ئیشێکی پێ ڕاسپێرێت و کە بانگی دەکات گاگا سمایل، وا دەزانێت خەڵاتی دەکات. سەبری کە ئەم بیرانەی دەکردەوە دەهاتەوە سەر خۆی و قەولی لەگەڵ خۆی دەکرد کە ئیتر

ڕەوشتی خۆی بگۆڕێت و داخی ئەو وەزعە نالەبارە ود ووریی شیروان بەم فەقیرانە نەڕێژێت.
خۆ بەختیاری بەسەزمان ئەوە هەر هیچ، لە پێشمەرگەیەکی ئازا و دلێر و کلاشینکۆف لە شان و خەباتکەری سەرسەختەوە ئێستا دەست و ئەژنۆ دانیشتووە بێئیش و بێکار، هەر باوێشک دەدات و خەو دەیباتەوە.
ڕووناکیش زۆری کات لە ژوورەکەی خۆی پاڵ دەکەوت و ڕادیۆ بچووکەکەی دەخستە سەر دڵی و گوێی لە گۆرانیی فارسیی خۆش خۆش دەگرت و لەگەڵ هەر کەلیمە و شیعرێکی ئەو گۆرانییەدا بێ ئەوەی تێشیبگات، چونکە گۆرانیبێژەکان ئەوەندە دەنگخۆش و ئاوازخۆش بوون، هەروەها بەسۆزیش دەیانگوت. ئیتر ئەویش چاوی دەنوقاند و بە خەیال باڵی دەگرت و دەفڕی و دەوروخولی بێستوونی خۆشەویستی دەدا، زۆر جاریش دەگریا، بە دزیی دایکی و ئەوانەوە و گیانێکی بەو گۆرانی و مۆسیقا دڵڕفێنەوە بوو، بۆیە هەمیشە ڕادیۆکەی بە دەستەوە بوو.

* * *

دنیا بە تەواوی ساردی کردبوو، پێشڕەوەیی زستان بە تووڕەیی و لەناکاو پەلاماری دارودرەخت و خەلامی دەدا لە ڕێگاوبان، زۆری ئێواران و بەو سەرمایە حەپسە خان و ئامە خان بە جووتە دەچوونە هەیوانەکەی چینی سەری سەرەوە، بۆ خۆیان دوو بە دوو قسەیان دەکرد و سەیری ئەو دەوروبەرەیان دەکرد، جار دەگریان بۆ حاڵی خۆیان و جاریش بە خۆیان پێدەکەنین.
ڕۆژی جومعان لە ڕۆژەکانی تر زیاتر دڵیان تەنگ دەبوو، کە دەیانبینی وا دراوسێکانیان خزم و کەسیان هاتنە لایان و لە بەردەرگای حەوشە دەستیان کردە ملی یەک، دایک و باوک و خاڵۆ و خوشکەزا، مام و برازا، خوشک و برا، پیر و گەنج بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە ماڵی یەکتر دەمانەوە و ئێواران دیسان بە عەینی هەوا و قریشکە و پێکەنین و ماچومووچ و خۆشی لە یەک جیا دەبوونەوە.
حەپسە خان چاوی خۆی دەسڕییەوە لە فرمێسک و دەیگوت: "خۆزگەم بە خۆیان، بزانە ئێمە غەریب و تەنیا و کەساسین، کەسێکمان نییە دەرگاکەمان لێ بقلیشێنێتەوە، ئۆ ڕۆحم دەرچێ بۆ وڵات و شار و کەسی خۆمان."
حەپسە خان و خوشکی چونکە هەموو ئێوارەیەک ئەو گەشت و سەیرانەی هەیوانەکەی سەرێ، خەریک بوون شارەزاییان لە دەرودراوسێ پەیدا دەکرد، کە ئەم ماڵەی دەستە ڕاستیان چەند کەسی تێدایە و ئەوەکەی تریان خاوەن ماڵەکەی چەند ژنێکی جرپن و قیرەقیرکەرە، هەمیشە شاتەی دێت بەسەر مێردەکەیدا و بەسەر ئەو پیرەژنە نەگبەتەی

له لایانه و چۆن هەموو ئەو ماڵەی خسووەتە سەر شانی و ئەو فەقیرە ئەو دوو منداڵەی دەبات بۆ مەکتەب و نیوەڕوان دەچێت دەیانهێنێتەوە. منداڵە کۆرپەکەش بەخێو دەکات و ئەو جرپنەی دایکیشیان هەمیشە یان لەبەر ئاوێنەیە یان سەری لە خەنە گرتووە یان لوولەی پرچ ڕێکخەری بە سەرەوەیە و تێکڕا کراسێکی کورت و بێقۆڵی لەبەردایە، یاخود بە ڕۆبی حەمامەوە دێت و دەڕوات بە ماڵەکەدا، مووکێش و ئاوێنەی بچووکیشی لە دەست ناکەوێتە خوارێ و هەر هەڵەشاخێ بەسەر ئەو ژنە فەقیرەدا و کە منداڵەکان و باوکیان دێنەوە ماڵێ، ئینجا نۆرەی ئەوان دەست پێ دەکات و پیرێژن هەندێ دەحەسێتەوە لەدەست قیرە و شاتەی خانم. حەپسە خان و خوشکی هەر ئاخ و ئۆفیان بوو و دەیانکێشا بە خۆیاندا کە چۆن ژن و دایکی وا هەیە لە دنیادا. بە هەردوو خوشک ناو و ناتۆرەیان لەو ژنە نابوو، ئەو دەیگوت: "دیسان شاتەی بەیتەشەکەیە." ئەمیان دەیگوت: "ها سەیر بکە، تیاترۆ سەماکەرەکە دیسان بەم سەرمایە چۆن خۆی ڕووت کردووەتەوە ئەو کراسە ڕووتەی لەبەر کردووە. چاوت لێیە، ئەوەتا هەر بە ئاشکرا نیوەی هەردوو مەمکی بە دەرەوەیە." ئەمیان دەیگوت: "ئوە بە پەنگ بێ!" ئەوی تریان دەیگوت: "بە دەستم بوایە، سەریم دەتاشی و سواری کەرێکم دەکرد، چۆن دەبێ وا گوێ نەداتە منداڵەکانی و هەر بەسەریاندا هەڵشاخێ." ئەوی تریان دەیگوت: "بەخوا دایکم ئەم دەڵێ دایکیان نییە، ئەمە لە باوەژنیش ناچێت." ئەوی تریان دەیگوت: "کچێ خوشکم منداڵی خۆیین، ئەو ڕۆژە چاوم لێ بوو مەمکی دەدا بە کۆرپەکەیان."

کە لە باسی ئەو ژنە دەبوونەوە، ئینجا باسی ماڵەکەی دیوەکەی تریان دەکرد، کە چۆن ژنی خاوەن ماڵەکە هەر بەیانیی لێ دێت دەکەوێتە فەرشتەکاندن و پەنجەرە و داروديوار سڕین و یەک دەقیقە سرەوتی نییە، وای ماشەڵا چەند گورجوگۆڵە و چەند شیرینە و چەند جلی بەحورمەت لەبەر دەکات و هەر کە منداڵەکانی لە مەکتەب هاتنەوە، ئیتر ئەمە هەر خەریکیانە، نانیان دەداتێ و سەریان دەشوا و جلەکانیان دەشوات و هەڵدەخات و هەر بەقوربان و بەحەیرانیان دەبێت. ئیتر ئەم خوشک دەکەوتە مەتحی و ئەمی تریان بەسەریدا هەڵەدا، حەپسە خان دەیگوت: "دایکم ڕاستیان گوتووە ژنیش هەیە، ژانیش هەیە، ئەوە ئەو ژنە بەیتەشەیە هەر بە تەواوی ژانە نەک ژن." ئامە خانیش هەڵی دەدایێ و دەیگوت "دە بزانە ئەم ژنە باشە گورجوگۆڵە چ چاکەیەکی بۆ ئێمە هەیە، هەر ناشیناسین و ناشماننناسێت، لەو ڕۆژەوە زیاتر کە هات جل هەڵخات لە هەیوانەکەیان و ئێمەی دی و گوتی: 'خانم سەلام، ئەحوالی شما.'" حەپسە خان دایە قاقای پێکەنین و گوتی: "وەڵا فارسییەکەت زۆر باش بووە." ئەویش پێکەنیی گوتی: "وەڵا ماشەڵا زۆر چاک فێر بووم، ئەوە نییە کە گوتی 'شما' وام زانی باسی

شەمشەمەکوێرە دەکات، دوایی کە بە بەختیارم گوت ژنەکەی دراوسێمان سەلامی لێ کردین و باسی شەمشەمەکوێرەیەکی دەکرد، بەختیار پێکەنیی و گوتی: 'ئەوە گوتوویەتی 'ئەحواڵی شما'، یەعنی 'هەواڵی ئێوە چۆنە'.'"

* * *

یەکێ لەو ئێوارانەی کە حەپسە خان و خوشکی لە چینی سەری سەرەوەی ماڵەکەیان ڕاوەستابوون و دیسان خەریکی مشتومڕ و چرپەچرپی خۆیان بوون، لەپڕ حەپسە خان ڕاپەڕی و بە شەوق و خۆشییەوە گوتی: "ئۆخەی خوایە، وەڵا دەڵێی ئەو ئۆتۆمبێلەی لە بەردەرکی ئێمە ڕاوەستا، هەر دەڵێی ئەو ئۆتۆمبێلەشە کە ئێمە پێی هاتین بۆ ئێرە!" تا هەردوو خوشک بە پەلەپرۆزی و بە هەناسەبڕکێ ئەو سێ پێپلیکەیەیان تەواو کرد و گەیشتنە حەوشە، عەلی و بێستوون و نەورۆز لە دەستلەملان و ماچومووچدا بوون لەگەڵ خەڵکی ماڵەکە، ئیتر ئەمانیش بە پەرۆش و خێرایی خۆیان گەیاندنێ.

شەوێ هەموویان لە ژووری فراوانە خۆشەکە دانیشتن، دەوری کوڕەکانیان دا، ئەمیان باسی تاران و خانووەکەیان بۆ دەکردن، ئەوی تر باسی ئاغای ڕەزائی و کەینوبەینی بۆ دەگێڕانەوە.

تۆفەش ماوەی کەسی نەدەدا و دەیویست هەر خۆی قسە بکات، دەستی پێ کردبوو، ئاشناکانی بۆ دەژماردن، کە لەم دەوروبەرە پەیدای کردوون و کە چۆنیش وەک بلبل فێری فارسی بووە، هەروەها باسی ژنێکی لوبنانیی بۆ کردن، کە هەموو ڕۆژێک لە نانەواخانە پێی دەگات و هەموو جارێک سکاڵای ئەوەی بۆ دەکات کە چەند تاقەتی چووە و ناچاریشە لێرە بێت، چونکە مێردەکەی لە سەفارەتی لوبنانی مامووریکی بچووکە و چۆن دەڵێت ئەوەتەی ئەمی دیوە و بە عەرەبی قسەی لەگەڵ دەکات، دڵی ڕوون بووەتەوە، ئەو ڕۆژەش قاپێ پاقلاوەی لوبنانییشی بۆ هێناوە.

حەپسە خان و ئامە خان کەوتنە دەست لە یەکەوە وەژاندن، کە پەنا بەخوا ئەمە ئەم تۆفەیە ئەم هەموو قسەیەی لە کوێ هێنا و ئەو هەموو خەڵکەی لە کوێوە پەیدا کرد. ئامە خان دەستی خستە پەنا دەمی و بە چرپە بە خوشکی دەگوت: "دایکم بۆ هەر کوێیەک دەچێت دەبێتە گوڵی مەجلیس و گەورەی گەڕەک."

نەوبەهار گەشابووەوە لە خۆشیی هاتنی عەلیی مێردی، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خوا بەقوربانی بم، بە دڵی منی کرد کە ئەو ڕۆژە گوتم، خۆزگە ئێستا لەپڕ یەکێ دەیگوت 'کاکە عەلی هات!' وەی چەند خۆش بوو کە گوێم لەم قسەیە بوو، عەیب نەبوایە

مژدانەم دەدا بە بەختیار کە بانگی کرد و گوتی: 'منداڵینە ڕابکەن کاکە عەلی و ئەوان هاتن.'"

ڕووناکیش لە خۆشیی هاتنی بێستوونی خۆشەویستی، ئەو ئێوارەیە هەر گاڵتەی بە چێشتی ناو قاپەکەی دەکرد و هیچی پێ نەدەخورا، بێستوونیش ئەگەرچی لەبەر خەڵکی ماڵەکە و بەتایبەتی هەردوو حاجی هەندێ خۆی قورس و قەمەر کردبوو، بەڵام هەر چاوی لە سەعات بوو خوا خوای بوو کە دانیشتنەکەیان دوایی بێت بۆ ئەوی هەر کەسەو بچێتە ژووری خۆی و ئەو و ڕووناکیش بچنە ژووری خۆیان و بە پەلە دەست بکاتە ملی و تێر تێر ئەو دەمولێوە کوڵ و جوانە ماچ بکات و ئەو لەشە نەرمونۆڵە ناسکەی بگرێتە باوەشی.

سەبرییش وا دەردەکەوێت کە بە هاتنی عەلیی برای و ئەوان دڵی خۆش بوو، بۆیە زۆر ئاقڵانە و کتێبی و خوێندەوارانە باسی وەزع و ڕووداوەکان و سیاسەتی دەکرد و لە دڵی خۆیشیدا بیانووی بۆ شیروان دەهێنایەوە، کە چاکی کردووە جارێ بێستوونی ناردووە، چونکە ڕووناک بووکی ساڵە و هەقە ئەوان پێش خەڵکی تر چاویان بەیەک بکەوێت، ئەگەرچی کە ئێوارە بە هەڵەداوان چوو بەپیریانەوە و شێروانی نەدی، خورپەیەک کەوتە دڵیەوە و هەندێ پەشۆکا.

نەسرین لە دڵی خۆیدا تووڕە بوو لە حسێن و سەرزەنشتی کرد و گوتی: "ئەوە کوڕەکە بوو کە لە پێش هەموویان ئەو دەهات." بەڵام ئەویش تووڕەبوونەکەی لە دڵیدا دەشاردەوە و خۆی زۆر شاد و بەکەیف پیشان دەدا.

حاجی مەجید دوای ئەوەی باسی حاڵ و سیحەت و نەخۆشی و چوونە سەر دکتۆری خۆی بۆ کردن، ڕووی کردە کوڕەکان و گوتی: "ئێوە چۆنن؟ لە چیدان؟ پێشمەرگە دامەزراون و خەریکی چین؟" عەلی بە ماتییەکەوە گوتی: "باشین خراپ نین، هەروا دەبێ، خەریکین ڕادێین." کاکە حاجی پرسیی:

- لە کوێ دانراون؟ هەموو پێکەوەن یان جیا جیان؟
- نەخێر، هەموو پێکەوەین لە شوێنێکی زۆر گەورەین، وەک ئۆردوگای عەسکەری وایە، ژن و ماڵەکانیش هەر لە دەوروبەری خۆمانن، خانوویان بۆ گیراوە، هەر دوو سێ ماڵ پێکەوەن. بەڵام تێکڕا پێشمەرگەکان تاقەت ناگرن، هەر دوای چاخواردنەوە ڕادەکەن و دێن بۆ لامان.

لێرەدا بێستون پێکەنیی و گوتی: "دوای چاخواردنەوەی چی، وەڵا هەندێکیان دێنە لای ئێمە دەموچاو دەشۆن و نان دەخۆن."

حەپسە خان بە چاوێکی پڕ خۆشەویستیی دایکانە، سەیرێکی عەلیی کوڕی کرد و گوتی: "ئەی بەساقەو بم، بۆچی ئەوەندە دواکەوتن؟ دەمێکە چاوەڕێتان دەکەین." بێستوون دەستێکی لە سەروملی خۆی دا و پێشی عەلی کەوت و گوتی: "وەڵا خەسوو گیان، ئەگەر بەدەست خۆمان دەبوو هەر دووەم ڕۆژ دەهاتین، بەڵام بڵێم چی، تاکو دامەزراین و تاوەکو ئیزنیان داین وای لێ هات، خۆ بە کەیفی ئێمە نییە کەی ویستمان بێین و بڕۆین." ئامە خان بە کەساسییەکەوە گوتی: "ئوە ڕۆحم دەرچێت بۆتان، ڕەنگە وەک حەپس وابن." نەورۆز، کە لەنزیک دایکیەوە دانیشتبوو، دەستی خستە سەر شانی و بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "نا نا دایە گیان، حەپس نیین، بەڵام دەبێ ئاگاداری هاتوچۆ و جووڵانەوەمان بن، ئەوەش لەبەر ئێمەیە کە تووشی هیچ نەبین." دیار بوو نەورۆز لەبەر دڵی دایکی وای گوت، ئەگینا هەموویان وەک دەستبەسەر وابوون.
عەلی، وەک بیەوێت تۆزێ لەم باسە دووریان بخاتەوە، بۆیە ڕووی تێکردن و گوتی: "ئێ ئێوە چی دەکەن، چی ناکەن، تا ئێستا چەند جار چوون بۆ ناوشار و بازاڕ؟" بە زەردەخەنەوە ڕووی کردە دایکی و پووری و گوتی: "فێری فارسی بوون؟" ئامە خانی پووری دەمودانی خۆی بە لکی سەرپۆشەکەی داپۆشی و پێکەنی و گوتی: "ئەوە لە کاکە تۆفە بپرسە، ئەو لە هەموومان ئازا و زیرەکترە و بووە بە بلبلی فارسی." تۆفە دەستی بە سک و بەرپکی خۆیدا هێنا و کۆکەیەکی بۆ کرد و گوتی: "ئەی بۆ نا... بە نەبم؟ فارسی هەر زۆر ئاسانە و زۆر لە کوردی دەچێت." ئامە خان بەدەم پێکەنینێکی بێدەنگەوە گوتی: "ئەی ناڵێم شکور تۆ لە هەموان زیرەکتری." ئەمەی گوت و دایە پرمەی پێکەنین و خۆی پێ ڕانەگیرا و گوتی: "بەخوا باوکم من دەڵێی گوێزم بۆ دەژمێرن و لە سەلام و خانم زیاتر هیچی تر فێر نەبووم." تۆفە بە زەردەخەنەوە مژێکی لە جگەرەکەی دا و گوتی: "یاخوا ئەوەش فێر نەبیت."
ئیتر هەموویان بە جارێک دەستیان کرد بە پێکەنین لەگەڵ ئامە خان خۆیشی.
بێستوون گوتی: "وا هاتووین چەند ڕۆژێک لە لاتان دەبین، دەتانبەینە ناو بازاڕ و چ پێویستیتان هەبوو بۆتانی جێبەجێ دەکەین و دەڕۆینەوە، ئینجا کاک شیروان و حسێن دێن بۆ لاتان." لەپڕ عەلی وەکو شتێکی بیر بکەوێتەوە ڕووی کردە جەماعەت و گوتی: "ئێوە دەزانن ماڵی کێ لە تارانن؟" ئامە خانی پووری کە لە هەموویان زیاتر حەزی لە گەڕان و چوونەدەرەوە دەکرد و زۆر لەوێ دڵتەنگ و بێتاقەت بوو، بۆیە بە خۆشییەوە گوتی: "نەوەڵا نازانین! ماڵی کێ دەڵێی؟ ناسیاومانن؟ وەی یارەسولەڵا بەشکم ئەمە خوایە لێرە ناسیاوێک بدۆزینەوە، بە ناشکوری ناڵێم خۆ کەسێک نییە دەرگامان لێ بقڵیشێنێتەوە." حەپسە خانیش ڕووی کردە کوڕەکەی و بە گەرمییەوە گوتی: "ماڵی

کێیە؟ خەڵکی لای خۆمانن؟" "عەلی سەری بۆ لەقاند و گوتی: "ئەرێوەڵا خەڵکی لای خۆمانن." نەورۆز هەڵی دایە و بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە گوتی: "ئینجا وا کاکە پێی گوتن کە ماڵی کێن، بۆچی کە دیتانن دەیانناسنەوە؟" عەلییش پێکەنیی و گوتی: "ناسینەوەی چی، بەتایبەتی ژنەکان، بەخوا ئەگەر کابرا خۆی نەیگوتایە ئەمە دایکی چـــرایە و ئەوەش دایکـــی هۆشـــەنگە، هەر نەمـــدەزانی خەڵکـــی کـــوێن، نەک هەر نەمناسینەوە!" سەبری لەو پێچوپەنایە تاقەتی چوو و حەزی کرد زوو بزانێ کە باسی کێ دەکەن، بۆیە بە بێزارییەکەوە گوتی: "بۆ خاتری خوا دە پێمان بڵێن باسی کێ دەکەن، ئەوە چییە بێقەزا بن هەموو قسەکانتان قەتاح فاڵێکی دەوێ!"
عەلی گوتی: "باسی شەوکەت ئاغای باپیر ئاغا دەکەین." حاجی مەجیدی باوکی پرسیی: "چۆن و بۆچی لێرەن؟ لە کوێ دیتان؟" عەلی ڕووی کردە باوکی و مامی و گوتی: "ئەرێوەڵا لێرەن، ماڵیان لە تارانە، ئەو ڕۆژە لە ئۆردوگاکەمان یەکێک هات بەدوامدا و گوتی شەوکەت ناوێک لە بەردەرگا داوات دەکات و دەڵێت دەمەوێت ببیینم، منیش سەرم سووڕما و گوتم شەوکەت ئاغا کێیە بانگم دەکات و هەر هیچ نەهاتە خەیاڵم کە کێ بێت." تۆفە بە پەرۆشەوە گوتی: "ئێ توخوا، وەڵا ئەمە سەیرە!" نەورۆز بە زەردەخەنەوە گوتی: جارێ ئێوە ڕاوەستن با کاک عەلی بۆتانی بگێڕێتەوە." لەپڕ تۆفە ڕاپەڕی و گوتی: "ئەو شەوکەت ئاغایە نەبێت کە ئەو ساڵە لە سلێمانی لەگەڵ براکەی زەلامەکەیان کوشت کە قەرزاری بوون و بە بیانووی سەیرانەوە دەعوەتیان کردبوو بۆ ئەزمەڕ ئینجا کوشتبوویان و خستبوویانە چاڵێکەوە و دوایی لاشەکەیان دۆزییەوە، ئەمانیش هەر شەوەکەی و پێش ئەوەی پۆلیس بگاتە سەریان بە ماڵ و مناڵەوە ڕایان کردبوو؟" عەلی گوتی: "ئەرێوەڵا خۆیەتی." عەلی وەک پاڕانەوە سەیرێکی هەموانی کرد، بەتایبەتی تۆفە، گوتی: "بەڵام با کەس ئەم قسەیەتان لێ نەبیستێ، ئیمە هەقمان چییە بەسەریەوە." ئینجا کەوتە گێڕانەوەی باسەکەیان و گوتی: "کە هاتن بانگیان کردم، بە شپرزەییەوەکەوە چووم و گوتم خوایە خێر بێت، تۆ بڵێیت شتێک نەقەومابێت." عەلی لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "بەڕاستی شڵەژام و هەزار خەیاڵی خراپم کردەوە و گوتم خوانەکردە باوکم یان یەکێکیان شتێکیان لێ نەهاتبێ، بە جارێ مێشکم داخرا و بیرم نەکردەوە کە ئەگەر خوا نەکردە شتێکی وابوایە، خۆ بە تەلەفۆن لە ڕێگای دەوڵەتەوە پێیان دەگوتین، ئاخری گەیشتمە بەردەرکی ئۆردوگا، برا کە سەیر دەکەم یەک دوو قەمەرەی تـــازەی وەک ڕەخـــش ڕاوەســـتاون، چەنـــد پیاوێـــک بە جلـــی ئەفەندییانەوە لەو ناوە ڕاوەستاون، کە گەیشتمە نزیک دەبینم شەوکەت ئاغایە، خوا هەڵناگری باوەشی بۆ کردمەوە و دەستی کردە ملم و بە گەرمی چاک و چۆنیی لەگەڵ

کردم و هەواڵی یەک بە یەکتانی پرسی و لەوەش زیاتر نەیهێشت سەرم سوور بمێنێ و بۆی گێڕامەوە و گوتی: 'ئەوە هاتووم بۆ کرمانشاه، کۆبوونەوە و زەماوەندێکی گەورە هەبوو، نوێنەری ئالا حەزرەت شاه هاتبوو، ئێمەش دەعوەت کرابووین، وا دەگەڕێینەوە بۆ تاران، چونکە ماڵمان لەوێیە، لەبەر ئەوە کە بە هەمەداندا تێپەڕیم گوتم نەکراوە کە نەیەم سەرێکتان نەدەم.' دواییش بردمی بۆ لای قەمەرەکەی کە دوو ژنی عالمۆدەی تیا دانیشتبوون، لەگەڵ دوو سێ منداڵ، گوتی: 'ئەمەش خێزانەکانمن، دایکی چرۆ و دایکی هۆشەنگ.'" عەلی بە سەرسووڕمانەوە گوتی: "بەخوا لە پێشدا وام زانی نمایشکەری سینەمان، ئەوەندە جلی جوان و ڕازاوەیان لەبەردا بوو، هەزار جار بەلامدا تێپەڕینایە قەت نەمدەزانی کە ئەوانە ئاسکۆڵ و قەدرین و وایان لێ هاتووە."
جەماعەت بە دڵ گوێیان لە عەلی دەگرت، کە حەپسە خان خۆی پێ ڕانەگیرا و گوتی: "ئەیەڕۆ، پەنا بە خوا گوایە ئەمە بە چی وایان لێ هاتووە؟ خۆ لە سلێمانی بە هەندێ گوزەردا نەیدەتوانی بڕوات لە ترسی قەرزار، نان و ئاوی ئەو خێزانە هەمووی بە قەرز بوو."
جەماعەت تێکەڵی قسە بوون و هەر کەسەیان شتێکی ڕابردووی لێ دەگێڕایەوە. ئەو دەیگوت: "ئەوە لە سەدا سەد پارەی کابرای داماویان دەرهێناوە و لێرە لرفی لێ دەدەن، چەنکە قوتیان سەرباقی قەرزی کابرا، بە فێڵ پارەیەکی زۆریشیان لێ سەندبوو، بە ناوی شەراکەت و قۆنتەراتی ئاسن و کەلوپەلی خانوو دروستکردن." ئەمی تریان دەیگوت: "نەبابە، باوەڕ ناکەم ئەوە ئەو بێت و پەیوەندییەکی هەبێت بە ساواک و دەوڵەتەوە، کەوا بانگ کراوە بۆ شای زەماوەندی سەر بە دەوڵەت و هەروەها کە وێراویەتی بێ ترس بێت بۆ ئۆردوگا و چاوی پێتان بکەوێت." ئامە خانیش کەوتە باسی ئەوسایان کە دراوسێی ماڵی پوورە فاتمەی بوون و کە ئەوسا ئاسکۆڵ و قەدری چەند داماو بوون. هەموو ڕۆژێک شەڕ و هەلایان دەگەیشتە بنی گەڕەک.
جەماعەت تێکڕا دانیشتنەکەی ئەو شەوەیان بە باسی شەوکەت ئاغاوە بردە سەر و بە ژماردنی کەتن و بلۆف و دەستبڕینەکانی ڕایانبوارد، زۆریشیان حەز کرد کە بەم گۆڕین و دیمەنە تازەیانەوە بیانبینن.
بۆ ڕۆژی دوایی عەلی و کوڕەکان تەگبیری خۆیان کرد و خەبەری ئاغای ڕەزائییان دا کە ئەم چەند ڕۆژەی هاتوون دەیانەوەێ دایکوباوک و خێزانیان بەرنە دەرەوە و ناو بازاڕ.
ئاغای ڕەزائییش کەوتە تەلەفۆن و چرپەچرپ لەگەل دائیرەکەی، پاش چەند سەعاتێک لاندرۆڤەرێکیان بۆ ناردن لەگەڵ لێخوڕەکەی، کە ئەو چەند ڕۆژەی کوڕەکان لەوێن ئەم

ئۆتۆمبێلەیـان لەگەڵ بێت و کوێیـان ویسـت بیـانبەن. ئەوەش ئاشـکرا بـوو کە سـاواک دەیانویسـت بـزانن بـۆ کـوێ دەچـن و چـی دەکەن، بـۆ ئەوەی ئاگـاداری هەمـوو جووڵانەوەیەکیان بن.

خێڵ بـوون بە دوو سـێ بەشـەوە، بەشـێک ئەمـڕۆ دەچـوون بـۆ گەڕان و ئەمـلاولا و بەشـێک سـبەینێ دەچـوون، چـونکە لانـدرۆڤەرەکە بەشـی نەدەکـردن. بەڵام تـۆفە هەقـی ئەوەی نەبوو کە ئەو بەیانی چووبوو یان دوێنی چووبوو لە پێش لاندرۆڤەرەکە خۆی قیت کردبوو، بێ ئەوەی کەس دڵی بهاتایە یان ڕاستییەکەی بیوێرایە پێی بڵێت ئاخر بـاوکەکەم ئەمە سـێ ڕۆژە لەسـەر یەک تـۆ دەڕۆی، دە بـا نـۆرەی کەسـێکی تـر بێت. کەسـیان زاتـی نەدەکـرد، چـونکە دەیـانزانی کە لەوانە بـوو ئەو کەسـەی بکـردایە بە سینەمای گەڕەکەکە.

تۆفە لە پێش ئۆتۆمبێلەکەوە سنگی دەرپەڕاندبوو و خۆی قیت دەکردەوە و بە درێژایی ڕێگاکـان دەمـی وەک ڕادیـۆ دەکـرایەوە و دەکەوتە کـار، بە هەر شـەقامێکدا تێپەڕینـایە وەک چاوساغیان بێ دەستێکی درێژ دەکرد و باسـێکی ئەو شـەقامەی بۆ دەکردن یـان دەیگـوت: "ئەو ڕۆژە لێرە و لەم دوکـانە پاکەتی جگەرەم کـڕی، کەچـی نـازانم لە ڕێگـا چـۆن لـێم کەوتبـوو. ئـا ئەمەتـا لە بەردەمـی ئەم دوکـانی گوڵفرۆشـەدا، ئەو ڕۆژە دوو کەس شـەڕیان دەکـرد و خەریـک بـوون یەکتـر بکـوژن، مـن فریایـان کەوتـم و لەیەکـم کـردنەوە." لە پـاش بەینێـک تـۆفە دەهـاتەوە قسـە و دەیگـوت: "خـۆ ئەم شـەقامە گەورە خۆشـە هەر باسـی مەکەن!" تـۆفە لە پەنـجەرەی ئۆتـۆمبێلەکەوە سـەیرێکی ئەمـبەر و ئەوبەری دەکرد و ئاوڕی دەدایە ئەوانەی لە پشت و ناوەڕاستی جێبەکە دانیشـتبوون و دەیگـوت: "لێـرە لەم شـەقامە ئێـواران وەختـی چـرا و گڵـۆپ داگیرسـاندن ژنـی بەدخـوو خۆیـان دەڕازێننەوە بەمـبەر و ئەوبەری شـەقامەکە ڕادەوەسـتن، تەشـبیهات نەبێ وەک مەیـدانی ماستفرۆشـەکانی لای خۆمـان کە هەر کەسـێ دێـت بـۆ خـۆی مەنجەڵێـک یـان جامێ ماست هەڵدەبژێرێت، لێرەش پیاوی  بەدخـوو و دەوڵەمەند بە قەمەرەی درێـژی دڵفڕێنەوە دێن بـۆ خۆیـان هەر کەسـەو ژنێـک هەڵدەبژێرێت و لە دوای سـەوا و مـامەڵە سـواریان دەکەن و دەڕۆن." جارێکیـان کە تـۆفە دیسـان باسـی ئەو ژنە بەدخـوانەی دەکرد، ئامە خانیان لەگەڵدا بوو، بۆیە کە گوێی لەو باسە بوو بە حەپەساوییەوە کێشـای بە خۆیدا و گوتی: "ئەیەڕۆ! یارەبی تۆبە، ئەمە چ قسەیەکە، چۆن شتی وا هەیە! ئەیەڕۆ ئەستەغفیروڵڵا توخوا تۆفە قسەی وامەکە." نەورۆزیش کە لە بەینی تۆفە و  لێخورەکە سوار بووبوو، سیخورمەیەکی لە تۆفە دەدا، کە دەمی خۆی بگرێت و ئەو قسانە نەکات، لەبەر لێخوڕی ئۆتۆمبێلەکە چونکە پیاوی ساواک بوو، هەرچەندە وای لە خۆی کردبوو

کە کەلیمەیەک کوردی نازانێت، بەڵام گەر ڕاستیشت بکردایە کە کوردی نەدەزانی، خۆ لە هەندێ ئەو قسانەی تۆفە دەگەیشت، بەتایبەتی باسی ژنی بەدخوو، کە بە فارسییش هەر وا دەڵێن.

* * *

هەرچەندە دەگەڕانەوە ماڵەوە، کوڕەکان نەسیحەتی تۆفەیان دەکرد کە دەمی خۆی بگرێت و ئەو جۆرە قسانە نەکات، بەڵام دوای بەینێک بێدەنگی، تۆفە نەسیحەتەکانی لەبیر دەچووەوە و دەکەوتەوە باسی خراپە و دەستبڕین و فرتوفێڵی ناوبازاڕ و دەکەوتە باسی لەتە شووتیی ڕەنگکراو، مریشکی بە شرینقە ئاو تێکراو تاوەکو قورس دیار بێت و کەڵەک و خاختەکانی دەژماردن و دەتگوت کە دەمێ ساڵ بوو لە ناویاندا ژیابوو، ئەوەندە وەک لێزان و شارەزا باسی دەکردن، کەچی لە ڕاستییشدا زۆری ئەو باسانە کاک عەبدوڵڵا پیاوی ماڵی مهابادییەکە بۆی گێڕابووەوە، کەچی ئەویش دەیکرد بە ڕووداو و بەسەرهات و شارەزایی خۆی.
عەلی و کوڕەکان ئەو بەینەی لە تاران بوون ماڵەکەیان گەرموگوڕ و خۆش کردبوو، هەروەها ماڵ و منداڵیشیان بە دڵی خۆیان گێڕابوو و بردبوویاننە شوێنی وەک ئاب عەلی، کە شوێنیکی شاخاویی خۆش و زۆر بەناوبانگ بوو، هەر کەسێ بهاتایە بۆ تاران و بۆی بکرایە بەبێ سەردانی ئاب عەلی نەدەگەڕایەوە شوێنی خۆی، ئەگەرچی دنیا سارد بوو، بەڵام بە زستان و بەفر هاتوچۆکەری زۆرتر بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی شاخ و گردەکانی کە سەخت بە بەفر دادەپۆشران، سەیرانکەر دەچوونە ئەوێ بۆ ڕابواردن و یاریی خلیسکێنەی لەسەر بەفر، هەروەها بە درێژایی ڕێگای تاران و ئاب عەلی جێی پشوودان و ئوتێلی خۆش خۆشی لێ بوو، کە هەندێ ئوتێلیان ئەوەندە پێشکەوتوو و لە ئوتێلە گرانەکان بوو، کە نەدەبوو عەبابەسەر یان چادربەسەر بچێتە ژوورەوە.

* * *

ئەوەندەی نەمابوو کە عەلی و ئەوان بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان بۆ ناو پێشمەرگە، کە بەیانییەک تەلەفۆنیان بۆ کرا کەوا ئێوارە ماڵی سەرکەوت ئاغا نیازیان هەیە بێن بۆ لایان. ژنەکان مقۆمقۆیان تێکەوت، پێش هەموویان ئامە خان دڵی خۆش بوو بەوەی کە خەریک بوو بێئومێد دەبوو لەوەی کە ماڵەکە دێن بۆ لایان، چونکە لەو ڕۆژەوە کە عەلی باسی بۆ کردبوون ئیتر دەنگیان نەمابوو، بۆیە بە ئارەزووەوە چاوەڕوانی هاتینای بوو، بەتایبەت کە باسی دەوڵەمەندی و لەخۆگۆڕانیان بۆ کردبوون، حەزیان دەکرد بە پەلە چاویان پێیان بکەوتایە بزانن خوا کاری چۆنی لە لایە!

بۆ پاشنیوەڕۆ حەپسە خان و خوشکی و کچەکان هەموویان بەپێی ئەو جل و وردە ئاڵتوون و گوێز و گوڵینگانەی پێیان دەرباز کرابوو، کەوتنە خۆڕازاندنەوە، هەندێکیان چەند جارێک دەچووە بەر ئاوێنە و سەیرێکی خۆی دەکرد و دەستێکی بە سنگ و بەرۆکی خۆیدا دەهێنا. حەپسە خان دایە قاقای پێکەنین و گوتی: "ئەیەڕۆ پەنا بە خوا، دەڵێی جلی جوانمان لەبەر نەکردووە و قەت خۆمان نەڕازاندووەتەوە، سەیرکە دەڵێی نەدیتکەین، ئەوە چەند جار هەر خۆم چوومە بەر ئاوێنەکە." ئامە خانی خوشکی پێکەنینەکەی شاردەوە و گوتی: "بڵێین چی، بە ناشکوری نایڵێم ئەم دەربەدەری و پەنابەرییە و کەوتنە شاران و کۆلانانی خەڵکییە، ناوی خۆیشمانی لەبیر بردووینەوە، چ جای جلوبەرگ و خۆڕازاندنەوە." سەبری لەو لایەوە هەڵی دایە و بە بێباکانە گوتی: "ئێوە چەند شت گەورە دەکەن، لە بەیانییەوە سەری خۆتان قل کردووە، ئەو دەڵێ سەربەستەکم ڕووی مەجلیسی نییە، ئەو دەڵێ کەواکەم تۆزی سەرقۆڵەکەی چووەتەوە، ئەمی ترتان دەڵێ ئەم کراسە لەگەڵ سوخمەکەم ڕێ ناکەوێ. وا خۆتان شڵەژاندووە دەڵێی ماڵی سەدری ئەعزەم دێن بۆ لاتان، کچێ دە گوێشی مەدەنێ، خۆ خەڵک بە جلەوە ناناسرێت، ئێمە ئەمە چەند ساڵە لە خەبات و شۆڕشداین و سەروماڵمان لەسەر داناوە پەشیمانیش نین، ئەگینا ئێمەش ئەگەر گوێمان نەدایەتێ و سەرمان حیز بکردایە و چاومان شۆڕ بکردایە، ئێستا هەی هوو هەی هوو، هەر بە ڕاست و چەپدا شەقمان لە دینار هەڵدەدا." ئینجا نەسرین بە گەرمییەوە گوتی: "ئەرێوەڵا ئێستا یەک دوو خانووی ترمان کڕیبوو و یەکی چەند پارچە ئاڵتوونێکی قورستریشمان کردبوو، بە سەری شۆڕ و بە نامەردی ئێمەش وەکو ئەوانە سواری قەمەرەی دڵفڕێن دەبووین و هەمیشە فڕکان فڕکانمان دەبوو لە بەینی سلێمانی و بەغدا و شارەکانی تردا و فەرش و قاڵی و شتی گرانی ترمان دەخستە سەر یەک." سەبری هاتە قسە و گوتی: "بەخوا بەخوا ئەو کراسە کۆنە بێکەڵکەی خۆم ناگۆڕمەوە بە هەموو سەروەت و سامان و قەسری ئەوانە. هەر کەسێ ویژدان و زەڕەیە مەردایەتیی هەبێ بۆ کەیف و ڕابواردن و دەستکەوتی تایبەتی خۆی، چۆن چاو لە میللەتپەروەریی خۆی دەپۆشێ و بە سەرشۆڕی بژی و ڕۆژگاری بەرێتە سەر و لە ئاخریشدا بە نامەردی بمرێ."

* * *

نزیک سەعات پێنجی ئێوارە لە زەنگی دەرگا درا، زانییان کە ئەمە میوانەکانیان هاتن، ئەوانیش کەوتنە خۆیان و هەر یەکەیان لە ژوورێک و کونێکەوە دەرپەڕین، لە چینی خوارەوە ئاغای ڕەزائی و تۆفە چوون دەرگایان کردەوە، ژنەکانیش یەک دوانێکیان گەیشتە تارمە و هەیوانکەی کە دەیڕوانی بەسەر حەوشەکە، پێش میوانەکان یەکێ

کردی بە حەوشەدا بە سەبەتە گوڵێکی یەکجار گەورە و جوانەوە، کاکە برا بە حاڵ و بە هنگە هنگ هەڵی گرتبوو، هەروەها یەکێکی تریشی بە دواوە هاتبوو بە دوو سێ بەستە و قوتووە شیرینی و نوقڵ و حەلاوەوە، کابراکان کۆڵ و بارەکانیان دانا و چوونە دەرێ، لەوە دەچوو کە ئۆتۆمبێلچی و ئیشکەریان بن، ئینجا میوانەکان کردیان بە ژووردا، حەپسە خان و عەلی و بێستوونیش گەیشتبوونە بەردەرکی حەوشەکە.
شەوکەت ئاغا هاتە ژوورەوە، دەستی کوڕێکی حەوت ساڵەی گرتبوو، جلێکی یەکجار گرانی ڕەشی لەبەردا بوو، پێڵاوەکانی وەک ئاوێنە بریقەیان دەهات، بۆینباخەکەی ڕەنگ بوو پارەی دەستێ جلی پیاوانەی پێ درابێ، لاجانگەکانیش کورت کورت تاشیبوو، تا پێی کرابوو مووی سپیی پێوە نەهێشتبوو.
دوای ئەویش دوو ژنەکەی لەگەڵ منداڵێکی تر کردیان بە ماڵدا، لە پێشدا ژنە گەورەکەی کە ناوی ئاسکۆڵ خان بوو هاتە پێشەوە و سەلامی کرد و چاکوچۆنییەکی گەرمی کرد، ئەگەرچی دنیا ئەو ڕۆژە ئەوەندە سارد نەبوو، کە ئەو قاپووتە کورکە زلە لەبەر بکا کە لە هەرە گرانەکان بوو، تا خوار ئەژنۆی هاتبوو و پرچی زەرد کردبوو، لەوەش دەچوو کە تۆزێک لەوەوپێش لە لای دەلاک و سەرورچ ڕێکخەر هاتبێتەوە. پرچی لەسەر شانی بەڕەڵا کردبوو، ڕوومەت و لێو و چەناگە و مل و چاو و برژانگ هەموو قەڵەم درابوون و ڕەنگ کرابوون.
ئاسکۆڵ خان بە پێکەنینێکی قورس و لەسەرخۆ لە حەپسە خان هاتە پێشەوە و بە دەستیکی پڕ لە ئەنگوستیلەی ئەڵماس و بریق و تریقەوە پەلاماری دەستی حەپسە خانی دا و دەستی گوشی و بە عەلمۆدانە و بە ناسکی ڕوومەتی نا بە ڕوومەتیەوە، گوایە ماچی دەکات، هەروەها دەستی کوڕەکانیشی گوشی.
لە دوای ئەو ئینجا قەدری خانی هەوێی هاتە پێشەوە، چونکە ئەو منداڵتر و گەنجتر بوو لە هەوێکەی و هەروەکو ئارەزووش خۆی وا پیشان بدات، کە ئەو گەنجە و ئەوەندە سەرمای نییە، بۆیە کراسێکی جەلسەی سووری تەسکی لەبەر کردبوو کە هەمووی بە لەشیەوە نووسابوو، سنگی هەمووی بە پوولەکەی سوور و پەمەیی و سپی نەقش کرابوو. ئەوەندەش ڕووت بوو، کە نیوەی هەردوو مەمکی بەدەرەوە بوو، گەردانەیەکی مرواری و یاقووتی زۆر جوانی لە ملدا بوو لەگەڵ گوارە و بازنەی عەینی بابەت و پارچە کوڕکێکی بچووکی گران، بەهاشی بەسەر شانەوە بوو، جنتا و پێڵاوی خۆی و ئاسکۆڵی هەوێی هەر باس نەدەکرا کە چەند جوان و تازەترین مۆدە بوون، میوانەکان بە بریقوباق و بۆن و عەتر و دەست و پێوەند و منداڵی ڕازاوە سەرکەوتنە سەرێ و چوونە ژووری

میوان و دەستیان کرد بە خۆشی و چۆنی و هەواڵپرسین لەگەڵ هەردوو حاجی و خەڵکی ماڵەکە.

حەوشەکە کەسی لێ نەما لە تۆفە زیاتر، چونکە هەر ئەو سەرنەکەوتە سەرێ لەگەڵیان، تۆفە سەری سوورما و شڵەژا و کەوتە گێژاوەوە، بە حەپەساوی دەستی دایە پاکەتە جگەرەکەی و جگەرەیەکی دەرهێنا و خستیە بەینی لێویەوە و سەرێکی بادا و دەستی برد بۆ گیرفانەکانی و بۆ شخارتە گەڕا و هەر دەستی بەم گیرفان و بەو گیرفانیدا دەگێڕا، دەتگوت کاس بووە. بە دەمی بە جگەرە گیراویەوە لەبەر خۆیەوە گوتی: "هەی لە عاسە و هەی لە قەدە و هەی لە عاسە و هەی لە قەدە!" چەند جارێک لەسەر یەک بە ژێر لێوەوە وای گوت و چەند منگەمنگێکی کرد، ئینجا جگەرەکەی داگیرساند، چووە نزیک پێپلیکەیەک و بەو سەرمایە خۆی بەردایە سەری و دانیشت، بەڵام هەر گورج هەستایەوە و بەدەم جگەرەکێشانەوە کەوتە پیاسە، دوایی لەپڕ جگەرەکەی فڕێ دایە سەر عەرز و پێیەکی پیا نا و دەستێکی هێنا بە سەروجامانەکەیدا و یەک دوو نەرمە کۆکەی بۆ کرد و بە گورجی سەرپلیکەکە کەوت و ڕووی کردە ژووری میوان، سەبری لە ژوورێ چاوی لێ بوو، بۆیە گورج هەستایە سەر پێ و ڕاپەڕییە دەرەوە بەرۆکی گرت و گوتی: "'تۆفە گیان وەرە ئیشێکم پێتە." سەبری ترسا لەوەت تۆفە بێتە ژوورێ قسە و توانج یان شتێکی خۆیانە بگرێتە میوانەکان، لەبەر ئەوە گورج پێشی خۆی دا و بردیە ژوورێکی تر بە بیانووی ئیشەوە. ئینجا بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە سەیرێکی کرد و گوتی: "کاکە تۆفە گیان ئامان قسەومسە نەکەی، عەیبە میوانن بۆ خاتری خوا ئاگات لە دەمی خۆت بێت، دوایی ئابڕوومان دەچێت." تۆفە دیسانەوە دەستی ڕاوەشاند و گوتی: "هەی لە عاسە و هەی لە قەدە." سەیرێکی سەبریی کرد و بە سەرسووڕمانێکەوە گوتی: "باوکم کوڕەکە گوتی ئەگەر بیانبینن نایانناسنەوە، گوتمان ئاخۆ بۆچی وادەڵێت." سەبری دەنگی نزم کردەوە و گوتی: "ئەیەڕۆ لە ڕێی خوا تۆفە گیان، هیچ قسە مەکە تاوەکو دەڕۆنەوە، بەخوا قسەیەکت لە دەم بێتە دەرەوە باوکم زۆری پێ ناخۆش دەبێت، خۆیشت دەزانی کە نەخۆشە و گوناحە با ناڕەحەت نەبێت، دوایی کە ڕۆیشتن حەز دەکەی بە کەیفی خۆمان گاڵتەیان پێ دەکەین. دەزانم سەرت سووڕماوە لێیان، بەخوا من لە تۆ خراپترم بەڵام هەرچییەک بن میوانن و دەبێ خەڵک لەبەر حورمەتی خۆی حورمەتی میوان بگرێت."

دوای ئەوەی سەبری دڵنیا بوو لەوەی تۆفە بێدەنگ دەبێت، ئینجا بەجێی هێشت و گەڕایەوە لای میوانەکان، تۆفەش چووە خوارەوە بۆ لای بەختیار و سمە و کاوە و کامەران، لەوێ دەستی کرد بە قسەکردن و سەرسووڕمانی خۆی دەربڕی و کەوتە تیر

و تـوانج گـرتنە میوانەکـان و باسـی ڕابـردووی بـۆ کوڕەکـان دەگێـڕایەوە، کوڕەکـانیش دەستیان دەدا بەیەکدا و دەکەوتن بە گازی پشتدا بە قسـەکانی، بەختیـاریش هـەر بەوەدا دەگەیشت کە بڵێت: "کاکە تۆفە گیان لەسەرخۆ، ئەوەتا ئۆتۆمبێلچی و ئیشکەرەکانیان لە ژووری ئاغای ڕەزائین، گوێیان لە دەنگمانە عەیبە."

* * *

میوانەکان تاوەکو درەنگ دانیشتن، بەڵام هەر چا و شیرینی و میوەیان خوارد، هەردوو حـاجی هـەر دوای بەینێـک بە بیـانووی نـوێژەوە هەسـتان و چـوونە ژوێکـی تـر، حـاجی مەجید دوو سێ جار ئەستەغفیرەڵای کرد و بە چرپە بە براکەی گوت: "ئەرێ برا ئەوە ئەو ئافرەتە بۆچی وای لە خۆی کردووە، خۆ کە دانەویەوە بۆ کوڕەکەی هەمـوو لەشـی بە دەرەوە بوو." براکەی بە چرپە گوتی: "بە زاتـی خـوا کە کردیـان بە ژووردا، بە هـیچ جۆرێک شەوکەتم نەناسییەوە، چ جای ژنەکانی کە ئەوەندەم نەبینیـون." هەردوو بـرا بە ورتە ورت بۆ خۆیان دەسـتیان کرد بە قسـە و وتـووێژ و سـەریان سـوورما لەوەی کە ئەم کابرا لات و لەوات و ساختەچی و بلۆفچییە چۆن لێرە وای لێ هاتووە.

* * *

ئـاخری میوانەکـان هەسـتانە سـەر پـێ کە بـڕۆنەوە، دوای ئەوەی قەدریە خـان چەنـد جارێک سەیری سەعاتە ئاڵتوونە چەند چەند هەزار تمەنییەکەی دەستی کرد و گوتی: "ئیتـر دەبـێ هەسـتین، ئێسـتا مناڵەکـان لە سـینەما گەڕاونەتەوە، ئەگەرچـی نەنکیـان و خەڵکمـان زۆرە لە مـاڵەوە، بەڵام ئـێمە لەوێ نەبـین دەیـکەن بە ڕۆژی خۆیـان." چەنـد جارێـک حەپسـە خـان و خوشـکی و ئەوانـی تـر گوتیـان: "جـارێ زووە، هەنـدێکی تـر دانیشن." بەڵام فایدەی نەبوو ئەوان هەر هەستان کە بڕۆن.

ئاسـکۆڵ خـان سـەری گەورە و دەمڕاسـتی مێـرد و هەوێـی بـوو، ڕووی کـردە حەپسـە خان و ئەوان گوتی: "لەبەر ئەوەی کاکە عەلی و کوڕەکان دووسبەی دەبێ بگەڕێنەوە، کەواتە هەر دەبێ سبەینێ لە خزمەتتاندا بین و دەبێ تەشرف بهێننە مـاڵی ئـێمە، ئێـوارە خۆمان ئۆتۆمبێل دەنێرین بەدواتانـدا و دەبـێ هەمووتـان بە خـاووخێزانەوە بێن." عەلـی جـوابی دایەوە و گـوتی: "وەڵا خـۆ زۆر حەز دەکەیـن، بەڵام هەر سـبەینێمان مـاوە لێـرە، دەبێ خۆمان کۆ بکەینەوە، با بۆ جارێکی تر بێت و ئەو ئەزیەتەی ناوێت." ئەم جارە قەدریە خـان ڕاپەری و دەسـتێکی دا بە سـنگە ڕووتەکەیـدا و چـاوی خومـار کـرد و بە نازەوە گوتی: "چۆن؟ بەخـوا ئەمە قەت نەکراوە و ناکرێت، بەوەنـدە سـوێند و بەوەنـدە قورئان هەر دەبێ بین بۆ سەعاتیکیش بێت." ئەمانیش ناچار گوتیـان باشـە دێـین و زۆر سوپاستان دەکەین.

هەندێ لە خەڵکی ماڵەکە تاوەکو بەردەرکی حەوشە بەڕێیان کردن و هەندێکی تریشیان وەکو ڕووناک و نەوبەهار و نەسرین هێشتا میوانەکان لە حەوشە بوون کە ئەوان کەوتنە لاساییکردنەوەیان و دایانە تریقەی پێکەنین پێیان، ئەو شەوە هەتاوەکو درەنگ خێڵی حەپسە خان و خوشکی بە کچ و کوڕەوە بە باسی ماڵی شەوکەت ئاغا بردیانە سەر.

ئامە خان دەیگوت: "سەدەق لە کاری خوا، ئەمە هەمووی قەیناکە، بەڵام ئێوە بڵێن ئەو دەستوپلەی ناسکۆڵ بە چی وا سپی و ناسک و جوان بووە، کە لە سلێمانی بوون دەستوپلی دەتگوت لفکەیە!" ئامە خان دەیدایە پرمەی پێکەنین و دەیگوت: "نینۆکەکانی یەکی بەقەد شاخی شەیتانێک درێژ بوو، وەی چەند دڵم تێکەڵ دێت لەو جۆرە نینۆکە درێژانە." حەپسە خان دەمولێوی خۆی دەهێنایەوە یەک و شارەزایانە وەرامی خوشکی دەدایەوە و دەیگوت: "ئەوە دیارە لە ماڵەوە دەست ناداتە هیچ ئیشێک و خواش دەزانێت چەند ئیشکەری هەیە، چونکە هیچ شتێک دەستوپلی ژنی بەسەزمان نافەوتێنێ جلشتن و حاجەتشتن نەبێت، بەتایبەتی ئەو کەسانەی ئاوی خۆڵەمێش تێکەڵی سابووناوەکە دەکەن." حەپسە خان دەم و لێوی بە لکی سەرپۆشەکەی داپۆشی و دایە پرمەی پێکەنین و گوتی: "وەڵا دەستوپل قەیناکە، دەڵێن دەست نادات بۆ هیچ و هیچ ئیشێک ناکات، بەڵام ئێوە پێم بڵێن، ئەو پرچەی بە چی وا پڕ و درێژ و جوان بووە، خۆ هەر شەوقی دەدایەوە." سەبری زۆر لێزانانە لچێکی هەڵقورتاند و گوتی: "ئەوە خوا دەزانێت چەند پارەی داوە بە سەررێکخەر و چەند لە ژێر دەستی دانیشتووە تاوەکو وای لێ کردووە بۆی. ئەوانە هەموو فێڵن، لەو شوێنانە بۆیان ڕێک دەخەن و بۆیان پڕ دەکەن و چەند جۆر دەرمانیان بۆ پێوە دەکەن تاوەکو وا دیار بێت، ئەگینا تۆ برۆ سەیریان کە لە حەمام دێنە دەرەوە، ئینجا دەزانی سەر و پرچ و حاڵ و ئەحواڵیان چۆنە، چاو و برۆشیان چەندەها شتی لێ دەدەن، چین لەسەر چین چەند خەریک دەبن ئەگینا خۆ لە ڕاستیدا وا نین، هەمووی قەڵەم و دەسکردە." سەبری سەرێکی با دا و گوتی: "بەلای منەوە، ئەم ماڵە و ئەو کابرایە دەبێت خەریکی شتێک بن، ئەم کارەیان لە کاسپی و توجارەت ناچێ، ئەمە چ کاسپی و ئیشێکە، بە ماوەی سێ ساڵ وا لە خەڵک دەکات. ئەم هەویرە زۆری ئاو دەوێت."

ئیتر دەستیان پێ کردەوە، هەر کەسەیان شتێکی دەگوت و شتێکی لێ دەگێڕانەوە. تۆفە بە گەرمی و شەوقەوە باسی خولە قەسابی بۆ دەکردن، کە چۆن ڕۆژێک دەستیان دابووە یەخەی یەک لەگەڵ شەوکەت ئاغا و کڵاو و جامانەی خستبووە قوڕەوە لەسەر پارەی قەرزی گۆشت، کە لەسەری کۆمەڵ بووبوو و نەیبوو بیداتەوە و هەر ئەمڕۆ بە

سەبەی و ئەم هەفتەیە بەو هەفتەی پێ کردبوو. نەورۆز بە زەردەخەنەوە سەیرێکی عەلیی کرد و گوتی: "وادیارە جەماعەت تاوەکو یەک دوو مانگی تر ئەم قسەوباسانە نابڕنەوە و هەر دەیڵێن و دەیڵێنەوە و هەر بیر دەکەنەوە کە ئەو ماڵە بە چی وایان لێ هاتووە، دە ڕاستییەکەیان پێ بڵێ با ئەوەندە لەسەری نەڕۆن." تۆفە ڕووی کردە عەلی و گوتی: "ئەها تو قەبری ئەو کاکە ئەحمەدی شێخە ئەگەر پێمان نەڵێیت!" عەلی پێکەنیی و گوتی: "ئاخر کاکە تۆفە گیان، دەبێ لێم نەگری کە بڵێم ئەگەر پێم گوتی، ئیتر دەیگری بە دەمتەوە و هەر باسیان دەکەیت لەملاولای کە وەختی خۆی وابوون و وانەبوون، ئیتر ئەوەیە خۆ خەڵک گا نییە لە پێستێکدا بمێنێتەوە، ئێمە هەقمان چییە هەر کەسەو ڕێگای خۆی دەگرێت." ئەم جارە حەپسەخان کێچ کەوتە کەوڵی و سەیرێکی کوڕەکەی کرد و گوتی: "توسەری ئەو باوک و مامەت، ئەگەر پێمان نەڵێیت، بەخوا تۆفەش هەقی نییە بەسەریانەوە، تەنها دەمانەوێت بزانین ئەمە ئەم لێشاو و سەڵتەنەتە چییە بەسەر ئەم ماڵەدا ڕژاوە!" عەلی دەستی هەڵبڕی و گوتی: "کوڕە باوکم پیاوەکە بووە بە پیاوی شا و ساواک و تەواو، دە ئیتر وازی لێ بێنن." مامی گوتی: "بۆچی پیاوی شا کەمە لێرە؟ ئەمە چۆن ئەمی دۆزییەوە؟" عەلی بە زەردەخەنەوە گوتی: "دیارە ئێوە واز لە خەڵک ناهێنن تاوەکو لە ئەلفوبێیەوە بۆتان نەگێڕێتەوە."

بۆیە عەلی دەستی کرد بە گێڕانەوەی باسیان. وەکو لە ئاشنایەکی زۆر جێی باوەڕی بیستبوو، کەوا واختی خۆی و دوای ڕووخانی ڕژێمی مەلیکی عێراق، شای ئێران زۆر سڵەمیبووەوە و ترسابوو لەوەی لای ئەوانیش خەڵک ئەم چاولێکەرییە بکەن، لەبەر ئەوە هەر کەسە لە دیوی عێراقەوە ڕای کردایە ئەمدیو و ناڕەزایی خۆی دەربڕیایە و پیشانی بدایە بەرانبەر بە ڕژێمی تازە و شۆڕشی تەمووزە، ساواک هەر زوو دەیگرتنە خۆی، ئینجا ئەمیش کە وەختێ مەسەلەکەی کابرای لێقەوماو بوو و لەگەڵ برا و ماڵ و خێزانیان ڕایان کردبووە دیوی ئێران و گوتبووی کەوا لەدەست ڕژێم ڕای کردووە چونکە لەم ڕژێمی تازەیە ناڕەزایە، چونکە ناوبانگیشیان هەبوو، کە وەختێ ئاغا و ماغا بوون ئیتر ئەمان وایان زاییوو کە هەنگیان لە داردا دۆزیوەتەوە.

سەبری سەری ڕاوەشاند و گوتی: "دەمگوت ئەمە ئیشی کاسبی و ماسبی نییە، ئەمە پێچوپەنایەکی گەورەی هەیە." بێستوون پێکەنیی و گوتی: "کاسبیی چی؟ کاسبی وا هەیە ساڵ دوانزە مانگە ئارەق دەڕێژیت، لەگەڵ ئەوەشدا بە حاڵ دەتوانێ خۆی و ماڵ و منالی بە کولەمەرگی بژین، هیی واش هەیە هەرچییەکی بووە دەیکات بە سەرمایە و قەرزی دنیاشی بۆدەکات و دەست دەکات بە کاسبی، کەچی لەپڕ دەبینێ ئەوەندە زەرەر دەکا کە سەر و ماڵیشی تیا دەچێ."

ڕۆژی دوایی عەلی و کوڕەکانی و کوڕەکانی تر کەوتبوونە خۆیان، لە لایەک جانتا و کەلوپەلیان کۆ دەکردەوە، چونکە سبەینێ بەیانی زوو دەبوو بگوڕێنەوە، لە لایەکی تریشەوە خەریکی مشتومڕ بوون لەگەڵ خەڵکیماڵەکە، چونکە زۆریان دەیانگوت کە ئێوارە نایانەوێ بچن بۆ سەر دەعوەتی ماڵی شەوکەت ئاغا. هەردوو حاجی هەر زوو گوتیان: "کاکە گیان ئێمەی تێمەخەن، ئەوێ جێی ئێمە نییە، دەستمان بە دامێنتان." بەڵام حاجی مەجید بە زەردەخەنەیکی زۆر ئاغرانە و لەسەرخۆوە گوتی: "تازە ئێوە بەڵێنتان داوە هەندێکتان هەر دەبێ بڕۆن." بێستوون گوتی: "بەخوا من هەر ناچم، تاقەتی فیشاڵ و نمایشگەریی ئەوانم نییە." لە دڵی خۆیشیدا دەیگوت: "سبەینێ دەگەڕێمەوە شوێنی خۆمان، هەمووی چەند سەعاتێکم ماوە، بۆچی لەگەڵ ڕووناک گیانی خۆم دانەنیشم و تێر دەست بکەمە ملی و ئەو چەند سەعاتە لەکیسی خۆم بدەم بە گوێگرتن لە قسەی قۆڕی ئەو کابرا خۆفرۆشە و ژنە بووکە سەماکەرەکانی."

دیار بوو بێستوون و ڕووناک هەر زوو بڕیاری خۆیان دابوو کە نەچن بۆ ئەو دەعوەتە، هەریەکەیان بە بیانوویەک و ئەو چەند سەعاتەی مابوویان لەکیسی خۆیانی نەدەن و هەردووکیان خواخوایان بوو کە ڕۆژگارەکان لەبڕانەوە نەیەن و شەوگاریش یەکی بەقەد ساڵێک درێژ بن بۆ ئەوەی هەمیشە دەستلەملان و پێکەوە بن، ئەوەندەیان یەکتر خۆش دەویست.

سەبرییش پێش هەموویان گوتبووی کە ناچێت، ئاخری هاتە سەر حەپسە خان و ئامە خانی خوشکی و نەوبەهار و نەسرین و عەلی و نەورۆز، هەروەها سمەی پوورزاشیان کە بۆ دەعوەتی نانخواردن هەمیشە لەسەرپێ بوو و سەری پێوە نەبوو.

تۆفە پێشی ڕۆیشتن پەشیمان بووەوە کە بچێت لەگەڵیان و بە شپرزەییەکەوە گوتی: "ئەرێوەڵا بەس نەبوو بیرم کەوتەوە، دەبێ ئەم ئێوارەیە لەگەڵ کاک عەبدوڵڵا بچین ناوی خۆمان بنووسین لە مەکتەب."

هەموو بە جارێک دایانە قاقای پێکەنین و بە سەرسووڕمانێکەوە گوتیان: "مەکتەب؟ مەکتەبی چی؟" تۆفە نەرمەکۆکەیەکی بۆ کرد و گوتی: "بەڵێ مەکتەب، نابێ پیاو بچێ بۆ مەکتەب؟"

ژن و پیاوەکان کردیان بە هەرا و گاڵتە و خۆشی، سەبری لە ناویاندا هەڵی دایە و بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی:

- ئینجا بۆچی لە مەکتەب باشتر هەیە؟ بەڵام چۆن و لە کوێ و مەکتەبی چی؟
- ڕوخساری کچی سەید محەمەد لە مەکتەب پێیان گوتووە کە هەر تەلەبەیەک دەبێ زەلامێکی نەخوێندەوار لە خزم و ئاشنای بێنێت بۆ مەکتەب، تاوەکو

فێری خوێندەواری بکرێ، تەنانەت ئەگەر لە کۆلانەوە خەڵکی هێناوە، ئەگینا ئەو تەلەبەیە سزا دەدرێت، ئینجا وا من و کاک عەبدوڵلا دەبات کە ناومان بنووسن.

جەماعەت هەر یەکەیان بەلای خۆیەوە قسەیەکی کرد، ئەو گوتی: "بەخوا ئەمە شتێکی زۆر باشە." ئەوی تر گوتی: "ئەشهەدوبیلا ئەمە بڕیارێکی چاکە، هەی ئافەرین بۆ ئەو کەسەی وای گوتووە." ئەمیان گوتی: "ئینجا ئەوە چۆن بە تۆ دەکرێت، فارسی نازانی تاوەکو فێری خوێندن و نووسین ببی." ئامە خان لە ژێر لێوەوە گوتی: "ئای قوڕ بەسەر باوکمان، بە نەخوێندەواری قسەزان و ڕێبەر و گەورەی گەڕەکی، ئینجا وەرە فێری خوێندنیش ببی، وەڵا هەر ئەوەمان کەم بوو." حەپسە خان بە دزییەوە دەکولا لەبەر پێکەنین و نەیدەوێرا لەبەر تۆفە هیچ بڵێت.

جەماعەت ساز بوون کە بڕۆن بۆ ماڵەکە، تۆفەش خەریکی سەروسەکوت و جامانەبەستن بوو، ئەویش کەوتە ڕێ بەرەو لای عەبدوڵلای ئاشنای.

عەلی و دایکی و ئەوان گەیشتنە بەردەرکی ماڵی شەوکەت ئاغا، لە دوای ئەوەی بەینێکی باش لە ناو ئۆتۆمبێلدا بوون، چونکە ماڵی ئەمان لەمسەری تاران بوو و ماڵی ئەوان لەوسەر، ئەوەندە دوور بوون لە یەک کە ئامە خان شپرزە بووبوو لەوەی دڵی تیک بچێت و هەر بە بێدەنگی گیرفانەکانی دەگەڕا بۆ پەڕۆ و پیتاڵ، باش بوو ئاخری پێش ئەوەی بیقەومێنێ گەیشتنە جێ، بەڵام هێشتا دانەبەزیبوون خەمی گەڕانەوەیان لێ هات، دەرگاوان دەرکی خستە سەر پشت بۆ هەردوو ئۆتۆمبێلەکان، ئەوانیش شوێنی یەک کەوتن و چوون لە بەردەم تارمەهەیوانێکی گەورە و بەرین و خۆشدا کە دەیڕوانییە سەر باخێکی گەورەی خۆشی پڕ درەختی گەورە گەورە.

وا دیار بوو کە خاوەن ماڵ لە پەنجەرەوە چاوی لێیان بوو، چونکە گورج دەرپەڕینە دەر و کەوتنە بەخێرهاتن و فەرموو فەرموو. لە دوای دابەشکردنی سڵاو و چاکوچۆنی و زەردەخەنە بۆ یەکتر کردن، میوان کردیان بە ماڵدا.

ماڵ چی، جەماعەت سەریان سووڕما لەگەڵ ئەوەشدا کە ویستیان خۆیان وا پیشان بدەن کە سەد ماڵی وا ببینن هەر ئاوڕیشی لێ نادەنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەدەم چوونەژوور و وەڵامدانەوەی بەخێرهاتنەوە بە حەپەساوی لە ژێرەوە چاویان دەگێڕا و سەیری ناو ماڵەکەیان دەکرد.

هەر لە دەرکی دەرەوە تاوەکو دالان و هۆڵ و ژووری دانیشتن، هەمووی فەرشی کاشانی نایابی تیا ڕاخرابوو، هەر لالە و چلچرایەک بەسەر سەریاندا هاتبووە خوارێ ملی خەڵکی خوار دەکردەوە، قەنەفە و مۆبل و کورسی، پەردەی ژوور ئەوە هەر باس

نەدەکرا، ئیشکەر و خزمەتکار هاتوچۆیان دەکرد، ئەم شەربەتی دەهێنا و ئەو مێزی چەرخداری ویسکی و بەفر و خواردنەوەی ڕادەکێشا، ئەوەندەی پێنەچوو دوای حەسانەوە، شەوکەت ئاغا بە پێکەنینێکی دەستکرد و نمایشگەرییەوە ڕووی کردە عەلی و نەورۆز و ژنەکان و گوتی: "چی دەفەرموون؟ هەموو شتێک لە سایەی خوا و سەری ئێوەوە هەیە." ڕووی کردە عەلی و گوتی: "ئارەقی مەستەکیش هەیە ئەگەر بیری وڵات دەکەیت." ئامە خان هەندێ جووڵایەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەیەڕۆ ئیشەڵا دەست دەکەن بە عارەقخواردنەوەش لە بەرچاوی ئێمە!" حەپسە خان چاوی بڕییە عەلیی کوڕی کە بزانێت ئەو چی دەڵێت. کابرای خاوەن ماڵیش هەر نەوعی ویسکی و خواردنەوەکانی بۆ عەلی و نەورۆز و کوڕەکانی تر دەژمارد، کە زۆری ئەو ناوانەیان هەر نەبیستبوو. عەلی هاتە جواب و بە زەدەخەنەیەکی خۆشەوە دەستی هەڵبڕی و گوتی: "زۆر سوپاس، بەخوا نیازی هیچ نەوعە خواردنەویەکمان نییە، چونکە بەیانی زوو دەبێ هەستین و بکەوینە ڕێ." شەوکەت ئاغا خۆی گورج کردەوە و گوتی: "یەعنی چی؟ من چۆن ئەمە قبووڵ دەکەم، ئینجا شەرتە بەیانی زوو بڕۆن؟ با نیوەڕۆ بێت." عەلی وەرامی دایەوە گوتی: "چۆن، خۆ بەدەست ئێمە نییە. هەر ئەوەندە ئینجازە دراوین، بەیانی زوو جێیەکە دێت بەدواماندا." شەوکەت ئاگا یەک قاقای بەرزی لێ دا، کە ئامە خانی ڕاچڵەکاند، گوتی: "ئەوە لەسەر من، هەر ئێستا تەلەفۆن بۆ تیمسار جەعفەری دەکەم کە لێپرسراوی ئێوەیە و لە براشم زیاترە، حەز دەکەن سەفەرەکەتان بخرێتە دووسبەی." کابرا ڕانەوەستا گوێ لە وەرامی عەلی و ئەوان بگرێ، ڕووی کردە دەرکی ژوورەکە و بە دەنگی بەرز بانگی کرد و گوتی: "ئاغای مەشهەدی، ئاغای مەشهەدی!" بە فارسییەکی تێکشکاو، دەتگوت بە کوردی قسە دەکات.

ئاغای مەشهەدی کردی بە ژووردا و لە بەردەگاکە ڕەق ڕاوەستا و سەلامێکی لە میوانەکان کرد و ڕووی کردە شەوکەت ئاغا و بە فارسی گوتی: "بەڵێ قوربان، ئەمر بفەرموون." ئاغاش کە زەردەخەنە لەسەر لێوانی نەدەبڕا، وەک فەرماندەرکردن گوتی: "ئا ئەو تەلەفۆنە بێنە!" عەلی ڕاپەڕی و گوتی: "نا نا، حەز ناکەم، نابێ بە سەری تۆ ئیشمان زۆر هەیە و دەبێ بە پەلە بڕۆینەوە سبەینێ و لە وەختی خۆماندا."

بەینیک بوو بە مشتومڕیان، ئەو دەیگوت بڕۆ تەلەفۆن بێنە و ئەم شڵەژابوو دەیگوت نا تکات لێ دەکەم تەلەفۆن بۆ کەس مەکە، ئاخری عەلی نەیهێشت و لە دوای ئەوەی خاوەن ماڵ زانیی خەریکە زۆر نارەحەت دەبێت، ئیتر ئەویش وازی هێنا لە تەلەفۆن و تەلەفۆنکاری، بەتایبەتی کە عەلی و نەورۆز و ئەوان بەڵێنیان دا کە ئامادەن هەموو شتێک بخۆنەوە تەنها ئەو واز بێنێت.

قەدری خان لینگی خستبووە سەر لینگ، زوو زوو دەستێکیشی دەبرد بۆ پرچە زەردە کراوەکەی و زەردەخەنەی دابەش دەکرد و کە عەلی و مێردەکەی لە مشتومڕەکەیان بوونەوە تەکانی دا بە خۆی و هەستایە سەر پێ و گوتی: "کەواتە بیسمیلا بۆ بۆتانی تێبکەم." مێردەکەی ئافەرینێکی کرد و گوتی: "ئەرێوەڵا ئەگەر زەحمەت نەبێ بەو دەستە جوانانەت بۆمان تێکەیت، چ لەوە خۆشتر هەیە."
حەپسە خان دەستێکی برد بۆ سەر و سەرپۆشەکەی خۆی و سەیرێکی خوشکی کرد و گوتی کە هەی هاوار، خۆ خەریکن دەست پێ دەکەن و ساقییش قەدری خانە. قەدری خان بۆ پیاوەکانی تێکرد و ڕووی کردە ژنەکان و گوتی: "ئێوە چی دەفەرموون؟" حەپسە خان وەرامی دایەوە گوتی: "زۆر سوپاس، خۆ ئێستا ئێمە شەربەتمان خواردەوە." قەدری خان بایەکی پیا دا و بە ناسکی پێکەنیی و گوتی: "چۆن هیچ ناخۆنەوە؟" ڕووی کردە نەوبەهار و نەسرین و گوتی: "ئەوا حەپسەخان و ئامە خان قەیناکە، وەکو خەسووم نوێژکەر و سۆفین، ئەی ئێوە؟" ئامە خان چاوی چووە پشتە سەری و چاوی زەق بوو و بە حەپەساوی سەیری نەوبەهار و نەسرینی کرد بزانێ دەڵێن چی، نەوبەهار گوتی: "ئەیەڕۆ دایکم ئێمەش نوێژکەر و سۆفیین، بۆ تۆ باسی چی دەکەیت کە بخۆینەوە؟" ئەم جارە ئاسکۆڵ خان بە زەردەخەنەوە ڕووی کردە نەسرین و نەوبەهار و گوتی: "کچێ لە کوێ ئێستا زەمانی ئەوە ماوە، دنیا پێشکەوتووە، ئێوە جاحێڵن قومێک شتێک بخۆنەوە." حەپسە خان شڵەژا و خەریک بوو قسە بکات، بەڵام نەوبەهار و نەسرین ماوەیان نەدا و بە جووتە جەوابی قەدری خان و ئاسکۆڵ خانیان دایەوە. نەسرین پێش کەوت و گوتی: "وەڵا دنیا هەزار ئەوەندە پێشکەوتووبێت، ئێمە لەو ڕووەوە لادێیی و خەڵکی دەروبەرین." نەوبەهار گوتی: "ئێمە کوردین و ڕەوشت و خووی تایبەتی خۆمان هەیە." دەستی درێژ کرد بۆ مێزەکە و بە پێکەنینێکی بێدەنگەوە گوتی: "ئەیەڕۆ ئەم شتانە بخۆینەوە؟" قەدری خان قاقایەکی بەرزی ناسکی لێ دا و شانێکی هەڵتەکاند و گوتی: "ئینجا خۆ ئێمەش کوردین، بۆچی کورد تا دنیا دنیایە هەر دەبێ وا دواکەوتووبێت!" نەسرین، کە سەرتاپای حەیا و حورمەتی لێ دەباری، بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی: "ئەگەر خواردنەوەی ئارەق و ویسکی نیشانەی پێشکەوتن و دواکەوتن بێت کەواتە ئێمە بە دواکەوتوو دانێن." حەپسە خان لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئۆە ڕۆڵە، یاخوا بەقوربانی ناودەمت بم." ئامە خان خەریک بوو چاوی پڕ بێت لە فرمێسک لە خۆشیی قسەکانی نەسرین و نەوبەهار. قەدری خان وا دیار بوو کە تاقەتی چوو لەم قسەوباس و مەحکەمەیە، بۆیە دەستی دایە پەرداخیک و ڕووی تێکردن و گوتی: "وەڵا خوشکم ئێوە کەیفی خۆتانە، بەڵام ئێمە شتێکی بچووک هەر

دەخۆینەوە." ئامە خان بە پەلە هەڵی دایە و گوتی: "ئێوە یارەبی نۆشی گیانتان بێت." بە ڕوویەکی خۆشەوە قسەکەی تەواو کرد و گوتی: "بەڵام بەقوربان ئەوە بە کچەکانی ئێمە مەڵێ." ئاسکۆڵ خان بە پێکەنینەوە گوتی: "وەڵا ئێمەش ناچاری فێری کردین، چونکە لێرە عەیبە کە بچیتە دانیشتن و دەعوەتی پیاوی گەورە و ماقووڵ و نەخۆیتەوە." قەدری خان خەریکی پێکتێکردن بوو بۆ خۆی و هەوێی، ئاوڕی لێ دانەوە و گوتی: "بەتایبەتی دەعوەتەکان ئالا حەزرەت." ئامە خان هەر ئەوەندەی نەمابوو ببووریتەوە کە دی ئاسکۆڵ خان پێکەکەی خۆی لە دەست قەدری وەرگرت و چەند جارێک سوپاسیشی کرد.

حەپسە و خوشکی ئەو دانیشتنەیان زۆر پێ ناخۆش بوو و هەر سەیری یەکتریان دەکرد و لە ژێرەوە دەستی خۆیان هەڵدەگلۆفی، لەپڕ ئامە خان وەک دەرکی بەهەشتی بۆ بکرێتەوە بیری کەوتەوە کە ئەو جارە لە ماڵی خۆیان قەدری باسی خەسووی کرد و هەروەها ئێستاش گوتی: "دەبێ وەکو خەسووم سۆفی بن." کەواتە خەجیج خان دەبێ لێرە بێت! ئامە خان لە دڵی خۆیدا دووعایەکی کرد و ڕووی کردە هەردوو ژنە خاوەن ماڵەکە و گوتی: "ئەرێ بەڕاست خەجیج خان چۆنە! ئەوە لە کوێیە بۆ دیار نییە!" قەردی قومێکی لە پێکەکەی دا و لچی سووراوکراوی لە یەک هەڵسوو و گوتی: "خەسووم دەفەرمووی؟ وەڵا شکور چاکە و ئەوەتا لە ژووری خۆیەتی، کە پێمان گوت ئێوەش تەشریف دەهێنن، زۆر دڵی خۆش بوو و دەستی کرد بە گریان، بەڵام ئەو ئەوەندە نایەتە دەرێ، حەز دەکات هەر لە ژووری خۆی بێت."

حەپسە خان وەک لە خوای ویستبێ، ڕاپەڕی و گوتی: "وەی گیان! ئەوە خەجە خان شکور لێرەیە، ئۆخەی ئەوە لە کوێیە با ئێمە بچین بۆ لای." بێ ئەوەی کەسیان قسە بکەن، هەستایە سەر پێ و خوشکیشی گورج لەگەڵی و گوتی: "توخوا لە کوێیە با بچین بۆ لای؟"

ئاسکۆڵ خان هەستایە سەر پێ و گوتی: "ئەگەر حەز دەکەن بچن بۆ لای، فەرموون."

هەردوو خوشک شوێنی کەوتن، هۆڵ و دالانێکی بڕی و چوونە بەردەرکی ژوورێک، ئاسکۆڵ خان پاڵێکی پێوە نا و گوتی: "فەرموون ئەمەتا."

بێ ئەوەی هیچ قسەیەک لەگەڵ خەسووەکەی بکات، ئەوانی لەوێ بەجێ هێشت و خۆی لێی دا و گەڕایەوە لای میوانەکانی تر. خەجیج خان بە جلی کوردییەوە بوو، دەتگوت هەر ئێستا لە گەڕەکی سابوونکەرانی سلێمانییەوە هاتووە، لە سەروو ژوورەکە لەسەر دۆشەکێک بە کزی دانیشتبوو و تەسبیحەکەی گرتبوو بە دەستیەوە و خەریکی لا

ئیلاهە ئیلەللا بوو، ژوورەکەش خنجیلە و پاک و جوان بوو و فەرش و قالّی جوانیشی تیا ڕاخرابوو.
خەجە خان هەر چاوی بە میوانەکانی کەوت بە گوڕ هەستایە سەر پێ و باوەشی بۆ کردنەوە و بەدەم فرمێسکەوە پەلاماری دان و دەستی کردە ملیان و ئەمی گرت و ئەوی بەردا و بە کوڵ گریا و حاڵەتێکی سەیری بەسەر هات.
حەپسە خان و خوشکی ترسان لەوەی نەوەکو شتێکی لێ بێت یان ببوورێتەوە، بۆیە بە هەردووکیان قۆڵیان گرت و بردیان دایاننیشاندەوە و چوون لە تەنیشتیەوە دانیشتن. هەرسێکیان دەستیان کرد بە گریان و وا بە کوڵ و دڵ هەنسکیان هەڵدەدا و بە ڕان و سنگی خۆیاندا دەکێشا و لەجیاتیی قسە بە لاواندنەوە باسی غەریبی و حاڵی خۆیان دەکرد بۆ یەکتر، یەکێک گوێی لێیان بوایە هەر ڕۆحی دەچوو، وای دەزانی کە لە گردی سەیوان دانیشتوون.
دوای بەینێک شیوەن و گریان هەندێ هێمن بوونەوە. ئینجا خەجیج خان بە پەرۆشییەوە ڕووی تێکردن و وەک پاڕانەوە گوتی: "وەی بەقوربانتان بم، یاخوا بەخێر بێن و سەر هەردوو چاوم، دنیام لێ ڕوون بووەوە، وادەزانم هەموو کەسەکانم چاو پێ کەوتووە."
خەجە خان وەک ئەوەی بیری کەوتبێتەوە کە ئەوە بۆ ئەو فەقیرانەی هەر لە ڕێوە بە لاوانەوە و شین و شەپۆڕ داگرت و نەیهێشت هەناسەیەک بکێشن و قسەیەک بکەن دڵی وا پڕ بوو، لە گوزەران و ژیانی ئەم چەند ساڵەی شوێن ئەم کوڕەی کەوتبوو کە وەختی خۆی دڵی نەهاتبوو لە شار و ماڵ و لای کچ و کەسوکاری بمێنێت لەتاو ئەم کوڕەی کە لە هەموویان زیاتر دڵی دابوویێ هۆگری بووبوو، لەبەر ئەوەی وەختێ مێردەکەی مردبوو ئەم کوڕە هێشتا ساوا بوو و بە هەتیوی بەخێوی کردبوو، نەیدەزانی ئەو کوڕەی کە ئەو هەموو کەسێکی لەبەر ئەو بەجێ هێشتبوو، لە ئاخریدا تووشی ئەم ڕیسواییە دەبێت و خۆی دەفرۆشێت و دەبێت بە پیاوی ساواک.
خەجە خان هەروەک دەرکی بەهەشتی لێ کرابێتەوە، کە چاوی بە هاوشار و ناسیاوی کۆنی خۆی کەوت و هەموو برینەکانی بە جارێک کولانەوە، ئەوە بوو وا پەلاماری دان کە دەتگوت لە ناو دەریایەکی بێ بن  و سنووردا نقوم بووبوو، ئێستا چاوی بە بنکەدارێکی زۆر گەورەی پڕ لقوپۆپ کەوتەوە وا خۆی بۆ هەڵدان و خۆی پیا هەڵواسین و بەو چاو تروکاندنەش خەریکە داخ و خەمی ئەم چەند ساڵەیان بۆ هەڵڕێژێت، لەبەر ئەوە خەجە خان هاتەوە سەرخۆ و دەستی کردەوە ملیان و چەند جارێک ئەملا و ئەولایانی ماچ کردەوە و لەگەڵ هەر ماچێک دەیگوت: "ئۆخەی یاخوا

بەقوربانتان بم، هەر خەریکم شێت دەبم و ئەوەندەی بیری شار دەکەم." مەبەستی لە سلێمانی بوو.
خەجە خان چنگی برد بۆ دەموچاوی خۆی و چەند چەمۆڵەیەکی لە خۆی نا و هەناسەیەکی بەکوڵی هەڵکێشا و گوتی: "ئۆە نەمامایە، ئۆە لە ڕێگا ملم بشکایە و نەگەیشتمایەتە ئەم ڕۆژە، خۆزگەم بەو وەختەی کراس و کەوام بە قەرز دەکرد و مانگێ دە پەنجاییم دەدا بە کوتاڵفرۆشەکە، وەی ئەوسا چەند خۆش بوو، ئێستا وام لەم خانووە گەورە پڕ فەرش و قاڵییەدا وادەزانم دیل و حەپسم و هەر ڕۆژێکم بە مردنێکە، نە خزمێک، نە کەسێک نە ناسیاوێک دێتە لام." ئیتر خەجە خان وا کرایەوە و حەزی کرد کە هەرچی زووتر هەرچەند پێی بکرێت داخ و ناڕەحەتیی دڵ و دەروونی خۆیانی بۆ هەڵڕێژێت. هەرچەندە حەپسە خان و خوشکیشی دڵیان پڕ بوو، ئەوانیش حەزیان دەکرد کە هەندێ باسی ئەم دەربەدەری و لێقەوماوییەی خۆیان و ئەو ڕێگاوبانە سەختە و ژیانی لادێ و ئەو ئەشکەوت و کونە تەیارانەی بۆ بکەن، بەڵام فایدەی نەبوو، خەجیج خان بە هیچ جۆرێ ماوەی نەدەدان و دەتگوت بەڕووی لە دەمدا هەڵتۆقیوە، وەک دەستڕێژ و بێ هەناسەدان باسی خۆی بۆ دەکردن، ئەوەندەی داخ لە دڵدا بوو. بەبێ هیچ بیرکردنەوە و لێکدانەوەیەک هەرچی دەهات بە دەمیدا بۆی باس دەکردن و ناڕەزایی و ناڕەحەتیی خۆی بۆ دەردەبڕین، کە هەندێ قسە و نهێنیی ناوماڵ هەبوو هەرچەندە خەڵک ناڕەحەت و تووڕە بن ئەو نەوعە نهێنییانە لە دڵی خۆیاندا دەهێڵنەوە. چونکە ئەو کەسەی باسە نهێنییەکانی ناوماڵی خۆی بەو چەشنە بگێڕێتەوە، بێگومان خۆیشی پێ دەشکێت، وەکو مەسەلەکە وایە کە دەڵێت تف هەڵدەیت ڕووی خۆت دەگرێتەوە. بەڵام خەجە خان گوێی نەدابووە هیچ ڕیسوایی و شکاندنێک، کەوتبووە هەمان خاڵیکردن و کە باسی بووکەکانیش دەهاتە پێشەوە، بە ڕووسیاکانی ناو دەبردن.
حەپسە خان و خوشکی سەریان سووڕمابوو، وەکو لە بانێکیان بەربدەیتە خوارەوە وابوو لە لایان و بەزەییان بەو پیرەژنە فەقیرەدا دەهاتەوە کە لە لایان وابوو ئێستا ئەویش لە کەیفایە و بۆ خۆی لرفی لێ دەدات لە خۆشی ئەو قەسر و ماڵ و گوزەرانە پڕ لە هەڵا و های و هوە و جێ بە خۆی ناگرێت لە خۆشییاندا، وایان بیر دەکردەوە کە ڕەنگە شار و خەڵکی شار و باپیری شاریشی لەبیر نەمابێ، کە بەسەر چیدا هاتن و چییان دیت و بیست!
تەقەی دەرگا لە خەیاڵی دان و هێنانیە سەرخۆ، بەتایبەتی کە سەری قەدری خان دەرکەوت لە سووچی دەرگاکەوە. ڕاوەستابوو دەستێکی گرتبوو بە کەلەکەیەوە و

دەستەکەی تریشی گرتبوو بە دەرگاکەوە و گوتی: "ئۆخەی شکور تێرتان خوارد لە قسەی قەدیمی، دە ئیتر فەرموو بۆ نانخواردن." حەپسە خان هەڵی دایە و گوتی: "ساحێبفەرموو بیت، بەڵام بەخوا نە خۆم نە خوشکم ئێواران نان ناخۆین، دوور لە ئێوە مەعیدەمان باش نییە، ئەگەر بە شەو شت بخۆین دەبێ تاوەکو بەیانی لەسەر تەوقی سەر بخولێینەوە." قەدری خان بە زەردەخەنەی سەر لێوانەوە گوتی: "دە بڵێن رووومان نایەت بێین لە بەرچاوی پیاوەکان نان بخۆین."

خەجە خانی خەسووی دەستی کرد بە تەسبیحات و بە دەنگێکی هەندێ بەرز گوتی: لا ئیلاهە ئیلەڵا، یارەبی تۆبە ئەستەغفیرەڵا، ئەستەغفیرەڵا." ئامە خانیش راپەڕی هەروەک غیرەت گرتی و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم هەموو بیانووگرتن و شەرمە چییە کە ئێمە لەم ژنە لەخۆگۆڕاو و قرنییەی دەکەین، ئەوە بۆ ناڵێین ئەرێوەڵا حەز ناکەین و پێمان خۆش نییە لەگەڵ ئارەقخواردنەوەی ئێوە دانیشین و سەیرتان بکەین. ئەگەرچی کوڕەکانیشمان دەخۆنەوە جاروبار، بەڵام ئەوانیش کات و شوینی خۆیان هەیە و دەزانن پێمان ناخۆشە، قەت لە بەرچاوی ئێمە ناخۆنەوە و سەغڵەتمان ناکەن، لەبەر ئەوە ئامە خان گوڕی دایە خۆی و گوتی: "وەڵا خۆ ئەمە چەند ساڵە ئێمە هەر لە ناو پێشمەرگەدا ژیاوین و هەمیشە شانمان بە شانی ئەوانەوە بووە، بەڵام راستییەکەی حەز لەو چەشنە دانیشتنە ناکەین، کە خواردنەوە و شتی وای تیا بێت." حەپسە خان بۆ ئەوەی قسەکانی خوشکی پینە بکات، پێکەنیی و گوتی: "دایکم ئێمە نوێژکەر و قەدیمین، گوێ مەدەنە ئێمە، خۆتان چۆن حەز دەکەن وا بکەن." قەدری خان سەری راوەشاند و بە پێکەنینەوە گوتی: "باشە چیتر سەغڵەتتان ناکەم، پێیان دەڵێم سینیتان بۆ بێننە ئێرە لەگەڵ خەجیج خان بۆ خۆتان پێکەوە بخۆن." لێی دا و چووە دەرەوە.

خەسووی لە دڵی خۆیدا گوتی: "خوا لە دەستت بەزیاد نەکات و خەجاڵەتی لای خوا بی."

* * *

بەیانی شەوەکەی حاجی مەجید حەپسە خانی خەبەر کردەوە کە هەستێت و عەلی و کوڕەکانی هەڵسێنی، چونکە دەبێ بڕۆن، حەپسە خان راپەڕیی و بە پەلە خۆی کۆ کردەوە و بەسەر ژوورەکانەوە گەڕا و یەکە یەکە لە دەرگاوە بانگی کردن.

هەموو هەستان و بوو بە دەنگ و گرمەی دەرکی حەمام و شوێنی دەست و دەموچاو شتن، تەپەتەپی پێی ئەهلی ماڵەکە و ئەوانەی خواریشەوە هەستان، لەو ماوەیەدا جێبیش گەیشتە بەردەرگا.

عەلی، نەورۆز، بێستوون، بە پەلە نان و چاکەیان خواردەوە و کەوتنە دەست لە ملان و دووعاخوازی لە دایکوباوک و کەسوکاریان.

حەپسە خان بە دەستی فرمێسکەکانی سڕینەوە و بە دەستێکیش جامە ئاوەکەی بە دوایاندا ڕشت. ئامە خانیش کەوتبووە ئایەتەلکورسی خوێندن و فووکردن بەسەریاندا و تاوەکو ئۆتۆمبێلەکەشیان لە چاو گوم بوو، ئەو هەر دەمی دەگێڕا بە دووعاوە و بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە و خەریکی فووکردن بوو.
ڕووناک پێش هەموویان ڕای کردە سەرێ و چووە ژوورەکەی خۆی و خۆی بەردایە سەر ئەو جێگایەی کە چەند شەو لەگەڵ بێستوون پێکەوە لەسەری دەنوستن، دەمی چەقاندە ژێر سەرینەکەی بێستوون و بەکوڵ دەستی کرد بە گریان.
نەوبەهاریش کوردۆی کوڕی گرتە باوەش بیهێنێتە سەرێ لەسەر پێپلیکەکان هەندێ خۆی لەگەڵ خافڵاند تاوەکو کوڵی گریانەکەی دامردەوە، ئینجا ڕووی هات بێتە لای خەڵکی ماڵەکە.

حەپسە خان و ئەوان لای نیوەڕۆ هەندێ هاتنەوە سەرخۆ، ئەگەر چی زۆر بە مەلوولی سەیری دەروپشتی خۆیان دەکرد و لە لایان وابوو شار بە جارێ باری کردووە، ئەوەندە جێی کوڕەکان دیار بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوەندەیان زانی کەوا کەوتنە باسی دەعوەتەکەی شەوێ و گێڕانەوەی بۆ ئەوانەی نەهاتبوون.
حەپسە خان بە گەرمییەوە قسەکانی قەدری خان و ئاسکۆڵ خان و وەرامەکانی نەسرین و نەوبەهاری بۆ بۆ هەردوو حاجی گێڕایەوە و باسی مشتومڕی تەلەفۆن و تەلەفۆنکاریی شەوکەت ئاغا و عەلیی بۆ کردن. ئامە خانیش باسی شیوەن و گریان و قسەکانی خەجیج خانی بۆ گێرانەوە. لە داوای هەموو قسەوباس و عەیب و عار لێدەرهێنان و گێڕانەوەی باسی ناو ماڵ و خانوو و فەرش و قاڵی، ئامە خان دەستی خستە سەر دەمی و دایە پرمەی پێکەنین و گوتی: "لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە من نەمدەوێرا بە چاکی سەیری ئاسکۆڵ خان بکەم، چونکە ئەو پرچە زەردکراوەی کەوا لەسەر سەری کۆمەڵ کردبوو، هەر بە قاڵبە کێکم دەهاتە بەرچاو، ئەو ڕۆژەی هاتبوونە لامان باشتر بوو، بەسەر شانیدا هاتبووە خوارێ. ئەمشەو پرچەکەی هەر دەتگوت قاڵبەکێکە بە سەریەوە." نەسرین دەستی ڕاوەشاند و سەیرێکی ئامە خانی دایکی کرد و گوتی: "حەی حەی بۆچی تۆ دەزانی ڕەنگە چەند پارەی دابێ تاوەکو وایان لەو پرچەی کردبێ!" نەسرین پێکەنیی و گوتی: "ئەمە پێی دەڵێن شنیون، دە توخوا وەرە ئەویش دەڵێت قاڵبەکێک." ئامە خان بە زەردەخەنەوە گوتی: "کچێ دایکم ئەو پرچە بە چی وا پڕ بووە، بەخوا لە سلێمانی بەتایبەت کە دەهات بۆ حەمامی موفتی، زۆر جار تووشی یەک دەبووین، پرچی هەر دوو تیتک بوو، پێستی سەری

هەمووی دیار بوو." "ئامە خان بە دڵ پێکەنی و گوتی: "وادیارە پارە پرچی خەڵکیش زۆر دەکات." سەبری هاتە قسە و گوتی: "ئێوە بە باشی سەرنجتان نەداوەتێ، ئێستاش هەروا دوو تیتک بوو، بەڵام کە دەچنە لای ئەو دەلاک و پرچڕێکخەرانە بۆیان وا پڕ دەکەن و ڕێکی دەخەن و چەند جۆر دەرمان و شتی وایان بۆ لێ دەدەن تاوەکو وا دیار بێت."

تۆفە ئەو ڕۆژە زۆر دڵی تەنگ بوو بۆ کوڕەکان کەوا ڕۆیشتن و بەیانی دوای ڕۆیشتنی ئەوان ویستی بچێتە دەرەوە و ناوبازاڕ، ئیتر ملی کۆڵان و جادەی گرت و تاوەکو دوابنیوەڕۆ نەگەڕایەوە ماڵێ. کە هاتیشەوە یەکسەر چووە سەرێ بۆ لای خێزانەکە، کە لە ژووری دانیشتن لە دەوری یەک کۆ ببوونەوە. تۆفە کردی بە ژووردا و بە ماتی و بێ قسە چوو لەسەر کورسییەک دانیشت و خەریکی جگەرەکەی بوو.

سەبری کە دەیزانی حاڵی چییە و چۆنە و ئێستا پەلەپیتکەیەکی لێ بدەیت دەتەقێت، بۆیە ویستی هەندێ قسەی خۆشی لەگەڵ بکات و بیدوێنێت، کە بەشکەم دڵی بکرێتەوە، بۆیە ڕووی تێکرد و گوتی: "تۆفە گیان دوێنێ چوویت چیت کرد لە مەکتەب، خۆ تۆ باست بۆ نەکردین؟ ئاخری چووی نەچووی قەید بووی؟" تۆفە دوای ئیستێک بە مەلوولییەکەوە گوتی: "ئا چووم." حەپسە خان بەزەیی پیا هاتەوە و دڵی بۆی پڕ بوو کە زانیی تۆفە چەند ناڕەحەتە، بۆیە ئەویش تێکەڵی قسەکە بوو و گوتی: "بەو خوایە تۆفە گیان سەرمان وا قاڵ بوو هەر بیرم نەبوو لێت بپرسم، بەڕاست چۆن بوو چیتان کرد؟" تۆفە بە سەری داخراوەوە بێ ئەوەی سەیری کەسیان بکات، مژێکی لە جگەرەکەی دا و گوتی: "چووم ناویان نووسیم، دەبێ لە شەممەی داهاتووەوە ئیتر هەموو ئێوارەیەک سەعات شەش لەوێ بم تاوەکو سەعات نۆ." سەبری گوتی: "ئۆخەی وەڵا ماوەکەی درێژە، شتێک فێر دەبن، ئەی شوێنەکەی لە کوێیە؟ نزیکە لێرەوە؟" تۆفە کە دەتگوت بێزارانە جواب دەداتەوە، گوتی: "بە پێ دوورە، بەڵام بە پاس هەر دە دەقیقەیە." سەبری بە خۆشییەوە گوتی: دە دەقیقە هەر هیچ نییە، کەواتە نزیکیشە." تۆفە ئاخێکی هەڵڕشت و گوتی: "کوڕە مەکتەبی چی، منیش هەر دەمەوێ بۆ سەرقاڵی و گاڵتە بچم، جاری وا هەیە ناوی خۆمم بیر نییە لە داخی ئەم دنیایە، ئێستا هیچ ناکەم بەم ئاخر و ئۆخریی عومرەوە خوێندن و مەشقم لەبیر دەمێنێت و فیری نووسینی فارسی دەبم؟"

حاجی مەجید بەدەم تەسبیحاتەوە بە کزییەکەوە گوتی: "کار نییە خوا ئاسانی نەکات، هەندێ سەبرتان هەبێت، ئیشەڵا ئەم ناخۆشییانەتان هەمووی بیر دەچێتەوە و دڵی خۆتان ئەوەندە سەغڵەت مەکەن و هەرچی خوا نەیکات نابێت." ئامە خان بە مەلوولی و

دەنگێکی کزەوە گوتی: "بەقوربانی خوا بم، ئەوەندەمان بانگ کرد و هاوارمان بۆ برد دەممان شل بوو، دەڵێیت ئەستەغفیرەڵا پشتی تێکردووین گوێی لە دەنگمان نییە." حەپسە خانی خوشکی بە ترسێکەوە گوتی: "وەی بەقوربانە وا مەڵێ، خوا خراپتر نەدات، منالەکانمان سەلامەت بن توخوا وا ناشکوری مەکە کورەکان بەرێوەن."

* * *

شەوێک کە هەوری رەشی چڵکن سەریان نابوو بەیەکەوە، نمە نمە بارانیش دەبارِیی، بەدەم کزە بایەکی ساردەوە، تۆفە بە سەروسەکوتی پێچراوەوە و قەمسەڵەیەکی تەرەوە هاتەوە ماڵێ، دەفتەر و قەڵەمەکانی خستبووە ناو کیسەیەکی نایلۆنەوە و ئاخنیبووە باخەڵی لە ترسی باران، هەر کە کردی بە ماڵدا یەکسەر چووە ژووری خۆی و سمایل و ژوورەکانی تر، کورەکان هەستان بەپیریەوە، سمە کە بووبوو بە مامۆستای، بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە راپەرِیی و گوتی: "یاخوا بەخێر بێیتەوە، بزانم ئەمرۆ چەندت وەرگرتووە؟ دیسان ئافەرینیان دایتێ؟" تۆفە کیسەی دەفتەرەکانی هەڵدایە سەر جێگای نوستنەکەی و بەدەم قەمسەڵەداکەندنەوە گوتی: "وەڵا ئەمرۆ شەرێکی چاکم کرد."

کورەکان ورووژان و بە پەرۆشەوە بە جارێ گوتیان: "شەر؟ لەگەڵ کێ و لە کوێ تووشی بوویت؟" تۆفە دوو سێ جار کۆکی و کە کۆکەکە بەری دا، جامانەکەی داگرت و لەسەر جێگاکەی دانیشت و رووی کردە سمایل و گوتی: "ئا بە خێری خۆت چایەکم بۆ تێکە." کورەکانیش پەلەیان بوو کە بزانن شەری چیی کردووە، بەختیار پێشیان کەوت و گوتی: "کاکە تۆفە لە کوێ تووشی شەر بوویت؟" تۆفە لەسەرخۆ چایەکەیە لە سمایل وەرگرت و بە گەرمییەوە گوتی: "کورە لە مەکتەب تووشی بووم، لەگەڵ موعەلیمە سەگبابەکە."

کورەکان دیسان ورووژان، هەندێ لە ترسی تۆفە پێکەنینەکەیان شاردەوە و ئەوانی تریش هەریەکەیان شتێکی گوت و پرسیارێکی لێ کرد.

تۆفە بەدەم چاتێکدانەوە گوتی: "کورە باوکم شتی دەپرسی، منیش هەر دەستم هەڵدەبرِی، هەموویانی هەڵساند و هەر چاویشی لە من نەبوو، ئەمە یەک مانگە من دەچم بۆ ئەو مەکتەبە تا ئێستا یەک جار هەڵینەساندووم." بەختیار خۆی پێ نەگیرا دایە قاقای پێکەنین و گوتی: "کاکە ئاخر تۆ فارسی باش نازانی بۆیە، ئەو دەیەوێت چاک فێری بیت ئەوسا هەڵتدەسێنێ." تۆفە بە خێسەیەکەوە سەیری بەختیاری کرد و گوتی: "نەوەڵا لەبەر ئەوە نییە، پیاوێکی تورکمانمان لەگەڵە هەر یەک کەلیمە فارسی نازانێت، من لەچاو ئەوا بلیمەتی فارسیم، کەچی هەر هەڵیدەسێنێت." بەختیار گوتی: "باشە ئەی

وەکو بزانیت لەبەر چی هەڵتناسێنێ؟" تۆفە فرێکی لە چایەکە دا و دیسانەوە وەکو هەموو چاخواردنەوەکانی، چایەکەی بۆ چاوترووکانێک لە دەمیدا هێشتەوە، ئینجا بەلەزەت قوتی دا و گوتی: "زۆر چاک دەزانم بۆ گوێ ناداتە من و بۆ گوێ دەداتە ئەوانی تر، چونکە ئەوانی تر بەرتیلی دەدەنێ. ئەوەی لە هەموو کەس زیاتر هەڵیدەسێنێت و گوێی دەداتێ، سەرچەورێکی خوێڕییە، بەڵام چێشتخانەی چلە و کەبابی هەیە، کاک عەبدوڵلا دەیگوت کە هەموو ئێوارەیەک موعەلیمەکە دەباتەوە لەگەڵ خۆی بۆ چێشتخانەکەی و چلە و کەبابی دەرخوارد دەدات بە بەلاش." سمایل خەریک بوو ببوورێتەوە لەبەر پێکەنین و نەشیدەوێرا بە ئاشکرا دەری بخات، زۆری لە خۆی کرد کە بتوانێ قسە بکات و ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "باشە کاکە تۆفە گیان، ئەی ئەوانی تر چییان هەیە کە دەڵێیت هەمیشە ئەوان هەڵدەسێنێت؟" تۆفە خێسەیەکی ئاگرینیشی لەو کرد، نەختێ ڕاوەستا وەکو بۆ جوابێک بگەڕێت، دوایی گوتی: "ئەوانی تریش هەریەکەیان شتێکیان هەیە، یەکێکیان میوەفرۆشە، ئەوی تریان لە نانەواخانە ئیش دەکات." تۆفە بە بێزارییەوە دەستی ڕاوەشاند و گوتی: "ئیتر چووزانم سەگبابەکانی تریش چیی بۆ دەهێنن." کوڕەکان ئیتر بە جارێک دایانە قاقای پێکەنین و خۆیان پێ ڕانەگیرا و سەریان بۆ لەقاند و گوتیان: "قسەی تۆیە، قسەی تۆیە کاکە گیان."

* * *

دنیا بە تەواوی ساردی کردبوو، زستان بە گرم و هوڕ و سەروچاوی مۆنیەوە باڵی شۆڕ کردبوو بەسەر هەموو شوێنێکدا. ماڵی حەپسە خان ئێوارەی هەور و باران هەر زوو چراکانیان دادەگیرساند و دەوری سۆپا و ئاگردانیان دەدا، زۆری کات دڵتەنگ و بێحەوسەڵە و بێتاقەت بوو، هەر کەسەیان دەیویست خۆی بە شتێکەوە خەریک بکات، کە بەشکم ئەم تەنیایی و دەربەدەری و دوورەوڵاتییە لەبیر خۆی بەرێتەوە.

بەینێ حەپسە خان خۆی بە دورمانی و خەیاتییەوە خەریک دەکرد، دادەنیشت و دەیگوت: "کچینە وەرن کراسی کوردیتان بۆ بدوورم، ئەها کراسەکەی خۆمم چەند ورد و جوان درووە."

ڕووناک پێگەییبوو و ئەوەندەی تر جوان بووبوو، خەیاڵی دابووە سەروپرچی، هەر بەوەدا دەگەیشت خەنە بگرێتەوە و سەروپرچی تێبنێت، ئەو سەروپرچە خەناوییەی زۆر لێی هاتبوو.

ئامە خانیش فێری بەزمێک بووبوو، وەکو دەڵێن ئەگەر تیریش بباریایە ئەو هەر فرسەتێکی دەدۆزییەوە بە گورجی خۆی دەپێچایەوە و بەو سەرمایە دەچووە

تارمەکەی سەری سەرەوە و لە سووچێکیەوە ڕادەوەستا کە دەیڕوانییە سەر دەستێکی هەندێ بەرین و پانی شووروەدار، کە چەند بینا و خانووی لێ کرابوو لە ئاشی ئەلەکتریک و ئەو چەشنە شوێنانە دەچوو لە حەوشەکەشیدا چەند قەلابە و ئۆتۆمبێلی ئیش ڕاوەستابوو یان لەگەڕدا دەبوون. هەروەها ڕێبازێکی باریکەلەش لە بەردەم ئەو دەشتە شۆڕە کراوەیەدا تێدەپەڕی، کە هەمیشە خەڵکی ڕەشوڕووت و ماڵە عەملە و لەو چەشنە کەسانە پیایدا تێدەپەڕین و دەچوون بۆ دوکان و بازاڕ و لەوسەرەوە بە کیسە و تووورەکەوە دەگەڕانەوە ماڵەکانیان. ئامە خان بە دیمەنی ئەو دەشتایی و ئەو هاتوچۆکەرە دڵی دەکرایەوە و ئەگەر چییان لێ بکردایە پاشنیوەڕوان هەر خۆی دەدزییەوە و دەچوو سەرێکی دەکێشا و گوێی نەدەدایە شەڕی کاکە حاجیی مێردی و بۆڵەی حەپسەی خوشکی و ئەوانی تریش کە لەگەڵیان دەکرد و پێیان دەگوت: "سەرمات دەبێت و نەخۆش دەکەویت." ئاخر جاریان لێی گەڕان کە زانییان ئەوەندە خۆی حەزی پێ دەکات. لەبەر ئەوە کە دەگەڕایەوە ژووری بۆ لای ئەهلی ماڵەکە، هەر کەسەو بە گاڵتەوە شتێکی لێ دەپرسی و خۆیشی دەکەوتە گێڕانەوە کە چیی دیوە و چیی نەدیوە و کێ خلیسکاوە و کێ کەوتووە بە دەمدا و کیسەی کام ژن پچڕاوە و لە دەستی بەربووتەوە و شتەکانی لەو ناوەدا بڵاو بوونەتەوە و چۆن ماتۆڕسایکلێک تێپەڕیوە و کابرا ژنێکی چادربەسەری لە پشت خۆیەوە سوار کردووە و لەم جۆرە قسانە.

ئێوارەیەکیان ئامە خان گەڕایەوە لە گەشت و سەیرانەکەی دەموچاوی سوور هەڵگەرابوو، لەوە دەچوو کە گریابێ. خوشکی بە پەرۆشەوە لێی پرسی و گوتی: "چاوت لە خۆتە چیت بەسەر هاتووە، ئاخری خۆت نەخۆش دەخەیت." ئامە خان بە کزییەکەوە گوتی: "نە بەخوا هیچ سەرمام نەبووە، ئەوە تۆزێ گریاوم، چونکە چەند ڕۆژێکە ژنێک دەبینم کە بەوێدا تێدەپەڕێت، هەر دەڵێی باجی پیرۆزی نانکەرە، هەر عەینەن ئەو خۆی هەڵدەکات کە دەچێ بۆ بازاڕ و دەگەڕێتەوە، ناوشانەکانی وەکو ئەو کۆمە هەر دەڵێی ئەوە، دڵم ڕوون دەبێتەوە کە چاوم پێی دەکەوێت."

حەپسە خان بەزەیی بە خوشکیدا هاتەوە و لە دڵدا زۆر ناڕەحەت بوو بۆی و زانیی کە تا چ ئەندازەیەک ئەو خوشکە فەقیرە ساویلکەیەی بیری وڵات و هاوشار و کەسوکاری دەکات، بەوەش دڵی ڕوون دەبێتەوە کە لە دوورەوە چاوی بە ژنێک بکەوێت کە لەب اجی پیرۆزی نانکەر بچێت. حەپسە خان قوڕگی پڕ بوو لە گریان و کە هاتەوە سەرخۆ بە پێکەنینێکی دەستکردەوە گوتی: "زۆر سەیرە، ئاخر بۆیە دەڵێن خوا بەقوربانی بم هەر چل کەسی لە شکڵێ دروست کردووە، بەخوا کەسی وا هەن هەریەکەشیان خەڵکی

ولاتێک و میللەتێکن، کەچی سوبحانەلا چەند لە یەک دەچن." حەپسە خان درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی: "ئەی تۆ ئەو کوڕەت باش سەرنج داوە کە نەوتەکەمان بۆ دەهێنێت؟ ئەو ڕۆژە لە حەوشەکە ڕاوەستابوو لەگەڵ ئاغای ڕەزائی حیسابی پارەی دەکرد کە بیداتێ، هەر کە چاوم پێی کەوت داچڵەکیم، بە ناوی خوا هەر کتومت دەتگوت حەسەنی بانگوشە، هەر ئەوەندە نەمابوو کە بڵێم ئەیەڕۆ حەسەن، ئەوە تۆش هاتی!"

هەردوو خوشک دەستیان کرد بە پێکەنین، دواییش کەوتنە باسی حەسەنی بانگوش، کە ئاخۆ ئێستا چیی لێ هاتبێ، چی بکات، ئێستا مەعلووم دیسان وەک قەلەباچکە بەسەر گوێسەوانەکانیانەوەیە و هەر خەریکی کارشتن و باگردێن و سەربانگێڕانە و لە ژێریشەوە جنێو بە حکومەت دەدات.

ئامە خان هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "ئۆە خۆزگەم کە زستانان بەیانیان زوو لە ژووری لە بەرسەماوەرەکە دادەنیشتم و خەریکی چا و بەرچایی دەبووم بۆ حاجی و مناڵەکان کە لەپڕ گرمەی بانگێڕان و باگردێنی حەسەن دەهات و دەکەوتمە بەرچایی حازرکردن بۆ ئەویش، چونکە دەمزانی کە لێبووەوە دیتە خوارێ دەڵێت برسیمە."

حەپسە خانیش ئاخێکی بە کوڵ و دڵی هەڵڕشت و لەبەر خوشکی ویستی بەسەر ئەو باسەدا باز بدات و هەندێ فێڵ لە خۆی بکات، گوایە مێشکی دوور بخاتەوە لەو یادە شیرینانە، بۆیە قسەکەی گۆڕی و کەوتە باسی کراسدوورین و سوخمە و ئاوەڵکراس.

نەسرین بە چاوی سووری پڕ فرمێسک و دڵێکی گوشراوەوە لە ژووری سەری بە دیار نازێی کچیەوە دانیشتبوو و پەڕۆی تەڕی دەخستە سەر نەوچەوانی، چونکە تایەکی گەرم گەرمی لێ هاتبوو و دەموچاوە قۆڵپنە ناسکەکانی سوور هەڵگەڕابوو و ڕوومەتەکانی وەک سێوەلاسوورەی لێ هاتبوو و زۆر بێتاقەت دیار بوو، ئەوەندەش نەبوو کە لای دکتۆر هاتبوونەوە، خێزانەکە هەمووی بێئارامی و داماوییان لێ دەباری، بەتایبەت لەبەر نەخۆشیی مناڵەکە، کە زۆریان خۆش دەویست و قسەکانی زۆر خۆش و خەمڕەوێن بوون و گیانێکیشیان بەو دوو سێ مناڵە بوو، لەبەر ئەوە کە یەکێکیان نەخۆش دەکەوت هەموویان بە جارێک ئەو داخ و خەفەت و هەستی غەریبییان دەورووژا و سەریان لێ دەشێوا، جاری وا هەبوو لە داخاندا دەهاتن بەیەکدا و لەسەر شتێکی بچووک و قسەیەکی سادە دەچوون بەگژ یەکتردا، یەکێکیان دەیگوت: "پەڕۆی تەڕ بخە سەر ناوچەوانی مناڵەکە با تۆزێ لەشی فێنک بێتەوە." ئەوی تریان لەوێوە هاواری دەکرد: "ئۆە دکتۆر حەواڵە بە خوا بن، کورە وازی لێ بێنن ئارەق بکاتەوە باشترە لەو پەڕۆ تەڕە، بەو پەڕۆیە تووشی هەلامەت دەبێت." یەکێکی تر لەولاوە

دەیقیڕاند: "بۆ خاتری خوا واز بێنن و بە قسەی دکتۆر بکەن ئەو هەموو شتێک دەزانێت، ئێوە فێری داودەرمانی زەمانی بەردن، ئەم قسانە چییە، دکتۆرەکان ئەم هەموو ساڵە خوێندوویانە، خۆ بە خۆڕایی نەبووە و بە خۆڕایی نەبوون بە دکتۆر." لەپڕ حەپسە خان یان خوشکی چارەیەکی قەدیمییان باس دەکرد و بە دڵی کچەکان نەدەبوو، ئیتر دەبووە مشتومڕیان، نەسرین فرمێسکەکانی دەسڕییەوە و بە تووڕەیی لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "تۆ بزانە ئەو حسێنە ئەمە چەند مانگە هەر نەهات بەلامانەوە، ئەوەتا من خەریکم شێت دەبم بۆ کچەکەم و ئەمە سێ شەو و سێ ڕۆژە نان و ئاو و خەوم لێ حەرام بووە، کەچی ئەویش ئێستا بۆ خۆی بێخەبەر تێر دەنویت و تێر دەخوات، بێخەم، نەسرین تووڕە دەبوو و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "بەڕاستی ئەجری دایک زۆرە و هەموو خەفەت و هیلاکییەک هەر بۆ دایکی بەسەزمانە، باوکیش لەسەر حازر سنگ دەردەپەڕێنێ."

* * *

منداڵە نەخۆشەکە چاک بووەوە، خێزان دڵیان خۆش بوو و کەوتنە گێڕانەوەی قسەکانیان، کە لەو وەختە کێ چیی گوتووە و کێ تووڕە بووە، زوو زووش دەیاندایە قاقای پێکەنین بە قسەکەی نەسرین، کە بۆی گێڕابوونەوە گوایە ئەو ڕۆژەی ئەو و بەختیار و تۆفە مناڵەکەیان بردووە بۆ لای دکتۆر و بە تاکسی گەڕابوونەوە ماڵێ، لە نزیک کۆڵانەکەیان تۆفە سنگی دەرپەڕاندووە و ویستوویەتی بە فارسی قسە بکات، بە لێخوڕی تاکسییەکەی گوتووە: "ئاغا ئین کۆڵان."

* * *

ئەگەرچی ڕۆژگار بە پەلە تێپەڕیی، بەڵام لەبەر بێئومێدی و بێئیشی، ڕۆژگاری خێزانی حەپسە خان و ئەوان زۆر بە سستی و بێزارانە بەسەریاندا تێپەڕین، شەویان هەر لە بڕانەوە نەدەهات و بە ڕۆژیش گوێیان هەڵخستبوو بۆ هەواڵێک و بۆ ڕووداوێکی دڵخۆشکەر و نامە و جەوابێکی کوڕەکانیان، کە بەشکم هیوایەک بخاتە دڵیانەوە، بەتایبەت کە کوڕەکان دەستیان کردبوو بە نامەناردن بۆیان و ئەمانیش وەرامیان دەدانەوە.

ئەو ڕۆژەی نامەی یەکێکیان بهاتایە، ئیتر دڵیان دەکرایەوە بۆ هەر کەسەیان بهاتایە، بەتایبەتی سەبری و نەوبەهار و نەسرین و ڕووناک، بێجگە لە قسەی تایبەتیی خۆیان کە دەیانکرد بە ژێر لێوەوە، ئەوەی تریان هەموو بە دەنگێکی هەندێ بەرز بۆ خێزانەکەیان دەخوێندەوە، کە هەموویان دادەنیشتن بێدەنگ و نقەیان لە خۆیان دەبڕی تاوەکو بە باشی بزانن چی لەو نامەیەدا نووسراوە و هەندێ جاریش ئەگەر یەکێ لە

کوڕەکان قسەیەکی بنووسیایە و ئەمان بۆیان نەخوێنرایەتەوە یان قسەکەیان لێ ڕوون نەبوایە کە باسی چییە، ئیتر بە جارێک هەموو دەکەوتنە گێژاوەوە تاوەکو دوو سێ ڕۆژ بیریان لێ دەکردەوە و لێیان دەکۆڵییەوە و ئەمیان دەنگی نزم دەکردەوە و دەیگوت: "بەخوا ئەوە مەبەستیان شتێکە، بەڵام لەبەر ئەوەی کاغەزەکانیان نەخوێنرێتەوە لە لایەن دەوڵەتەوە، نەیانوێراوە بە ئاشکرا بینووسن، بەخوا ڕەنگە شکور باسێکی خۆش بێت." ئەوی تریشیان قسەیەکی تری دەکرد ئیتر تاوەکو چەند ڕۆژێک یان تاوەکو نامەیەکی تر ئەمان سەری خۆیان قاڵ دەکرد بەو قسەیەوە، ئاخرییش دەردەچوو کە هیچ نییە و نەبووە و ئەو کەلیمەیەی بۆیان نەخوێنراوەتەوە و بە خەیاڵ کۆشک و تەلاریان لەسەر دروست کردبوو، حەرفێکی یان نوقتەیەکی پەڕیوە لە وەختی نووسیندا.

* * *

بەیانییەکیان نامەیەکی شیروان هات بۆ سەبری، کە باسی هاتنی خۆی و حسێنی بۆ نووسیبوو کەوا هەفتەیەکی تر دێن بۆ لایان و بۆیە تاوەکو ئێستا دواکەوتوون، چونکە ماڵی باوکی بێستوون پەڕیونەتەوە ئەمدیو و ئەوانیش بەڕێوەن و گەیشتوونەتە بانە، لەبەر ئەوە حسێن و بێستوون هەفتەیەکە ڕۆیشتوون بەپیریانەوە. خێزان بەم نامەیە بە جارێک ورووژان و کەوتنە مەراقەوە، کە ئەمە چۆن ئەو خێزانە گەورەیەی ماڵی باوکی بێستوون بەو هەوو مناڵ و گەورەوە هاتوون و بۆ هاتوون بەم سەرماوسۆڵەیە، ئاخۆ ئێستا چییان بەسەر هاتبێ و دەبێ چی قەومابێت، ئەمان لە کن خۆیان خواخوایانە قسەیەکی خۆشیان گوێ لێ بێت و مژدەیەکی ئاشتبوونەوە بێتە بەرگوێیان، کەچی تازە دەڵێن خێڵی ماڵی بێستوون ڕایان کردووە و پەڕیونەتەوە، هەروەها باوکی بێستوون ئەگەرچی کوڕەکەی پێشمەرگەیە و خەریکی سیاسەتە، بەڵام ئەو پیاوێکی بێدەنگە و لە هیچدا نییە، هەروەها پیاوێکی ناسراو و بەحورمەتە لە ناوچەکەیدا، تەنانەت وەختی شەڕی دووبەرەکی و هەراکەش ئەو لەگەڵ خەڵکی تر دەچوو بۆ هەردوولا بۆ ناوبژی و ئاو بە ئاگر کردندا، لەگەڵ ئەوەشدا کە لایەکی تر دەیانناسی و دەیانزانی کە کوڕی دژایەتییان دەکات لەم شەڕەدا، بەڵام هەر حورمەتیان دەگرت و ئەوە بوو کە ئەمان پەڕینەوە، ئەو بە پشتئەستووری لە شوێنی خۆی مایەوە، چونکە دەیزانی کە کەس هەقی نییە بەسەریەوە، لەبەر ئەوەی هەردوو لا حورمەتیان دەگرت و پەیوەندییان پێوە هەبوو.

هەردوو حاجی و کوڕەکان و ژنەکان، بەتایبەتی ڕووناک کە ماڵی خەزووری بوون، هەموو کەوتنە مەراقەوە و بێئومێدی ئارامی لێ هەڵگرتن، ئەو دەیگوت: "دەبێ ئەو

هەموو مەڕومالاتەیان ئاخۆ چی لێ کردبێ؟" ئەوی تریان دەهاتە قسە و دەیگوت: "ئەی ئەو ماڵ و حاڵ و خێر و بەرەکەتەیان دراوەتە دەست کێ؟"
ئیتر ئەم دەیگوت  و ئەو دەیگوتەوە.

* * *

دوای دە ڕۆژێک لە گەیشتنی نامەکەی شیروان، ئێوارەیەک شیروان و حسێن گەیشتنە تاران و ماڵەکەیان گەرموگوڕ کردەوە و بێئارامییەکەیان هەندێ ڕەواندەوە، شیروان و حسێن بە وردی باسی باوکی بێستوونیان کرد و گێڕایەوە کەوا هەموویان گەیشتوونەتە هەمەدان بۆ لای پێشمەرگەکان و وا خەریکی دامەزراندنیانن، هەروەها بۆشیان ڕوون کردنەوە کە لەبەر چی هەڵهاتوون، هەر زووش حسێن باوکی و مامی تێگەیاند کە هەمزە ئاغای باوکی بێستوون زۆر نەخۆش و بێحاڵە و چەند ڕۆژێکیش خوێنی لەبەر ڕۆییوە، دیارە حسێن ئەم قسەیەی لە ژنەکان شاردەوە، چونکە فەیزانی کە ئێستا دەیکەن بە شیوەن و هەرا، بەڵام باسەکەی تری بۆ کردن کە وەختی خۆی سەرەتای شۆڕش کە پێشمەرگە ناحیە و مەخفەرەکانی حکومەتی دەگرت، پۆلیس هەموو تەسلیم دەبوون، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکانەی سەر بە حکومەتن بڕوا بکەن کە هیچیان لێ ناکەن و تاوەکو ئەو جۆرە شوێنانە تەسلیمی پێشمەرگە ببن بەبێ شەڕ، لەبەر ئەوە سەرکردەکانی شۆڕش وایان بڕیار دا کە ئەوانەی تەسلیمیان دەبن بیانهێننە پێشەوە و تێکەڵی پێشمەرگەیان بکەن و قازانج لە تەجروبە و زانینیان وەربگرن، بۆ ئەوەی مەئمووری تریش نەترسن و پەیوەندی بە شۆڕشەوە بکەن. ئینجا ئەو نەوعە کەسانە بەشی هەرە زۆریان کوڕی چاک و دڵسۆزی شۆڕش دەرچوون، یەک دوانێکیان نەبێ کەوا خوێڕی و دز و بەدخوو بوون. یەکێک لەو بەدخوانە کە معاونی پۆلیس بوو، جارێک فرسەتی دیبوو چووبووە سەر ژنە پێشمەرگەیەکی شەهید بە بیانووی یارمەتیدانی و خەریک بوو تەعەدای لێ بکات، ژنەکەش بە هەڵەداوان و گریانەوە چووبوو بۆ بنکە و شکاتی لەو معاونە کردبوو، ئیتر بێستوون و چەند پێشمەرگەیەکی تر وەک شێتیان لێ هاتبوو، چووبوون تێر تێریان تێهەڵدابوو.
ئینجا کە شەڕی براکوژی دەستی پێ کرد، ئەم معاونە گوێزرابووەوە ناوچەکانی نزیک ماوەت، یەکەم ئیشی ئەوە بووە کە خۆی بگەیەنێتە ماڵی ئەو پیاوە باشە بەحورمەتە و داخی کۆنیان پێ بڕێژێت و دەست بکات بە بیانووگرتن لێیان، ئەوانیش لە ترسی کوڕ و منالی تریان سەری خۆیان هەڵگرتبوو و بەو سەرماوسۆڵەیە کەوتبوونە ڕێ بەرەو شاخ و کێو و لە دواییشدا هاتبوون بۆ ئێران.

چەند ڕۆژێکی تریش خێزانی ماڵی حەپسە خان و ئەوان بە داخی ڕووداوەکەی ماڵی بێستوون تلانەوە، بەڵام دوایی ناچار بەو خەبەر و دەنگوباسەش ڕاهاتن، وەکو هەموو دەنگوباس و ڕووداوە ناخۆش و دڵتەزێنەی بەسەریان هاتبوو، ناچار دەبوون کە ملی بۆ کەچ بکەن.
حسێن لە گاڵتە و قسە خۆشەکانی نەکەوتبوو و هەر گەیشتە جێ و دوای هەندێ پشوودان و گێڕانەوەی دەنگوباسی خۆیان و ماڵی بێستوون، کەوتە جووڵەجووڵ و بزێوی و گاڵتە و قسەی پێکەنین و هەر لە دەرس و دەور و مەکتەبی تۆفەوە پیا هات تاوەکو چاکەت و پانتۆڵی سمایلی پوورزای، کە لە دوکانی فەردە کڕیبووی و کە دەچووە دەرێ و دەیکردە بەری، کە دەشیانناردە ئەو دوکانە نزیکانە کە شتێکی بچووک بکڕێت و ئەو دەیگوت جارێ ڕاوەستن تاکو خۆم دەگۆڕم.
* * *
تۆفە شیروان و حسێنی پێش خۆی دابوو و بە ماڵەکەدا دەیگەڕاندن و سەربان و هەیوانی پیشان دەدان و سەر و خواری پێ دەکردن و خۆی وەک لێزان و شارستانی و مەدەنی پیشان دەدا و ئەوانیش وەک لادێی، کە تازە هاتبنە شار و یەکەم جار شاریان دیبێ. ئەوانیش خۆیان گێل دەکرد بۆ ئەوەی تۆفە دڵی خۆش بوایە پێی و ئەوەندەی تر خۆی گیڤ بکردایە بەسەریانەوە. لە کاتیکدا کە لە تارمەکەی چینی یەکەم ڕاوەستابوون و تۆفە بە گەرمی دەستی ڕادەوەشاند و باسی گەڕەک و ناوچەکەی بۆ دەکردن، ئاغای ڕەزائی لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە بە چاکەت و پانتۆڵی ڕێکوپێک و بارانی و شەفقە و دەستکێشەوە، جانتایەکی ڕەشی بچووکی بە دەستەوە. ئاغای ڕەزائی کە گوێی لە تۆفە بوو کەوا قسەی بۆ حسێن و شیروان دەکرد، لە حەوشەکە ڕاوەستا و سەری هەڵبڕی و سەیرێکی کردن و سەلامێکی لە کوڕەکان کرد و بە فارسی بە تۆفەی گوت: "ئاگات لە دەرکی حەوشە و ماڵەکە بێت تاوەکو دێمەوە." لێی دا چووە دەرەوە.
شیروان و حسێن بە سەرسووڕمانەوە ڕوویان کردە تۆفە و گوتیان: "ئەمە کێ بوو؟" تۆفە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "ئەمە کوڕە چێشتکەرەکە بوو کە تۆزێ لەمەوپێش هاتە سەرێ و سەلامی لێ کردن و قاپە میوەکەی دایە دەستم." حسێن بە سەرسووڕمانەوە گوتی: "ئەمە ئەو بوو، بە کوردستان وام زانی مەئمووریکی گەورەی دەوڵەت هاتووە بۆ ئێرە ئاخۆ بە چ ئیشێک." شیروان پێکەنیی و گوتی: "باشە ئەوە چوو بۆ کوێ؟" تۆفە بە گەرمی و تەوسەوە گوتی: "چوو بۆ حەمامی دەرەوە." حسێن دیسان پێکەنیی و گوتی: "وەڵا دەتگوت ئاخۆ چ کاربەدەستێکە و دەچێت بەرەو

فرۆکەخانە سواری تەیارە بێت." تۆفە هەندێ کۆکی و بەدەم کۆکەوە گوتی: "ئەی چۆن، دە بڕۆن سەیری ژوورەکەی بکەن و سەیری نان و خواردنەکەی بکەن، کە چۆن سفرە بۆ خۆی دەڕازێنێتەوە و هەرچی سەرگوڵ و بەرگوڵی چێشتەکانە جارێ بۆ خۆی تێدەکات و کەوچک و چەتاڵ و چەقۆ ڕیز دەکات و دەست و دەموچاویشی دەشوات و جلی چێشتخانەکەشی دادەکەنێت و دەستەسڕێک دەکاتە ملیەوە، ئینجا بە خێرێ دەست دەکات بە نانخواردن." حسێن یەک قاقای لێ دا و گوتی: "مەگەر من وا نان بخۆم! بەخوا جاری وا هەیە ئەمەندە وەرامی ئەم و ئەو دەدەمەوە و ئەوەندە لەسەر نانەکە هەڵدەستم، هەر نازانم چیم خوارد و چووە کوێمەوە."
لەو کاتەدا سەبری سەرێکی کێشایە لایان و گوتی: "ئەوە چی دەکەن؟ دە وەرنە ژوورێ خۆ خەڵک زیرە دەکات لە سەرماندا، ئەوە سەرماتان نییە؟"

* * *

سەبری ڕووی کرابووەوە لە خۆشیی هاتنی شیروان و حسێن، بەڵام کە هەمووشیان پێکەوە دادەنیشتن و باسی حاڵ و ئەحواڵ و وەزعیان دەکرد، دەچوو بەگژ دەمی حسێن و شیرواندا و پێی دەگوتن: "هەموو خەتاکە مەخەنە سەر لایەکی تر، خەتای ئێوەش زۆرە، ئێوەش هەریەکەتان لەقەی لە ئەستێرە دەدا و لە قسەی خۆتان نەدەهاتنە خوارەوە، دە با هەندێ ئێوە برای مەسڵەحەت بوونایە، چی ئەقەوما، وەڵا بە هەردوو لاتان سەرتان لەم خەڵکە شێواند، میللەتی داماو نازانێ بە قسەی کامتان هەڵپەڕن."
جارێک لەو دانیشتن و دەموقاڵانەی بەینی سەبری و شیروان و حسێندا، سەبری دیسان سەرزەنشتی کردن و لە داخی ئەو وەزعە نالەبارەی خۆیان گوتی: "بۆچی نەگەیشتنە ئەنجامێک و بیرتان لەم خەڵکە نەکردەوە کەوا ئێستاش لە شارەکاندا برا و ئامۆزا و دەرودراوسێی چەند ساڵە یەکتر دەدەنە بەر گولله و تێلا و داروبەرد و خوێنی یەکتر دەڕێژن بەبێ هیچ لێکدانەوەیەک."
شیروان بە نەختێ تووڕەییەوە گەتی: "کچێ تۆ چووزانی! تۆ ئاگات لە هەموو شت نییە، جارێ لە پێشەوە و لە پێش هەموو شتێکدا ئێمە نەمانویست شەڕی چەکدارانە لەگەڵ حکومەت بکەین، چونکە جارێ وەختی نەهاتبوو، کە ئەوان ویستیان، گوتیان حکومەت بە پاڕانەوە و مەقالەنووسین هەقی کورد نادات و دەبێ بە چەک هەقی خۆمان بسێنین، ئێمەش لە ترسی ئەوەی نەبێ بە دووبەرەکی و پارچەپارچەیی و خەڵکەکە بە سەبەبکاری ژێرکەوتنی شۆڕشمان دانەنێن، بە ناچاری تێکەڵ بووین بە چەند تفەنگە کۆنێکی خەڵکەکە خۆیەوە کەوتینە ئەو شاخوداخە و بە دڵ و گیانیش هەرچییەکمان لەدەست هات کردمان. کەچی لە پاش ئەو هەموو بۆردومان وماڵکاولی

و خەڵـک گـرتن و کوشـتن و زینـدەبەچاڵکردنی چەنـدەها لاو و گەنجـی خەبـاتکەر و کوردپەروەر، لەپڕ گوتیان با لەگەڵ حکومەت ڕێک بکەوین، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێ لەو هەقانەی داوامـان کردبـوو دەسـتمان بکەوێت و لە دوای ئەوەی کە خۆیشـمان گـرت و بووین بە هێزێکی پتەو و ڕێکخـراو و پڕ چەک، کە هەمووی هەر چەک و کلاشـینکۆفی عەسکەرەکانی حکومەت بوو، کە پەیتا پەیتا پێشمەرگە دەستی دەکەوت لە کاتی هێرش و شکاندنەکانیان، بووین بە هێزێکی ڕێکخراو کە تـرس و لەرزی دەخستە دڵـی سـوپای حکـومەتەوە و لە بەرچـاوی ئێـوە بە قـافڵە و دەبـابە نەبـوایە حکـومەت نەیـدەوێرا زەخیرەش بەرێت بۆ بنکە عەسکەرییەکانی، پێشمەرگە توانیی شەمەنەفەری بەینی بەغدا و کەرکـووکیش چەنـد جارێـک بگرێـت، هەمووشـی بە خـوێنی گەش و فیـداکاریی پێشمەرگەی کودستان، کەچی لەم کاتەدا دەڵێن وەرن بـا ڕێک بکەوین لەگەڵ حکومەت و هەر کەس بچێتەوە سەر ئیشوکاری خۆی و ماڵ و حاڵی خۆی!"
شیروان سوور هەڵگەڕابوو، بە تووڕەییەوە دەستی ڕادەوشاند و سەیری سـەبریی کرد و گـوتی: "کەواتە شۆڕشـەکەمان بـۆچی کـرد؟ خەڵـک و بەتـایبەت ئەوانەی کوڕیـان و کەسـوکاریان کوژرابـوون و ماڵیـان کـاول بووبـوو، ئەو کـاتەش هەر ئامـادە بـوون بـۆ فیداکاری، چییان پێ دەگوتین، هەر هـیچ نەبێ دەبوو بە درۆش بوایە نەختێ حەقمـان بدەنێ بۆ پاکانەکردن بـۆ ڕێککەوتنەکەمـان، ئینجـا کە ئەمـانە هیچـی نەبێت لەسـەر چـی ڕێک بکەوتینایە و چیمان بە خەڵک بگوتایە، ڕێککەوتنەکە هەر ئەوە بوایە چەند کەسێک سنگیان دەرپەڕاندایە و ببوونایە بە مودیرعام و وەزیر؟"
ئـامە خـان سـەیرێکی سـەبریی خوشـکەزای کـرد و بە کـزییەکەوە گـوتی: "دە تـازەی مەکەنەوە، دڵـی خۆتـان سـەغڵەت مەکەن، خـوا گەورەیە ئیشـەڵڵا ئـاخری خێـر دەبێـت."
حەپسە خـان هەڵـی دایێ و گـوتی: "قـوڕ بە سـەرمان نەبێت، ئەم قسەوباسـانە بـوونەتە بنێشتە خۆشی ژێـر دانیـان، دە سـەڵەواتی لـێ بـدەن ڕاوەسـتن بـزانن خـوا چـی دەکـات."
حەپسە خان ویستی هەندێ دانیشتنەکە خۆش بکات و لەو قسەوباسـانەیان هـیچ نەبێت چەند سەعاتیک لەبیر خۆی و ئەوان بەرێتەوە، بۆیە بە پێکەنینێکی دەسـتکردەوە ڕووی کردە شیروان و حسێن و گوتی: "کوڕم ئێوە جـارێ ڕاوەسـتن، بـزانم عەلـی و کوڕەکـان باسـی شەوکەت ئاغا و ماڵ و منـاڵ و دەعوەتەکەیان بۆ کردوون؟" حسـێن قاقـایەکی لـێ دا گوتی: "وەڵا هەر بەسـەر پێوە شـتێکیان بـۆ گێڕاینەوە، توخـوا ئەگەر ئێوەش باسـمان بۆ نەکەن، بەڕاستی حەز دەکەم بزانم کە چی بووە و چۆن بووە."
خێڵ دانیشتنەکەیان گەرم بـوو، هەنـدێ خۆیانیـان بیـر چـووەوە و دەنگـی پێکەنـین بەیـن بەین بەرز دەبووەوە و دیار بوو کەوتبوونە گیـانی یەکە یەکەی مـاڵی شـەوکەت ئاغـا و

خانوو و قەسر و جلوبەرگیان، نەوبەهار پێکەنیی و گوتی: "کوا خۆ گوتیان ئیتر سەرتان لێ نابڕین و دەبێ هەمیشە هاتوچۆی یەکتر بکەین، کەچی ئەوەتەی عەلی و کوڕەکان گەڕاونەتەوە ئەمە مانگێ زیاترە هەر تەلەفۆنێکیشیان لەگەڵ نەکردین." سەبری لەسەرخۆ هاتە قسە و گوتی: "تەلەفۆن چاک دەکەن، ئێوەش چەند دڵپاک و فەقیر و خۆشباوەڕن، ئەوە ئەم نەوعە کەسانە هەموو شتێک بە حیساب دەکەن، ئەوە بۆیە کە عەلی و ئەوان هاتبوون وا بە گەرمی هاتن و خۆیان لێ نزیک کردنەوە تاوەکو ئاغا لای ساواک خۆی بەرێتە پێشەوە و قسەوباسیش لەمان دەبێنێت. دە بزانن ئێستاش چۆن شیروان و حسێن هاتوون، ئەگەر پەیا نەبوونەوە من هیچ نەبم." حسێن پێکەنیی و گوتی: "کوڕە بابە ئێمەی فەقیر چیمان هەیە تاوەکو قسەمان لێ دەربێنێت و بۆچی لەسەر ئێمە پەکی کەوتووە." سەبری گوتی: "ئێوە وادەزانن کە هیچتان نییە، بەڵام بۆ ئەو نەوعە خۆفرۆشانە هەر دانیشتنێکی سادە لەگەڵتان بۆ ئەوان شتە و هەر زوو ئەو دانیشتنە دەکەن بە ڕاپۆرت و دەیدەن بە ئاغاکانیان، بۆ ئەوەی جێی خۆیان خۆشتر بکەن و دەستکەوتیان زیاتر بکەن." سەبری چاوی گێڕا بۆ تۆفە و گوتی: "ئەوە کوا تۆفە، با بێت بۆتان باس بکات، تۆفە دەیگوت کە عەبدوڵڵا مهابادییەکەی ئاشنای پێی گوتووە کە شەوکەت ئاغا ئەوەندە لای ساواک لەپێشە، شاهەنشا دێیەکی تەواوی داوەتێ و بە خۆی و براکەی، دەیگوت کە عەبدوڵڵا گوتوویەتی کە حاسیلات و خێر و بەرەکەتی دنیایان دەست دەکەوێت لەو دێیە، بێجگە لە مانگانە و خەڵات و بەراتی تر کە لە ساواکی وەردەگرن." حسێن لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەڕاستی ئەم سەبرییەی خوشکم زۆر تێگەیشتووە و زۆرزانە، سەروسەکوتیشی لەوە ناچێت، ئەوەی بیبینێ وادەزانێ هەر خەریکی ماڵداری و چێشتلێنانە و هیچی تر."
چەند ڕۆژێک بوو کە حسێن و شیروان هاتبوونەوە، کە چێشتەنگاوێک ئاغای ڕەزائی هاتە سەرەوە بۆ لایان و گوتی: "گاگا حسێن..." بە فارسی قسەکەی بۆ تەواو کرد و گوتی: "تەلەفۆن لە دائیرەوە کراوە کەوا پێشمەرگەیەکی نەخۆشیان هێناوە بۆ تاران دایکیشی لەگەڵە و دەبێ دایکی بێتە ئێرە، بێزەحمەت یەکێکتان وەرن لەگەڵم تاوەکو بچین بەلایانەوە." ناوی پێشمەرگەکەشی پێ گوتن.
شیروان و حسێن گوتیان: "باشە ئێمە حازرین."
کە ئاغا ڕەزائی گەڕایەوە خوارێ، شیروان دەنگی نزم کردەوە و سەری بردە نزیک حسێن و گوتی: "چاوت لێیە ئەو کەڵەکچییە خۆی گەیاندە تاران." حسێنیش بە ئەسپایی وەرامی دایەوە و گوتی: "تۆ بزانە هەر یەکسەریش بردوویانە بۆ خەستەخانە." شیروان سەری با دا و گوتی: "زمانێکی پیوەیە مار لە کون دێنێتە دەر."

هەردوو حاجی بێسەبرانە سەیری یەکتریان کرد کە ئەمە چییە و ئەمە باسی کێ دەکەن؟

حسێن ڕووی کردە باوکی و مامی و کە زانیی بە پەرۆشەوە حەز دەکەن بزانن مەسەلەکە چییە و باسی کام کەڵەکچی دەکەن، بۆیە لەسەرخۆ گوتی: "هیچ نییە، دڵتان هیچ نەکات، ئەوە هەندێ برادەرمان کەڵکەڵەی هاتنە تارانیان کەوتووەتە سەرەوە و حەز دەکەن بێن بۆ تاران، دەوڵەتیش ناهێڵێت و دەڵێن دەبێ عوزرێکی زۆر بەجێیان هەبێت ئینجا ئیزنیان دەدەن کە بێن و ئەوەتا ئەمە یەکێکە لەوانە و بە ناوی پێشمەرگەشەوە هاتووە و لەسەر پێشمەرگە و ئێمە حیسابە و خۆیشی نە پێشمەرگەیە و نە هیچ." شیروان دەستی هەڵگڵۆفی و هەندێ نارەحەت هاتە پێشچاو و گوتی: "ئەوەتا بە هۆی چەند کەسێکی واوە ناوبانگی پێشمەرگەش خراپ دەبێت، ئێستا یەکێکی وەکو ئەم کابرایە کە بە ماڵ و منداڵەوە لەگەڵمان هاتووە و پەڕیوەتەوە ئەمدیو، شوێنەکەی خۆی بەجێ هێشتووە، ئێمەش دەبێ دڵی ڕاگرین و هەرچییەکی گوت بۆی جێبەجێ بکەین و هەر خراپییەکیش بکات لەسەر ئێمە حیسابە و ڕوو دەکاتە ئێمە، کەچی هێشتا ئەویش گلەیی دەکات و ناڕازییە، وەڵا چییە وەختی خۆی کە شۆڕش دەستی پێ کردووە و ئێمە هاتووین بۆ ناوچەکەی ئەوان ئەو یارمەتیی داوین و جێوڕێی پیشان داوین، ئیتر ئەمە بووە بە تەوق و چووەتە گەردنمان. باشە ئێمەش ئەوەمان لەبەرچاوە، بەسەرچاو هەرچییەک بڵێن بەپێی توانای خۆمان دریغییان لێ ناکەین. بەڵام بەینی خۆمان بێت هەندێ لەو کەسانە بە هیچ پڕ نابنەوە و هەمیشە داواکار و بەگلەیین." حسێن بە پێکەنییەوە گوتی: "وەکو مەسەلەی کابراکەمان لێ هاتووە کە دەڵێن ڕۆژێک ئاگر لە شوێنێک بەردەبێت لە یەکێ لە دێهاتەکان و کابرایەک لەو ناوە دەکەوێتە ناوی، لەپڕ یەکێکی تر بەوێدا تێدەپەڕێت و بە گورجی پەلاماری زەلامەکە دەدات و پڕی پیا دەکات و لە ناو ئاگرەکە دەری دەهێنێ و لەبەر ئەوەی زەلامەکە هەندێ دەست و قاچی دەسووتێت، کابرای پەلاماردەر کابرای زامدار دەکاتە کۆڵی و خەریک دەبێت بیباتە ماڵی خزمێکی لە دێیەکی تر، کابرای ڕزگارەکەر بەدەم ڕۆیشتنەوە لە زامارەکە دەپرسیت: 'چۆن بووم بۆت؟' زامداریش زۆر مەدح و سەنای دەکات و دەڵێت: 'تۆ؟ خوا لە ئاسمانەوە تۆی بۆ ناردم، تۆ هەر قارەمانێکی تەواوی.' چەند هەنگاوێکی تر دەڕۆن، دیسان کابرا لە زامدارەکە دەپرسیت: 'ئەگەر من نەبوومایە ئێستا چیت لێ هاتبوو؟' ئەویش بە گەلێ دووعاوە دەڵێت: 'دەپرسی چیم لێ هاتبوو؟ ئێستا بووبووم بە خەڵووز و سووتابووم.' بەینێکی تر دیسان لە کابرای دەپرسێت: 'باشە بەشکم من لەو کاتە بەوێدا تێنەپەڕیمایە، تۆ ئەوسا چیت بەسەر دەهات؟'

زامداری نەگبەتیش دیسان بەدەم ڕێز و مەدحەوە دەڵێت: 'کوڕە باوکم تۆ هەر باسی خۆت مەکە، هەرچی پاڵەوانیش هەیە لە بەرانبەر ئەم کردەوەیەی تۆ هەر دەبن بە پووشکە، تۆ نەبوویتایە ئێستا برژابووم و کوڵابووم.' بەینێکی تریش دەڕۆن، دیسانەوە کابرا ئاوڕ دەداتە کابرای سەر کۆڵی و دەڵێت: 'توخوا چۆن بووم بۆت؟' کابرای زامدار خۆی هەڵدەداتە خواریێ لەسەر پشتی و دەڵێت: 'هەی هاوار! لە ڕێی خوا بمبەرەوە فڕێمبدەرە ناو ئاگرەکەوە، شێت بووم! دڵم پچڕا! ئەوەندەم مەدح کردی بەسە بەسە بەقوربانت بم! بمبەرەوە ناو ئاگرەکە.'" هەموویان بەم قسەگێڕانەوەیەی حسێن دایانە قاقای پێکەنین.

حاجی مەجید بەدەم تەسبیحاتەوە گوتی: "ئاخر ئێو دەڵێن ئەوەش لەبەر ئێوە و بە هۆی ئێوەوە پەڕیوەتەوە ئەمدیو و هاتووە لەگەڵتان، دەبێ ئێوەش ئەوەتان لەبیر نەچێت." شیروان ڕووی کردە حاجی و گوتی: 'بەخوا ڕاست دەفەرموێت، هەندێ جار لە دەمی پێشمەرگەکان و خۆمان دەگرینەوە بۆ ئەو نەوعە کەسانە، بەڵام ئەو دووبەرەکییە ڕەوشت و خووی خەڵکی تێک داوە، دەڵێن لەودیو پارەدابەشکردن و لرفلێدانێکە نەبێتەوە، لەبەر ئەوە هەندێکی وا گێل و کەم بیروباوەڕ و حول حولی بیانوومان پێ دەگرن و هەر خەمی دەستکەوت و قازانجی خۆیانە."

ئەم جارە کاکە حاجی هەڵی دایێ و گوتی: "باشە ئێستا ئەم کابرایەی ئێوە باسی دەکەن، ماڵ و دێی خۆی بەجێ نەهێشتووە و شوێنتان کەوتووە و بە ماڵ و منداڵەوە، قازانجی لەوەدا چییە؟" حسێن بە زەردەخەنەوە ڕووی کردە مامی و گوتی: "دەفەرموون قازانجی چییە؟ جاریێ ئەمە خۆی نەخۆش خستووە و هاتووە بۆ ئێرە کەوا ئێستاش دەبێ بڕۆین بۆ لای. ئەم دوژمنایەتیی هەبوو لەگەڵ هەندێ خەڵکی ناوچەکەیان لەسەر ژنبەژن و ژنهێنان و لەبەر ئەوەی ئێمە بە پشتیوانی خۆی دەزانێ و لە ژێرەوە هەندێ دەستبڕین و بلۆفیشی لە خەڵک دەکرد، بێ ئەوەی ئێمە پێی بزانین، زۆریش چاولەدەرە، تاکو ئێستا چوار ژنی هێناوە، تەمەنیشی نەبووە بە پەنجا، حاڵی حازر دوو ژنی هەیە و لەگەڵی دەژین لە هەمەدان، لەگەڵ دایکەکەی و کۆشێ کوڕ و کچ، ڕاستە خۆی هەندێ نەخۆشە، بەڵام لەوێش دکتۆری چاکی لێیە، بەڵام ئەویش کەلکەڵەی هاتنی تارانی کەوتبووە سەر، چونکە زۆر باسی جێی ڕابواردن و کەیفی تارانیان بۆ گێڕابووەوە." حاجی بە سەرسووڕمانەوە گوتی: "ئێوە دەڵێن لادێییە، لە کوێ کەیف و ڕابواردنی تاران دەزانێت!" شیروان گوتی: "نەخێر خوێندەوارە و لە قەڵادزە و ڕانیە ژیاوە، بەغدا و موسڵی زۆر کردووە بە هۆی فەحسی تووتنەوە هەمیشە حاڵی باش بووە." حاجی پرسیی: "ئەی دایکی چییەتی؟" شیروان گوتی:

"دایکی لەگەڵ دوو ژنەکەی هەڵناکات، شەو و ڕۆژ شەڕ و قڕەیانە، دایکی تا ئێستا چەند جارێک تۆراوە و چووتە ماڵی پێشمەرگەکان، هەرچەندە چاوی بە یەکێکمان دەکەوێت دەگرییێت و دەڵێت خێریان دەگاتێ بمنێرنەوە بۆ ولات، من لێرە هەڵناکەم."
شیروان لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: "کاکە عەلییش پێی گوت کە ئەم جارە چوومەوە تاران لەگەڵ خۆم دەتبەم بۆ لای دایکم و پوورم و ئەوان، تاوەکو لەگەڵیان بچیت بۆ زیارەتی شەخس و ئیمام و پیر. ئیتر ئەوەیە، ڕەنگە بەرۆکی بەرنەدابێ بۆیە وا لەگەڵ کوڕەکەی ناردوویانە."
ئامە خان لەو کاتەدا هاتە ژووریێ و گوێی لە باسی ژنە میوانەکە بوو، گورج گەڕایەوە دەرێ و بە هەڵەداوان ڕای کرد بۆ لای خوشکی و کچەکان و بە خۆشییەوە خەبەری دانێ کەوا شکور ژنێک دێت بە میوانیان و لاشیان دەنوێت.
حەپسەخان دڵی خۆش بوو وەکو خوشکی و گوتی: "ئۆخەی یاخوا بەخێر بێت، ئاخۆ کێ بێت، تۆ بڵێی خەڵکی لای خۆمان بێت، بەشکەم بۆ خۆمان دوو قسە بکەین، وەختە شێت بین بۆ میوانێک." سەبری هەڵی دایە و گوتی: "پێش هەموو شتێک لە کوێ دەینوێنن؟" ڕووناک ڕاپەڕیی و بە گەرمییەوە گوتی: "کەس باسی ژووری من نەکات، تاقەتی پرخەپرخی کەسم نییە، من تاوەکو درەنگ گوێ لە ڕادیۆ دەگرم و شت دەخوێنمەوە و چراکەشم دەسووتێت." حەپسە خان دایە قاقای پێکەنین و بەدەم پێکەنینەوە گوتی: "ئەیەڕۆ خرپنی مەیموون ئینجا کێ باسی ژووری تۆی کردووە!"
ڕووناک پێکەنیی و گوتی: "چووزانم." حەپسە خان و خوشکی سەیری یەکتریان کرد هەروەک بە یەکتر بڵێن: "ئەرێ بەڕاست لە کوێ بنوێت؟ ژوورەکانیان هەموو خاوەنیان هەیە و هەریەکەشیان دوو سێ کەسی تیایە." نەسرین هاتە قسە و گوتی: "ئێوە جارێ ڕاوەستن بزانین ژنەکە کێیە؟ پیرە یان گەنجە؟ چەند لێرە دەمێنێتەوە؟ بەو پێیە مشووری ڕێوشوێنی بۆ بخۆن، کێ ناڵێت هەر شەوێک لێرە دەمێنێتەوە یان هەر ڕێبوارە و بێرەدا تێدەپەڕێت؟" ئامە خان بە خۆشییەوە گوتی: "ڕێبواری چی، خۆم بە گوێی خۆم گوێم لە حسێن گیان بوو، خواحافیزی بێت کە گوتی: 'دایکی پێشمەرگەیە و هاتووە بەینێ لەماڵی ئێمە دەبێت.'" خوشکی بە شەوقەوە گوتی: دەڵێی چی، بە ئاغای ڕەزائی بڵێین ئەم ژوورە بچووکەی تەنیشت ژووری دەستشۆرەکەی بۆ چۆڵ بکات، زۆر جار چاوم لێیەتی کە دەیکاتەوە هەر کتێبە شڕ و دوو سێ کارتۆن و هەندێ نوێن و پەتووی تیایە."
تۆفەیان بانگ کرد و خەبەرەکەیان دایە، تۆفە دوو سێ جار هاتە سەرێ و چووە خوارێ، ئەوەندەی پێ نەچوو ئاغای ڕەزائی و سمایل و کاوە و کامەرانی خزمیان هاتن

و کەوتنە شت بردنە خواریّ و ژوورەکەیان هەندیّ چۆڵ کرد. حەپسە خان و خوشکیشی کەوتنە پاککردنەوە و ڕێکخستنی.

* * *

حسێن و تۆفە و ئاغای ڕەزائی گەیشتنە خەستەخانەکە، خەستەخانەیەکی خنجیلە و پاکوتەمیز و تازە بوو، دەرگایەکی شووشەی زۆر تۆکمەی قایمی هەبوو، هەرسێکیان چوونە ژووریّ دیوار و ئەرزی خەستەخانەکە شەوقی دەدایەوە، لەملاولایەوە بە ئینجانەی گوڵ و گەڵای سەوز و جوان تەنرابوو و هۆڵەکە دەتگوت باخێکی بچکۆلەیە.

ئاغای ڕەزائی لە ڕێنیشاندەری پرسی و ناوی نەخۆشەکەی پیّ گوت، ئەویش پێی گوتن کەوا لە چینی سێهەم ژووری ٢٩یە. ئەمانیش شوێن یەک کەوتن و چوونە سەریّ، نێرس و کاربەدەست و ئیشکەری نەخۆشخانەکە لە هاتوچۆکردندا بوون. عەرەبانەی نانخواردن و دەرمانیان دەهێنا و دەبرد.

حسێن سەری سوورِما لەم خەستەخانە ڕێکوپێکە و لە دڵی خۆیدا گوتی: "تۆ بڵێی دوای هاتنی ئێمە، ئەم کابرایە تووشی شتێک نەبووبیّ؟ بەشەر چییە، وەکو دەڵێن لە گوڵ ناسکترە و جاری وا هەیە ژانێکی بچووکی تیژ زەلامێکی پتەوەی وەک پاڵەوان دەدات بە ئەرزدا و نیوەمردووی دەکات."

حسێن گەیشتە بەردەمی ژووری ٢٩، بەدەم ئەم خەیاڵانەوە سەرزەنشتی خۆی دەکرد کەوا لە بەیانییەوە لەگەڵ شیروان قسە بەم کابرایە دەڵێن و ئێستا دەترسێت بەڕاستی نەخۆش بووبێت.

چوونە ژووریّ، ژووری تایبەتی بوو، کابرا بیجامەی لەبەردا بوو و لەسەر جێگاکەی پاڵ کەوتبوو، نێرسێکی جوانکەلەش لای سەریەوە ڕاوەستابوو خوێنی دەپێوا، کوڕێکیش نانی بۆ دەخستە سەر مێزەکەی. هەروەها سەیریان کرد پیرەژنێکی جل کوردیی ڕەشپۆشی هەندیّ لاوازیش لەسەر کورسییەکی نەرم دانیشتووە تەسبیحات دەکات، سەربەستێکی بەستووە بە سەرییەوە بەقەد قولێنەیەک دەبێت.

دایک و کوڕ کە چاویان بەمان کەوت، زۆر دڵیان خۆش بوو و بە گەرمی کەوتنە چاک و چۆنی لەگەڵ هەموویان.

نێرسەکە لە ئیشەکەی بووەوە و ڕووی کردە میوانەکان و پرسیی: "کەسێک هەیە فارسی بزانێت؟" تۆفە پێش ئاغای ڕەزائی کەوت و گوتی: "ئەی چۆن!" ئاغای ڕەزائی لێی چووە پێشەوە و گوتی: "چیت دەوێت بیڵیّ ئێمەش تێیدەگەیەنین." نێرسەکە گوتی: "بێزەحمەت پێی بڵێن بەیانی سەعات نۆ دێین دەیبەین بۆ ڕونتکەن و هەندیّ

تـاقیکردنەوەی تـر و هەر کارێکیشـی بـوو لەم زەنـگەی ژێـر سـەری بـدا، یەکـێ دێ بە دەنگیەوە." خواحافیزی کرد و ڕۆیشت.
کابرای نەخۆش کە ناوی عوسمان بوو، بە ڕوویەکی خۆشـەوە ڕووی کـردە حسـێن و گوتی: "دوای ئێوە نەخـۆش کەوتـم، برادەران زۆریـان هەوڵـدا بـۆم، دکتـۆرەکەش مـاڵی ئاوا بێت کاغەزێکی جوانی بۆ نووسـیم کە پێویسـتم بە خەسـتەخانەی تـاران هەیە لەبەر بەردی زراوەکەم، خۆیشـم زۆر تێـک چووبـووم و گوتیـان بەینێـک لە تەگەرە و قـڕەی مـاڵ دوور بـکەوەرەوە." خـاتوو زبیـدەی دایکـی دەسـت و تەسـبیحەکەی ڕاوەشـاند و ڕووی کردە حسێن و ئەوانی تر و گوتی: "قوربـان ئەم وەزع و حـاڵە هەمووم‌انی تێک داوە، نەخوازەڵا عوسمانی من دایکی بمرێ، ئەو کۆشـە خێزانەشـت کەوتـووە بەسـەردا، لە مـاڵی ئـێمە منـاڵەوردکە چـاوی خەڵـک دەردەهێنێـت ئەوەنـدە هـار و بزێـون، خـۆ دایکەکانیشیان قەت پێیان نـاڵێن وا مەکەن، هەریەکەیـان لە ڕقی ئەوی تر، وەکو دەڵێن هەوێ سارییە." ئەم جارە خاتوو زبێدە ئاخێکی هەڵڕشت و گوتی: "ئاخ کوڕم ئاخ، چیت بە خۆت کـرد، چەنـد جـار پێم گوتیت بەقسـەت نەکـردم." کوڕەکەی پێکەنیی و گـوتی: "دایە ئەم قسانە چییە، جارێ واز بێنە با کـاکە حسـێن و ئەوان دانیشـن خـۆ هێشـتا هەر بە پێوەن."
حسێن لە دڵدا نارەحەت بوو و شڵەژا و ترسا لەوەی کە ئەمانە دەست بکەن بە قسـەی وا کە نـابێ لە بەرچاوی ئاغـای ڕەزائـی بکرێت، هەرچۆنێک بێت دانیشـتن و حسـێن بە سـڵەمینەوە کەوتە پـرس و باسـی نەخۆشـییەکەی و هەواڵـی برادەرانـی و هەواڵـی پێشمەرگەکان و ماڵ و مناڵی، لەوە دەچوو کە ئاغای ڕەزائی هەر زوو تاقەتی چووبێت، بۆیە هەستایە سەر پێ و گوتی: "من لە هۆڵەکەی خـوارەوە چاوەڕێتـان دەکەم." حسـێن ئاهێکی هاتەوە بەر و کە دیی کوڕەکە چـووە دەرێ، سـەیرێکی نەخۆشـەکەی کـرد و بە چرپە گوتی: "ئاگاتان لە دەمی خۆتان بێت، قسەی بە نەوعێک مەکەن لای ئەم کـابرایەی لەگەڵ ئێمەیە، چونکە پیاوی ساواکە، هەروەها ئەم خەستەخانەش هیی ئەوانە، کە ئێستا هـاتینە ژووری و گـوتم ئێرە چەنـد خـۆش و پـاک و ڕێکوپێکە، ئەو پێـی گـوتم کە هیـی دائیرەی ساواکە و تازە دروست کراوە." نەخۆشـەکە بەم قسـانە سـڵەمییە و دەنگـی نـزم کـردەوە و گـوتی: "کـوڕە وا مەڵـێ!" حسـێن گـوتی: ئەرێـوەڵا بـاش بـوو باسـی نەخۆشییەکەت زوو بڕییەوە و ناوی دکتۆرەکەت نەگوت، ئەگەرچی هەر دەیزانی کێیە."
کاک عوسمانی نەخۆش بە پەرۆشەوە ڕووی کردە دایکی و گوتی: "دایە گوێت لـێ بـوو کاکە حسێن چیی گوت، دەبێ زۆر ئاگات لە قسەکانت بێ." ئینجا قسەکەی تەواو کرد و گوتی: "ئەمە چییە لەم وڵاتە هەموو شتێک هەر سـاواکە، دەڵێیت دەوڵەت هەر خۆیـانن."

حسێن وەرامی دایەوە و گوتی: "ئەی چۆن، وەکو بیستم دەڵێن هەموو دەسگاکانی دەوڵەت بەقەد شەیتان ڕقیان لێیانە و ئەم ئیشانەی ئێمەش هەر خۆیان ئاگایان لێیە و جێبەجێی دەکەن و حەز ناکەن دەسگاکانی تری دەوڵەت پێی بزانن، ئاگات لێی نییە چۆن شوێن و ئوتێل و خەستەخانەی تایبەتی هەیە و لەو شوێنانەی خۆیان نەبێت ناهێڵن دابەزین." حسێن بە زەردەخەنەوە دەستی دا بەیەکدا و گوتی: "ئیتر بڵێین چی، چارمان نییە، ئەوەتا قسەشمان بیر چووەتەوە لەبەر ئەم سەگبابە، لە ترسی ئەو دەبێ قسەکانمان هەموو بە کێش و ترازوو بێت." تۆفە ئاخێکی هەڵڕشت و دەستی درێژ کرد بۆ دەرکی ژوورەکە و هەروەکو ئاغای ڕەزائی لەوێ ڕاوەستابێت، گوتی: "وەرە ئا ئەمە شەو و ڕۆژ بەسەرتەوە بێت و ئاغایەتیت بەسەرەوە بکات، دە توخوا ئەمە ژیانە ئێمەی تێکەوتووین!" خاتوو زبێدە وەک لە خوای ویستبێ کە ئەویش داخی دڵی خۆی هەڵڕێژێت، بۆیە بەدەست و تەسبیحەکەیەوە کەوتە شڵپەشڵپ کێشان بە سنگی خۆیدا و دەستی کرد بە گریان و گوتی: "یاخوا کافرەکانیش لە وڵات وماڵی خۆیان دوور نەکەونەوە و دەربەدەر نەبن." حسێن شڵەژا و کەوتە پاڕانەوە و گوتی: "بۆ خاتری خوا ئێرە نەخۆشخانەیە، ئێستا هەموویان دادەبارن بەسەرماندا وادەزانن کە شتێ قەوماوە." تۆفە، کە دیار بوو گریان و سنگکوتانی خاتوو زبێدە زۆر کاری تێکردبوو و برینی کولاندبووەوە، بۆیە بە ماتییەکەوە گوتی: "ئینجا لەمە زیاتر چیی تر بقەومێت." نەخۆشەکە لەسەر جێگاکەی هەستا و چووە لای دایکییەوە و دەستی خستە سەر شانی و بە پاڕانەوەوە گوتی: "بۆ خاتری خوا عەیبە، خۆ ئێرەش ماڵی خۆمان نییە. دە هەستە خۆت کۆ بکەرەوە تاوەکو لەگەڵ کاک حسێن بڕۆیت بۆ ماڵی ئەوان." خاتوو زبێدە چاوەکانی خۆی سڕییەوە و هەندێ هاتەوە سەرخۆ و بە مەلوولییەوە گوتی: "ئەی تۆ بە تەنیا دەمێنیت؟" کوڕەکەی بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "من بە تەنیای چیم، ئەوەتا دەبینی کە لەم شوێنە خۆشەدام و یەکێک دێت و یەکێک دەڕوات، ئیتر چی. خۆ ئیشەڵا گورگ نامخوات." حسێن ڕووی کردە کاک عوسمان و گوتی: "کەواتە ئیتر با ئێمە بڕۆینەوە، سبەینێ سەر دەدەینەوە و هەرچییەکت ویست تەلەفۆن بکە."

خاتوو زبێدە پەلاماری کوڕەکەی دا و چەند جارێک ماچی کرد و ئەوانی تریش خواحافیزییەکی گەرمیان لە یەک کرد و ڕۆیشتن.

* * *

خاتوو زبێدە لەسەر دۆشەکێک دانیشتبوو لە ژوورە بچکۆلەکەی بۆیان ڕێک خستبوو، ئامە خان لەم تەنیشت و حەپسە خان لەو تەنیشتییەوە، لە خۆشییاندا جێیان بە خۆیان نەدەگرت، وا دڵیان کرابووەوە و گوێیان لە قسەی میوانەکەیان دەگرت کە هەر لە

بووکەکـانیەوە پیـا هـاتبووە خـوارێ تـاوەکو کوڕەزاکـانی، بەتـایبەتی باسـی کـوڕە گەورەکەیانی دەکرد، کە چییان پێ دەکات و چییان بەسەر دەهێنێت و ئەگەر یەک شتی بچووک لە شتەکانی کەم بێت، چۆن ئەو هەموو منالانە دەداتە بەر شـەق و داروبەرد و ماڵەکە دەدات بەسەر یەکدا. هەروەها باسی مەنعەتەجەولەکەی ئەوسـاڵی بۆ دەکردن و بۆ دەگێڕانەوە کە شەو و ڕۆژێک نەدەبوو بچنە دەرەوە و چۆن ئەو کوڕە ڕقی گرتـووە و گوتـوویەتی هەر ئێسـتا هـێلکەوڕۆنم دەوێـت و هەرچەنـد لێـی پاڕاونەتەوە کە کـوڕە ڕۆڵە چاوت لێیە شارەکە بۆنی خوێنی لێ دێت، ئەمشـەو لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە تـا پیرەمێـردی نەوەد سـاڵیان نەهێشـتووە لە شـار و هەمـوو گیـراون و بـراون و کەس نازانێت چییان بەسەر دێنن، باوکەکەشتیان لەگەڵە، خاتوو زبێدە دەست و تەسبیحەکەی کێشـا بە سـنگی خۆیـدا و گـوتی: ئـای ڕۆڵە، ئەو کـوڕە چیـی پـێ کـردین، فەیقیڕانـد و فەیگوت من ئەوانە نازانم، هەر ئێستا هێلکەوڕۆنم دەوێت و چۆن دایکەکەی بە ناچاری و بە دزییەوە سەربانەوسەربان چووەتە ماڵی دراوسێ و هێلکەی بۆ پەیا کردووە."

ئامە خان گوتی: "وای خوا فرسەتتان بدات و خوا ڕەحمیش بەو منـاڵە بکـات و بیهێنێتە سـەر ڕێگـای ڕاسـت و هێمنـی بکـاتەوە. بـۆچی لە لادێ و لای ئێـوەش مەنـعەتەجەول هەبـوو؟" خـاتوو زبێـدە گـوتی: "قوربـان ئەوسـا لە لادێ نەبـووین، لە قەڵادزە بـووین، چـــونکە زۆربەی زســـتانان دەهـــاتینە ئەوێ لەبەر مەکتەبـــی منالەکـــان و هاوینـــان دەچووینەوە دێیەکەی خۆمان لەبەر تووتن و حاسڵات."

حەپسـە خـان و خوشکیشـی زوو زوو دەسـتیان دەدا بە سـنگی خۆیانـدا و هەر ئـاخ و ئۆفیان بوو، ئەوانیش دەکەوتنە باسی خۆیـان و مـاوەت و پەڕینەوە و ژیـانی ئێسـتایان، کە لە شار چییان بەجێ هێشتووە و لەوێ چۆن ژیاون.

سەبری و کچەکانی تر هەر کە دەگەیشـتنە یەک، دەیـانکرد بە چرپەچرپ و پێکەنین بە میوانەکەیـان و بە دایـک و پووریـان، کە چـۆن دڵیـان خـۆش بـووە و دنیایـان لەبیـر چووەتەوە لەبەر ئەوە میوانەیان. نەسرین دەیدایە پرمەی پێکەنین و دەیگوت: "کچـێ دایکم سەیران و گەشتی سەربانیشی بیر چووەتەوە لە خۆشیی خاتوو زبێدە."

کە حەپسە خان و خوشکی تاقەتیان دەچوو و هیلاک دەبوون و دەهـاتنە دەرەوە، ئینجـا تۆفە و کوڕەکـان دەچـوون بەدیـار خـاتوو زبێدەوە دادەنیشـتن، ئیتـر دەبـوو بە نـۆرەی ئەوان.

سـەبری لەبەر خـۆیەوە دەیبۆڵانـد و دەیگـوت: "وای قـوڕ بە سـەرم نەبێـت، ئەمە ئەم پیرێژنە چۆن هیلاک نابێت، وا چینێکی بێزار و گێژ کرد، وا چینـی دووەمیش چـوون و ئەو هەر قسە دەکات، ئەمە دەمی شل نەبوو، قورگی وشک نەبوو!"

تـۆفە و خـاتوو زبێـدە دەتگـوت بەربەرەکـانی لەگەڵ یەک دەکەن، ئەم لە قسـەیەکی دەبـووەوە، ئەوی تریـان گـوڕی دەدایە خـۆی سـەری ڕاز و حەکـایەتی دادەکوتـا. تۆفە هەمـوو حەکایەتە کۆنەکانی بۆ دەگێڕایەوە، لە باسـی چوونە عەسکەری و ناردنی بۆ ئەردەن و ئەو نـاوە و باسـی ژنە گۆرانیبێژەکەی کە عاشـقی بووبـوو و چۆن گۆرانیی بەسـەردا هەڵـدابوو، هەروەهـا باسـی ونبـوون و ڕێکـالێتێکچوونی تورکیـای و دوو خوشکەکەی، کە لە ئەسـتانبووڵ حەزیـان لـێ کردبوو و چۆن شـەڕیان لەسـەر دەکرد، هەموو ئەمانەی بۆ دەگێڕانەوە.
خاتوو زبێدە بە دڵ و بە گیان گوێی لێ دەگرت و هەندێ جاریش خەریک دەبوو بۆی بگـری، کە ئەگەر بەسـەرهاتەکانی تـۆفە بگەیشـتایەتە بـاس و شـوێنی دڵـتەنگکەرەوە. خاتوو زبێدە یەکەم کەس بوو کە بە هەموو هۆش و هەستی گوێی لە فیشاڵەکانی تۆفە گرتبێ و بێ ئەوەی هەر هـیچ نەبێت بەرەوڕووش ئەو کەسـەی پـێ بگیـرایە کە نەداتە پـڕمەی پێکەنـین، بەڵام لە دڵـدا هەر بڵێـت یـاخوا بە درۆ درێیـت فشـەکەری فیشـاڵکەر، لەبەر ئەوە تۆفە زۆر خاتری خاتوو زبێدەی دەویست و زۆر قەدر و حورمەتی دەگرت و ئیتر هەر بە دەوریدا دەهـات و داخوازییەکانی بۆ جێبەجێ دەکرد، بەوەی کە دایکی پێشـمەرگەیە و ئەویـش لێقەمـاوە، ئینجـا وەرە ئەویشـی بچێـتەوە سـەر کە حەز لە قسەکانیشـی بکـات و بە دڵ گـوێی لـێ بگـرێ و بڕواشـی پـێ بکـات. تـۆفە هەر ئەوەی مابوو کە خاتوو زبێدە بکاتە کۆڵی و بە ماڵەکەدا بیگێڕێت، سێ ژەمە وەختی نانخواردن سـینیی بـۆ دەبـردە ژوورەکە و دەیخسـتە بەردەمـی و پێـی دەگـوت: "پەلە مەکە و لەسەرخۆ و بەئارەزوو نانەکەت بخۆ." بە خەڵکی ماڵەکەشی دەگوت: "ئەو بەسـەزمانە لە بەردەم و دانـی زۆر لەسـەرخۆ نـان دەخـوات بـۆیە کەس نەچێتە سـەری بـا شـەرم نەکات."
دوای هاتنی خاتوو زبێدە بۆ ماڵی حەپسە خان و ئەوان، دوو هەفتە شیروان و حسێن لەگەڵ کوڕی خاتوو زبێدە گەڕانەوە بۆ هەمەدان بۆ نـاو پێشـمەرگەکان، لە دوای ئەوەی عوسـمان عەمەلیـات کـرا و ئەوەنـدەی کـانی بەردینەیەک بەردیـان لە زراوی دەرهێنـا و لەو ماوەیەشدا حسێن و شیروان زۆریان خزمەت کرد و هەر لە دڵیان دەرنەدەچوو کە لە دڵی خۆیاندا سەزەنشتیان کردبوو لەبەر ئەوەی داوای هاتنی تـارانی کردبـوو، کەچـی تـارانەکەش وای لـێ هـات و لە خەسـتەخانە و دوو ڕاسـتە جـادەکەی مـاڵی ئەوان زیـاتر چاوی پێ نەکەوتبوو، بەڵام خاتوو زبێدەی دایکی لای حەپسـە خـان و ئەوان مـایەوە و گوتی: "لێرە دڵم دەکرێتەوە." ئەوانیش زۆریان پێ خۆش بوو.

* * *

دوای ماوەیەک خاتوو زبێدە داوای چوونە سەر مەرقەد و زیارەتی ئیمامەکانی کرد، ئەمەش زۆر ئاسان بوو، چونکە هەر یەک قسەی بدایە بەر گوێی تۆفە ئیتر تەواو مۆر دەکرا و بۆی جێبەجێ دەکرا. لەبەر ئەوە تۆفە کەوتە هەڵپەهەڵپ و لەگەڵ ئاغای ڕەزائی ڕێکی خست کە فێریان بکات چۆن بڕۆن بۆ شاری قووم و لەوێ بچنە سەر قەبری حەزرەتی مەعسوومە، چونکە ئەوێ نزیکترین شوێنە بۆ تاران.
ئاغای ڕەزائی لەبەر ئەوەی شارەزای ماڵ و خێزانی حەپسە خان و ئەوان بووبوو کە چەند ماڵێکی بەحورمەت و بێ فرت و درۆودەلەسەن، لەبەر ئەوە ئیتر ئەویش چاوی لەوە پۆشی بۆ کوێ دەچن یان ناچن. بۆیە تۆفەی فێر کرد کە سواری چ پاسێک ببن تاوەکو دەگاتە ئێستگەی پاسەکانی تی بی تی و لەوێشەوە یەکسەر سوار دەبن بۆ قووم.
حەپسە خان و خوشکی و خاتوو زبێدە خۆیان ساز دا، لە شەویشەوە کەوتبوونە خۆیان، دەتگوت دەچن بۆ سەفەری قەندەهار. بەیانی زوو چایەکیان خواردەوە و بەشی خۆیان وەک یاپراخ پێچایەوە و لوول دا و شوێن تۆفە کەوتن، کچەکانیش بەدوایانەوە بوون تا بەردەرکی حەوشە و هەریەکەیان نەسیحەتێکی دەکردن، کە لەچکی باش بکەن و وریا بن سەرمایان نەبێت.
ئامە خان لەبەر ئەوەی دڵی تێک دەچوو لە ناو ئۆتۆمبێلدا، دوو سێ کیسە و پەڕۆ و شتی وایان دایە دەستی و خواحافیزییان لە یەک کرد، ئەوان ڕۆیشتن و ئەمانیش گەڕانەوە ماڵێ.
سواری پاس بوون، گەیشتنە ئێستگەی تی بی تی، تۆفە دابەزیی و ئەوانیش بە دوایەوە. تۆفە سنگی دەرپەڕاندبوو، زوو زوو نەسیحەتی ژنەکانی دەکرد و دەیگوت: "وەرنە لای یەکەوە، لە یەک جیا مەبنەوە، تاوەکو دەچمە ڕیزەوە و بلیت دەبڕم." تۆفە لە ڕیزەکەشدا هەر ئاوڕی لێ دەدانەوە و ئیشارەتی بۆ دەکردن و دەتگوت سێ منالی بچووکی جێ هێشتووە و تاوەکو ئەو بلیتەکان دەبڕێت یەکێک دێت دەیانڕفێنێت.
ئاخری بلیت بڕا، تۆفە پێش خەڵکەکە کەوت و گوێی نەدایە پرتەوبۆڵەیان و بە پەلە چوو لە پێشی پێشەوە چوار جێگای گرت و لەوێ ڕاوەستا و لە پەنجەرەی پاسەکەوە بە پەلەپرووزی دەستی ڕاوەشاند بۆ حەپسە خان و ئەوان و گوتی: "خێرا بکەن وەرن، خێرا."
ئەوانیش هاتن لەگەڵ ورووژمی خەڵک و هەر زوو لەو جێگا باشانەی تۆفە دەستنیشانی کردبوون دانیشتن، خەڵکەکەش دامەزران، ئۆتۆمبیلچییەکە شریتێکی خستە ناو ڕیکۆردەری ئۆتۆمبێلەکە و خستیە کار و دەنگە خۆشەکەی مەهەستیی لێ بەرز بووەوە و ئۆتۆمبێلیش کەوتە گەڕ، خاتوو زبێدیش لەبەر خۆیەوە کەوتە هاواری شاهی نەقشبەند و غەوسی

گەیلانی و حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ و شێخ عیسا و شێخ مووسا. ئامە خانیش کەوتە ئایەتەلکورسی خوێندن و فووکردن بەسەر هەرچواریاندا. ئۆتۆمبێل کەوتە ناو شەقامە قەڵەباڵغەکانی تاران، جار دەڕۆیشت و جار لەبەر چرا سوورەکان ڕادەوەستا.
خەریک بوون لە شار دەردەچوون کە ئامە خان سەری هێنایە نزیک خوشکی و گوتی: "یا ڕەسوڵەڵا هاوار، بەخوا زۆر لە لێخوڕی ئەم پاسە ترساوم." حەپسە خان بە سەرسووڕمانێکەوە گوتی: "بۆ؟" ئامە خان عەباکەی بە چاکی لە خۆی پێچایەوە و لایەکی دەموچاویشی داپۆشی و بە چرپەوە گوتی: "ئەوەتەی سوار بووین چاوم لێیەتی لەتاو ئەو ژنەی دەستەڕاستمان ئاگای لە لێخوڕینەکەی نییە و هەر ئاوڕی لێ دەداتەوە و خەریکی چاوبڕکێیە لەگەڵی."
تۆفە بە پەرۆشەوە سەری هێنایە نزیکیانەوە و گوتی: "ئەوە چیتانە؟" ئامە خان بۆ ئەویشی گێڕایەوە، تۆفە گوتی: "وەڵا ڕاست دەکەیت، خۆیشم ئاگام لێیانە، ژنەکە تەواو نییە و لە بەدخووەکان دەچێت، من پێش ئێوە هاتم هەر زوو کابرا ئەو جێگایەی داێی و ئیتر هەر خەریکی چرپەچرپ بوون." ئامە خان بە ژێر لێوەوە گوتی: "ئۆە ژنەکە بەپەنگ بی، چاوت لێیەتی هەر بە ئاشکرا شەڕ بە پیاوەکە دەفرۆشێت و خەریکی چاوبڕکێیە لەگەڵی لە ژێر چادرەکەیەوە، سەیری بکەن چەند جوان و تەڕو تۆڵیشە، دە بڵێ بەپەنگ بی بۆچی شوو ناکەیت بۆ خۆت، وەڵا هەزار کەس منەت دەبات مارەت بکات، ئەوە باشتر نەبوو ئێستا خانمی ماڵی خۆت بوویتایە." حەپسە خان بە گەرمییەوە گوتی: "کچێ خوشکم ئێمە هەقمان چییە بەسەریانەوە، چاویان دەردەهات، خۆ ئینشەڵا نابین بە پاسەوانی خەڵک، خوای دەکرد ئێستا دەچووە کۆشییەوە." لە ژێر عەباکەیەوە بە ئەسپایی پێکەنیی و گوتی: "دە توخوا بزانە مێشکی خۆی بە چییەوە خەریک دەکات، ئەوە گوتمان هەندێ لە مەراق و خەفەت ڕادەکەین." ئامە خان هەڵی داێی و بە ترسەوە گوتی: "کچێ دەترسم لێخوڕەکە هۆشی لای لێخوڕینەکەی نەمێنێت لەتاو ئەم بەیتەشەیە و بەڵایەکمان بەسەر بێنێت." تۆفە گوتی: "گوێی مەدەرێ، ئەجەل بەدەست خوایە، ئەم لێخوڕی پاس و ماسانە فێرن و لە هەموو چیزەییێکن، هەندێکیان لە هەر شارە ژنێکی هەیە، بە زۆری وا بەدخوون." ئەمە خان بە کەساسییەوە گوتی: "ئیتر بڵێین چی پەنا بە خوا."
باش بوو خاتوو زبێدە لەتاو دووعاخوێندنی خۆی و هاواری شێخ و مەشایخ ئاگای لەم مشتومڕەی ئەمان نەبوو، ئەگینا ئەویش دەیکرد بە هەرا، چونکە ئەوەندە ترسابوو دەتگوت سواری باڵی سیمرغ بووە و دەیبات بەرەو ئاسمانی حەوتەم وەکو دەڵێن.

* * *

ئۆتۆمبێل شـەقام و بیابانی هەڵدەپێچا لە ژێر چەرخ و ڕەورەوەکانی خۆیدا، ئەمـانیش گوێیان شل کردبوو بۆ زانیاری و عیلم و مەعریفەتی تۆفە، کە ئەم باخە گەورەیە هیی کێیە و ئەمەیان هیی چ خزمێکی شایە و چۆن ڕۆژانی جومعە شا بە ماڵ و منداڵییەوە دێنە ماڵی ئەم خزمەی و ئەو کۆمەڵە لەوح و تەختانەی لە دەرەوە دیارن ئەو شـوورەی حەوشـەی مەیـدانیکی زۆر گەورەی سەوزیفرۆشـییە، کە هەمـوو شـتیک بە سـندووق و کارتۆن و فەردە دەفرۆشن.

تۆفە گـوتی: "ئـای چەنـد خەیـاری ورد و جوانی لێیە و ترۆزیـی بەڕولە کە هەر مـاڵی ترشیاتن، دەلوبیبەری وەهای لێیە کە خەڵک هەر بە ڕووتی حەز دەکات بیخوات، ترێ، هەنـار هەر باسـی ناکرێـت، پیـازی وای لێـیە کە بە فەردە دەیفرۆشـن، سـەلکی بەقەد کاڵەکێک دەبن، شیرین شیرین، دەڵێی خەیارن، بێجگە لە پیازی مۆر و سـوور و هەمـوو نەوعە شتی تر." ئامە خان هەندێ تێک چووبوو لەبەر بۆنی بەنزینی پاسـەکە، هەروەهـا وەکـو تـۆزێ لەوەوپێشـیش لـووتی خـۆی گرتبـوو، گوتبـووی: "وەی بـاوکەڕۆ بـۆگەنی قاچی ئەم پیاوانی نزیکمـان ئەوندەی تر گێژ و کاسـی کـردم." لەبەر ئەوە کە گوێی لە باسی ترشیات و ئەو هەموو میوە و سـەوزییە جوانـانە بـوو، وەکو شـتێک دەمـی ئـاوی کـرد و ئـارەزووی قـومێ ئـاوی ترشـیاتی بە سـرکەی ترێـی ڕەشـکەگیراوی پـڕ لە فەریـکەقەزوان کـرد، بـۆیە ڕووی کـردە تـۆفە و گـوتی: "ئەوە ناکرێـت کە گەڕایـنەوە ڕاوەستین و هەندێک لەو  شتانە بکڕین، بەشـکەم بـۆ خۆمـان هەندێ ترشـیان دروسـت بکەیـن." تـۆفە مژێکـی لە جـگەرەکەی دا و یەک دوو جـاریش کـۆکی و بەدەم کـۆکە و فرمێسکسڕینەوە و لەبەر دووکەڵی جگەرە و کۆکەکەی، ئینجـا گـوتی: "نەوەڵا نـاتوانین، ئەم پاسـانە وەکـو شـەمەندەفەر وان لە ئێسـتگە و چایخـانەی تـایبەتی خۆیـان نەبـێ ڕاناوەسـتن، هەروەهـا کە گەڕاشـینەوە شـەو دەبێـت و دوکـان و بـازاڕ تـا ئەو وەخـتە نامێنێت، بەڵام خەمت نەبێت کە گەڕاینەوە ڕۆژێک لەگەڵ کـاک عەبدوللا دێین و چیتـان وەیست پێم بڵێن ئەوسا بۆتان دەکڕم."

حەپسـە خـان سـەری سـووڕما لەم گـۆڕین و قسەلەسـەرخۆکردنەی تـۆفە، چـونکە دەیناسیٚ کە ئەگەر ئەوان هەر قسـەیەکیان بکردایە و باسـی هەر شتێکیش بکەن، تۆفە بەبێ مەحکەمە و بەبێ پیاهەڵشاخین وازی لێ نەدەهێنان و ئەوە بووبوو بە بەشێک لە ڕەوشـت و خـووی تۆفە و ئەمـانیش بە هەمـوو ڕەزامەندییەوە ئەو قرە بەسـەرکردن و پیاهەڵشـاخینەیان قبـووڵ دەکـرد و نازیـان دەکێشـا. تـۆفە خۆیشـی زۆر چـاک ئەوەی دەزانی کە ئەویش چەند خۆشی دەوێن و هەموو دنیا و خۆشیی ئەو هەر ئەمانن، بۆیە ئەویش بە ئارەزووی خۆی و بە پشتئەستووری ڕەفتاری لەگەڵ دەکردن.

ئەو ڕۆژە تۆفە وەکو شتێک دڵی بە حەپسە خان و خوشکی و میوانەکەیان سووتا و هەوڵی دەدا کە تا پێی بکرێت دڵیان ڕاگرێت، بەتایبەت کە پیاو و لێپرسراو و چاوساغیان بوو لە سەفەرەکەدا.

* * *

نزیک شاری قووم بوو، لە دوورەوە گومەز و مەنارە دەرکەوت، خاتوو زبێدە هەر چاوی بە مەنارە و گومەز کەوت بە یەک شریخە گوتی: "ئەڵاهومەسەڵی عەلا سەیدینا وە حەبیبنا محەمەد." کەوتە زیکر و لائیلاهە ئیلەڵلا. هەروەکو شتێ حاڵی لێ هات و سەری گەرم بوو، سەرە سەبەتە قوڵبنەکەی لەسەر داماڵرا و کەوتە حەی ئەڵا و پەلکوتان و سەرڕاوەشاندن، خەڵکی پاسەکە زۆریان سەریان گەرم بوو و بە چاوێکی پڕ خۆشەویستییەوە ئاوڕیان لێ دەدایەوە و ئەوانیش کەوتنە سەڵاواتلێدان و یاعەلی و یاکەربەلا، ناو پاسەکە بە جارێک شێوا.

ئامە خان زەندەقی چوو، ترسا لەوەی خاتوو زبێدە شتێکی لێ بێت، حەپسە خان و تۆفە هەر بەوە دەگەیشتن کە ئاگایان لێ بێت و عەباکەی لەسەر لانەچێت و سەری بەر کورسی و قەراغە ئاسنی پاسەکە نەکەوێت.

ئاخری هەرچۆنێک بوو گەیشتن و پاسەکە ڕاوەستا، خاتوو زبێدەش هاتەوە سەرخۆی. خەڵکی پاسەکە بە پەرداخە ئاو و پەرداخە شەربەتەوە هەموو بەسەریاندا دارژان، یەکێ عەباکەی ماچ دەکرد، ئەوەی تر دەستی ماچ دەکرد، ئیتر خاتوو زبێدە و تۆفە و حەپسە خان و خوشکی نەکەوتنە سەر ئەرز.

هەموویان دابەزین و سەیرێکی دەوروبەری مەرقەدەکەیان کرد، کە هەمووی دوکانی جۆراوجۆری بە ئەلەکتریک و گڵۆپی سەوز و سوور ڕازاوەی خۆش خۆش بوون، کە زۆریان دوکانی شەربە و گۆزەی نەقشکراو لەگەڵ سەدەها گوڵدان و ئاوێنە و شتی ڕازاندنەوەی ماڵ و سەرتاق و سەرمێز بوو، کە زیارەتکەران دەیانکڕی بۆ موفەڕک و دیاری. زۆری ئەو شتانەش کاری دەستی بوون و زۆریش جوان بوون.

بێجگە لەو دوکانانە چەندەها دوکانی کوتاڵ و شیرینیفرۆشی لێ بوو، شاری قووم ناوبانگی دەرکردبوو بە نەوعە شیرینییەک کە پێیان دەگوت سوهان، بە ڕۆنی ڕاستی حەیوانی دروست دەکرا. هەروەها لە دەروپشتی مەرقەدەکە چەند چێشتخانە و کەبابخانەی گەورە گەورەشی لێ بوو بۆ زیارەتکەرەکان.

لە دوای چاوگێڕان بەو دەوروبەر و قەڵەباڵغییەدا، تۆفە ژنەکانی پێش خۆی دا و چوونە حەوشەی مەرقەدەکە. حەوشێکی گەورەی فراوانی خۆش بوو، حەوزێکی ئاوی زۆر گەورە لە ناوەڕاستیدا بوو و لە هەموو لایەکەوە بۆریی ئاوی لێ دەهاتە خوارەوە.

خەڵک لە دەوری حەوزەکە خەریکی دەستنوێژگرتن و خۆئامادەکردن بوون بۆ نوێژ، دەوری حەوشەکەش هەیوان و تارمەی زۆری لێ بوو، کە خەڵک بتوانن لەو شوێنانە نوێژ بکەن و پشوو بدەن.

حەپسەخان و ئەوان هەندێ بە دەوری حەوشەکەدا سووڕانەوە و سەیری هەموو ئەو قەڵەباڵغییەیان کرد، تۆفە ڕای گرتن و گوتی: "دەڵێن چی جارێ بچین لە یەکێ لەو چێشتخانانەی ئەم ناوە نانێک بخۆین و پشوویەک بدەین، یاخود دەتانەوەێ جارێ بچن زیارەت بکەن." حەپسە خان ترسا لەوەی کە بە چوونەناو مەرقەدەکە، دیسانەوە خاتوو زبێدە حاڵی لێ بێت و تووشی هەڵا و بەزم ببن و تاوەکو بێتەوە سەرخۆ زۆریان پێ بچێت و ئێستاش نیوەڕۆیە و نزیک سەعات یەکە، خەریکن برسیان دەبێت، بۆیە ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "وەڵا من دەڵێم جارێ با بڕۆین پشوویەک بدەین و شتێک بخۆین و چایەک بخۆینەوە، بۆ ئەوەی کە چووینە ژووری مەرقەدەکە پەلە نەکەین و بە کەیفی خۆمان بێینە دەرەوە." لەوە دەچوو کە ئەوانی تریش هەر ئەو بیرەیان کردبێتەوە، بۆیە هەر گورج تۆفە گوتی: "زۆر باشە کەواتە پێش بکەون با بڕۆین."

* * *

لە چلە و کەبابخانەیەک بەو قەڵەباڵغییە تۆفە توانیی مێزێکی چوارنەفەری پەیدا بکات، کە زۆری خەڵک ڕیزیان بۆ گرتبوو، ژنەکانی دانیشاند و خۆی بە پێوە ڕاوەستا، لە بەردەم کورسییەکەیەوە و "ئاغا ئاغا" و ئیشارەت و بانگکردنی شاگردەکان، یەکێکیان هات بە کاغەز و قەڵەمەوە.

تۆفە وا مشەوەش بووبوو دەتگوت خەریکی کڕین و هەڵبژاردنی ئاخۆ چییە، بە دەست و بە ئیشارەت و بە فارسی و بە کوردی تێکەڵکردن کابرای تێگەیاند کە چی و چییان بۆ بێنێت دوای ئەوەی لە ژنەکانی پرسی کە چی دەخۆن.

شاگرد داواکانیانی نووسی و ڕۆیشت و ئەوەندەی پێ نەچوو، دۆلکە ماستاو و کولێرە و قاپە سەوزی و ترشیاتیان خرایە بەردەم تاوەکو خواردنەکانیان بۆ بێت.

تۆفە کەوتە پاروودروستکردن بۆ خۆی و لە کولێرە و سەوزە و پیاز و ترشی سماقیشی پێوە کرد و کردی بە بابۆڵە و پەرداخێ ماستاویشی بۆ خۆی تێکرد و کەوتە قەپاڵ لە پاروو گرتن و خواردن.

ئامە خان گوتی: "ئا تۆزێ لەو ترشیاتەم بدەرێ تاوەکو هەندێ دڵم بێتەوە سەرخۆ."

ئەویش کەوتە پاروودروستکردن و مڵچەمڵچ لە ژێر عەباوە.

خاتوو زبێدە حەزی لە تەڕەتیزە و کەوەر کرد ئەویش کەوتە پاروودروستکردن، حەپسە خان لایەکی دەموچاوی خۆی بە عەباکەی داپۆشیی و پێکەنیی و گوتی:

"ئەیەڕۆ خۆ وا بڕوات خۆتان تێر دەکەن، کەواتە ئەو شتانەی ترتان بۆ چی بوو!" تۆفە بە گووپی پڕەوە گوتی: "بڵێم چی، وەڵا زۆر برسیمە، بەیانی لە ماڵەوە هەر دوو چای ڕووتم خواردەوە." ئامە خانیش هەر چاوی دەگێڕا بەدوای کوڕە شاگردەکاندا، دوایش گوتی: "ئەوە چییان کرد، خۆ هەر قاپیان بە دەستەوەیە بۆ ئەم و ئەوی دەبەن، کەچی هەر نەهاتن بەلای ئێمەوە." تۆفە گوتی: "ئاخر بە نۆرەیە، ئەوان پێش ئێمە هاتوون بۆیە." تۆفە خۆیشی پەلەی بوو، ئەویش چاوی دەگێڕا کە کەی بۆ ئەوانیش دێنن، بەتایبەتی کە بۆنی کەبابی خەڵکی دەوروبەری کاس کردبوو و هەموویان بە گەرمی خەریکی پاروگلاندن بوون، ئەوەندەی پێنەچوو کوڕێکی شاگرد بە سینییەکەوە هاتە لایان و یەکی قاپێکی پڕ لە برنج و دوو کەبابی گەورەی لەسەر لەگەڵ یەک شیش تەماتەی برژاویان خستە بەردەمیان لەگەڵ قاپێک لە کەرەی پاکەتی بچووکیش، خاتوو زبێدە پێش هەموویان هەڵی دایێ و گوتی: "ئینجا ئەمە چۆن بە ئێمە دەخورێت، هەر قاپە بەشی دوو کەسە." تۆفە قۆڵی لێ هەڵماڵی و پەلاماری قاپەکەی دا و یەک دوو پاکەت کەرەشی کردەوە و خستیە سەر برنجەکەی و بە پەلە گوتی: "جارێ بخۆن وەختی قسە نییە."
هەموو سەرقاڵی نانخواردن بوون و لە دوای تۆزێک هەر ئەوەندەیان زانی کە یەکی هەندێ برنجی ڕووت بەولاوە هیچ لە بنی قاپەکەیان نەماوەتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی دەیانگوت: "ئەیەڕۆ ئەمە بە کێ دەخورێت، ئەوەندە زۆرە."
جەماعەت لە دوای ئەوەی ماستاو و چای گەرمیشیان کرد بەسەردا، ئیتر مڕ بوون و تاقەتیان نەبوو هەستنە سەر پێ.
تۆفە جگەرەیەکیشی خستە بەینی لێوی و لە دوای دوو سێ مژی چاک هەستایە سەر پێ و گوتی: "دەی ناوی خوای لێ بێنن، ئیتر هەستن درەنگە."

* * *

ژنەکان لە دوای ئەوەی لە حەوشەی مەرقەدەکە چوونە شوێنی ژنان بۆ نوێژکرتن، هاتنەوە لای تۆفە کە لە سووچێکی زۆر نزیکی شوێنەکە چاوەڕێی دەکردن، هەموویان چوونە بەردەمی ئەوەی پێڵاوەکانیان بۆ هەڵگرێت و پێڵاوەکانیان دایە دەست کابرا، ئەویش ژمارەیەکی دایە دەست تۆفە و هەموو چوونە ژووری.
ژوورەکە دەتگوت چراخانە، مەرقەدەکە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو، شورایێکی زیوی بە چواردەوریدا گیرابوو و وەکو ژوورێکی بچکۆلە، بەڵام پەنجەرەکە وەکو پەنجەرە خان بوو بۆ ئەوەی خەڵک بتوانێ قەبرەکە ببینێ، قەبرەکەش بە چەندەها پارچەی سوورمە و قەدیفەی نایابی گرانبەها داپۆشرابوو، بۆنی گوڵاو و بخوور ئەو

ناوەی پڕ کردبوو، ئەو ژووره پانوبەرینەی کە لە هۆڵێکی گەورەی سەدەها نەفەری دەچوو، ئەرزەکەی بە فەرش و قاڵیی هەره گرانەکانی ئێرانی داپۆشرابوو.
حەپسە خان و ئەوان بەپێی نەسیحەتی تۆفە هەوڵیان دا کە بتوانن بە یەکەوە بن و نەهێڵن کەس بکەوێتە بەینیان تاوەکو لە یەک جیا نەبنەوە، هەرچۆنێک بوو بە پاڵەپەستۆ خۆیان گەیاندە شوورای مەرقەدەکە، ئامە خان توند پەنجەرە و شوورەکەی گرت و ڕای وەشاند و سەری پێوە نا و بەدەم فرمێسکەوە پاڕایەوە و گوتی: "یا ساحیبی ئەم مەرقەدە، تکامان بۆ بکە لە خوای گەورە کە ڕەحممان پێ بکات و دەرووییێکی ڕەحمەتمان لێ بکاتەوە، کە بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان و ئاوێک بکات بەم ئاگرەدا و ئاگای لە مناڵەکانمان بێت." ئامە خان دڵی گەرم بوو، ئیتر پیا هات و کەوتە دووعاکردن بۆ پێشمەرگەی کوردستان و بۆ خزم و کەس و ئاشنای و هەموو خەڵکی سلێمانی و هەرچی کورد هەیە. ئامە خان هەر ئەوەندەی زانی وەک لافاو ورووژمی خەڵک بەسەردا هات و خەریک بوو ببێت بە ژێر دەست و قاچەوە. کە ئاوڕی دایەوە نە تۆفە و نە خوشکی و نە خاتوو زبێدە دیار بوون، ئامە خان دووعاکانی لە گەروویدا گیری خوارد و سڕ بوو لە ترسدا و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئای قوڕ بە سەرم نەبێت، ئەرێوەڵا لە یەکتری گوم بووین! ئینجا لە ناو ئەم قیامەت و حەشرەدا چۆنم بۆ دەدۆزرێنەوە هەی هاوار هەی!" بە هەرچی چۆنێک بوو گوڕی دایە خۆی و خۆی لە ناو دەست و پاڵەپەستۆی خەڵکەکە ڕزگار کرد و چوو خۆی گەیاندە پەناییێکی هەندێ چۆڵ کە زۆر کەس لەملاولای بڵاو بووبوونەوە، هەندێ نوێژیان دەکرد، هەندێ خەریکی دوعا بوون و هەندێ بەدیار کەسی نەخۆشیانەوە دانیشتبوون، کە هێنابوویانە سەر مەرقەدەکە، ئامە خانیش چووە لایان و پشتی نا بە کۆڵەکەیەکەوە و بە دڵێکی داخورپاوەوە چاوی گێڕا بە ناو خەڵکەکەدا.
تۆفە و ئەوانیش لە لایەکی ترەوە سەری دنیایان لێ هاتبووە یەک و بۆ ئامە خان دەگەڕان و زۆر شڵەژاو و ترسابوون، کە لەپڕ خاتوو زبێدە بە پەرۆشەوە دەستی درێژ کرد و بە خۆشییەوە گوتی: "ئەرێوەڵا ئەوەتا ئامە خان لە پەنا ئەو کۆڵەکەیەدا ڕاوەستاوە! بە کراس و سەرپۆشەکەیدا دیارە کە ئەوە."
هەموو بە هەڵەداوان چوون، کە سەیر دەکەن ڕاست ئامە خان خۆیەتی. تۆفە بووبوو بە فیشەکەشێتە، ئەوەندە شڵەژاو و دەستەپاچە بووبوو. بە تووڕەییەکەوە گوتی: "ئەی من نەمگوت لێمان دوور نەکەویتەوە، ئەوە تۆ بۆ کوێ چوویت؟! نوێژ و دووعاکانت حەوت شەو و حەوت ڕۆژن قەت لە بڕانەوە نایێن." ئامە خان فرمێسکەکانی سڕییەوە و گوتی: "بڵێم چی چووزانم، سەرم نابوو بە پەنجەرەکەوە و خەریکی دووعا بووم، کە

سەرم بەرز کردەوە ئێوە لە جێی خۆتان نەمابوون." حەپسە خان ڕەنگی هەڵبرزکابوو، شپرزە بووبوو لەبەر خوشکی بە پەرۆشەوە گوتی: "هەر ئەوە ئاقڵێت کرد لەو پەنایە ڕاوەستاوی، خەڵک کە گوم بوون لە یەک هەق وایە کە لە شوێنێک ڕاوەستیّ، ئەگینا ئەگەر بڕوات بۆ ئەوانەی تر بگەڕێت و ئەوانی تریش بە لایەکی تردا بڕۆن قەت یەکتر نادۆزنەوە." تۆفە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "ئەگەرچی هەر زوو دەدۆزرایتەوە، بەڵام ترسام و گوتم زمان نازانێت نەوەکا کەسێک فێڵێکی لێ بکات، لەم شوێنە قەڵەباڵغانە دز و گیرفانبڕ و ساختەچی زۆر زۆرن، دەبێ خەڵک وریا بێت."
شەو داهاتبوو کە وەختی حەپسە خان و ئەوان گەڕانەوە گەیشتنە ماڵێ. حاجی مەجید گوتی: "خەریک بووم بکەومە مەراقەوە." براکەی گوتی: "کە تاریکی داهات و دەرنەکەوتن شەیتان خەیاڵێکی خراپی خستە دڵمەوە، بەتایبەتی کە ڕۆژ نییە غەزەتەکان باسی وەرگەڕانی چەند پاسێک نەنووسن."
ئامە خان لە نزیک سۆپاکەوە دانیشت و دەستی خستە سەر کەلەکەی و گوتی: "وەی باوکەڕۆ کەلەکەم هاتە ژان وابزانم سەرمام بووە." یەکێ لە کچەکان ڕای کرد و گوتی: "هەر ئێستا دەچم کیسەی ئاوی گەرمت بۆ دەهێنم."
ئەوی ترشیان چایەکی گەرموگوڕی خستە بەردەم، دەتگوت ئامە خان و ئەوان مانگێک بوو چووبوون بۆ سەفەر، ئەوەندە ئەهلی ماڵەکە دڵیان خۆش بوو بە گەڕانەوەیان، لەو سەفەرە بچکۆلەیە کە هەمووی چەند سەعاتیکیان پێ چووبوو.
ئامە خان قومێکی لە چایەکەی دا و سەیرێکی مێرد و شووبرای کرد و گوتی: "وەڵا ئێمەش ڕۆحمان لە مستماندا بوو، بەتایبەتی لەمسەر کە چووین." ئیتر کەوتە باسی لێخوڕینی پاسەکە و چاوبڕکێ لەگەڵ ئەو ژنە بەدخووە، هەروەها باسی ونبوونی خۆیشی بۆ کردن، حەپسە خان گوڵدان و دوو سێ شتی سەرمێزی کڕیبوو، بە یارمەتیی سەبری لە کارتۆنەکە دەری هێنا، سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و بە کوڵ و دڵ گوتی: "ئۆە خوایە ئەمانە لەسەر مێزی ماڵی خۆمان لە سلێمانی دانێم." حەپسە خان بە خۆشییەوە گوتی: "هەر کە دەستم دانێ بیانکڕم ئەم ئاهەم کرد و نەزرێکیشم گرت بۆ ئەو حەزرەتی مەعسوومەیە."
خاتوو زبێدەش چووبووە ژوورەکەی خۆی، کوڕەکان لێی کۆمەڵ بووبوون، یەکێ چای بۆ دەبرد و یەکێ سینییە چێشتی دەخستە بەردەم و لە دەوری دانیشتن، ئەویش کەوتبووە باسی سەفەرەکەی.

* * *

ڕۆژگار بەم چەشنە تێپەڕیی بەسەر ماڵی حەپسە خاندا، تاوەکو خۆیاندا لە ساڵ و نیوێک و زیاتر، لە ماوەی ئەم ساڵ و چەند مانگەدا، کوڕەکانیان بۆ چەند جارێک بە ئیجازە و بە نۆرە هاتن بۆ سەردانیان، ڕووناک و دایک و پووری چوون بۆ هەمەدان بۆ سەردانی باوکی بێستوون، ڕووناک لە ماڵی خەزووری مایەوە و بەین بەینیش سەری ماڵی باوکی دەدایەوە، لەو ماوەیەدا دوو جار باوکی بێستوون بە نەخۆشی هێنرایە تاران و دوایی گەڕایەوە شوێنی خۆی لە هەمەدان و سیحەتی بەرە بەرە باش بووبوو، بەختیار و تۆفە و سمایل و کاوە و کامەران، ئەوانیش یەک دوو جار سەری پێشمەرگەکانیان دا لە هەمەدان و گەڕانەوە تاران بۆ لای حەپسە خان و ئەوان.

* * *

ساڵ وەرگەڕابوو، دیسانەوە سەرەتای پاییز بوو، ئێوارەیە و هەردوو حاجی و چەند کەسی خیزانەکەیان بە بێتاقەتی و بێزاری لە دەوری یەک کۆ بووبوونەوە و لە تارمەکەی بەردەمی ژووری میوان دانیشتبوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە دنیا لێڵ و ڕەشەبا و هەندێ سارد بوو، دەیانویست خۆیان بە منداڵە وردەکانەوە بخافڵێنن، بەتایبەتی کوردۆی نەوبەهار، کە لەوانی تر گەورەتر بوو و فێری قسەی زل بووبوو، هەروەها گۆرانییشی بۆ دەگوتن و لاسایی گۆرانیبێژە فارسەکانیشی بۆ دەکردنەوە و لەگەڵ منداڵەکانی تر خەریکی هاری هاری و بزێوی بوون، زەنگی دەرگا لێ درا و یەکێ لە کوڕەکانی خوارەوە ڕای کرد و کردیەوە.

شیروان و نەورۆز کردیان بە ماڵدا. ئەوانەی لە تارمە و هەیوانەکە دانیشتبوون ڕاپەڕین و قریشک و هوریان تێکەوت لە خۆشیی هاتنی کوڕەکان و ماچوموچ و دەستلەملان دەستی پێ کرد. کوڕەکانیش بە گەرمییەوە بە ڕووی خۆشەوە هەواڵی هەموو لایەکیان پرسی و پێکەوە هەموو چوونە ژوورێ و دانیشتن.

حاجی مەجید بە هەندێ سەرسوورمانەوە گوتی: "یاخوا کوڕم بەخێر بینەوە، بەڵام بۆ وا لەپڕ، خێرە ئیشەڵا، خۆ هەمووی دوو هەفتەیە عەلی و بێستوون گەڕاونەتەوە."

شیروان بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی: "هاتووین دڵتان خۆش بکەین." جەماعەت بە جارێک دڵیان خۆش بوو، کە دەبێ چی قەومابێت.

زۆر بێسەبرانە هەریەکەیان لە لایەکەوە شتێکی دەگوت و پەلەی لە شیروان و نەورۆز دەکرد کە قسە بکەن و تێیانبگەیەنن بزانن چی بووە، ئەو خەبەرە خۆشە چییە کە هاتوون پێیان بڵێن. نەورۆز گوتی: "ماڵتان ئاوا بێت، ئێمە لە بەیانییەوە بەڕێوەین، جارێ لێمان گەڕێن و ماوەمان بدەن هەناسەیەک وەرگرین." کاکە حاجیی باوکی بە پەرۆشەوە گوتی: "یاخوا لەشتان ساغ بێت ئیشەڵا ئێستا تێر پشوو دەدەن و

ئیسـراحەت دەکەن، بەڵام بەخـوا دڵمـان بە بەریەوە نەمـاوە، هەر بە کەلیمەیەکـیش بـێ پێمان بڵێن چی بووە."
سەبری لە خۆشیی ئەوەی شیروان و نەورۆزی پوورزا و ئامۆزای بەو ڕووە خۆشـەوە هاتوون، جێی بە خۆی نەدەگرت و زۆری قسەکانی لە وڕێنە دەچوون.
شـیروان و نەورۆز بەرانـبەر بە هێرشـی جەمـاعەت ناچـار بـوون، هەروا بە پێـوە قسـەکانیان بـۆ بگێـڕنەوە. شـیروان گـوتی: "وەڵا مژدەتـان بـدەمێ، لەگەڵ برادەرانـی ئەودیومـان دەسـتمان کـردووە بە گفتوگـۆکردن و لەم ڕۆژانەدا چەنـد کەسـێکیان دێـنە لامان تاوەکو بگەینە بڕیارێک."
جەماعەت دایان لە چەپڵە و هەندێکیان هەڵبەزین، کوڕەکانی خوارێش هەموو بە هەڵەداوان هــاتنە ســەرێ و هەموویــان دەوری شــیروان و نەورۆزیــان دا و هەر کەســەو کەوتە پرسیارلێکردنێک و کردیان بە هەڵا.
تۆفە زەردەخەنەکەی گەیشـتە لای گویچکەکـانی ئەوەنـدە دەمـی پـان بووەوە و سـوور سـوور هەڵگەرابـوو، لە خۆشـیی ئەم قسـەیە. ڕووی کـردە حەپسـە خـان و خوشـکی و سەری ڕاوەشاند و گوتی: "پێم نەگوتن خۆتـان ئەوەنـدە نـاڕەحەت مەکەن دڵم خەبەری داوە کە بەم زوانە مژدەیەکی خۆش دەبیسـتن." ئامە خـان کە وەک مەسـتی لـێ هـاتبوو لە خۆشـیی ئەو مـژدەیە لەگەڵ ئەوەشـدا سـەری سـوورِما لە قسـەی دڵـخەبەردانەکەی تۆفە و لە دڵی خۆیدا گوتی: "پەنا بە خوا لە دەمی ئەم تۆفەیە، بۆ هەر قسەوباسـێک کە بگوترێـت ئەو وەرامـدانەوەکەی دەڵێـی لە قـولی مسـتایەتی. دە توخـوا ئەوە کەی و چ ڕۆژێـک ئەو وای بە ئـێمە گوتـووە کە خەفەت نەخـۆین، چـونکە دڵـی خەبەری داوە کە شتێکی خۆش دەقەومێت."  ئامە خان لە ژێر لێوەوە گوتی: "ئامان سەدەق لە کاری خوا لە دەم و فیشاڵەکانی."

* * *

خێــزانەکە لە دوای ئەو وروژان و هەرایە هەنــدێ هــاتنەوە ســەرخۆ، کوڕەکــان پشـوویەکیان دا، ئەوانـیش هەر لە دەوریـان بـوون، هەنـدێکان دادەنیشـتن و هەنـدێکیان هەر ژوور و هەیوان و حەوشەی دەکرد و جێی بە خۆی نەدەگرت لە خۆشییاندا.
حـاجی مەجیـد بە خۆشـییەوە ڕووی کـردە شـیروان و نەورۆز و گـوتی: "بەخـوا ئەمە مژدەیەکـی خـۆش بـوو، بەڵام ئەمە چـۆن بـووە و کامتـان دەستپێشـخەریی کـرد لە مەسەلەکەدا؟" شیروان خۆی گورج کردەوە و سەیرێکی حاجیی کرد و گوتی: "بەینێکە بیسـتوومانە کەوا حکومەت دیسـان خـۆی کـۆ کـردووەتەوە و خـۆی ئامـادە دەکـات کە پەلاماریان بدات و چەند هێرشێکیشی بردووەتە سەریان لە چەند ناوچەیەکدا." شیروان

دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "ئیتر ئێمەش بیانوومان نەما، چونکە ئێمە وەختی خۆی وەکو دەزانن بۆیە تێک چووین لەگەڵیان کە شەڕەکەیان ڕاوەستاند لەگەڵ حکومەت و دوای درۆکانی حکومەت کەوتن و بە پێشمەرگە و خەڵکەکەیان گوت هەموو شتێک تەواو بڕایەوە هەر کەسەو بچێتە سەر ئیشوکار و ماڵی خۆی. هەروا بە ئاسانی و بەبێ بیرکردنەوەیەک لە حاڵ و هەستی ئەو هەموو خەڵکەی ماڵی وێران بووبوو و کوڕی شەهید بووبوو، وایان کرد کە کردیان و ئاخرییش قسەی ئێمە دەرچوو، حکومەت دەستی بڕین، تاوەکو خۆی قاییم کرد و کوردیشی بێهێز و دووپارچە کرد، ئینجا کەوتە پەلاماردانیان، ئێمەش ئەمە چۆن قبووڵ دەکەین، بۆیە بێ سێ و دوو دەگەڕێینەوە بۆ یارمەتیدانیان و تێکەڵبوونەوە وەکو جاران."

حەپسە خان ئەگەرچی دڵی زۆر خۆش بوو بەم قسانە و هەر ئەوەی مابوو کە هەڵپەڕێت، بەڵام لەپڕ وەک هۆشی بیتەوە بەر خۆی هەندێ مات بوو و گوتی: "ئەیەڕۆ ناشێ بەم زوانە بڕۆنەوە؟ ئەی عەلی و حسێن و ئەوان نەبینین؟ ئەی نایەنەوە بۆ لامان؟ ئەی ئێمە چی لێ دەکەن؟ خۆ ئیشەڵا لێرە بەجێمان ناهێڵن!" نەورۆز هەڵی دایێ و گوتی: "ئینجا پووری گیان چۆن بەبێ ئێوە دەڕۆینەوە و کاکە عەلی و ئەوانیش چۆن هەروا بێ ئەوەی چاویان پێتان بکەوێت دەگەڕێنەوە؟" حاجی مەجید بە دڵپێوەبوونێکەوە سەیرێکی حەپسە خانی ژنی کرد و گوتی: "ماڵت ئاوا بێ، دە تۆ جارێ تۆزی دڵی خۆت خۆش بکە، سەیری بکەن جارێ بیر لە چی دەکاتەوە، بە زاتی خوا هەر ڕاست دەڵێیت مامە خەمەیت، هەر دەبێ شتێک بدۆزیتەوە تاوەکو خۆتی پێ ناڕەحەت بکەیت." حەپسە خان پێکەنیی و گوتی: "ئەی دەڵێم چی؟ گوتم کوڕەکان لەپڕ نەڕۆنەوە ئێمە لێرە بەجی بهێڵن و بڵێن ئێوە دوایی وەرن." سەبری لەوێە هەڵی دایێ و گوتی: "ئەشهەدوبیلا هەر ئەوەمان کەمە."

تۆفە جامانەکەی کردەوە و جارێکی تر خەریکی بەستنی بووەوە و گوتی: "لە ئێستاوە پێتان بڵێم، بەدیار کەسەوە دانانایشم، بە مەرقەدی پێغەمبەر لە پێش هەمووتاندا و لەپێش پێشمەرگەکاندا من دەگەڕێمەوە، ئیتر من لە حیسابی مانەوە و نەمانەوە دەرکەن ئەوە پێم گوتن." ئامە خان بە پێکەنینەوە ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "باشە قوربان، گەورەی گەڕەک، بەدیارمانەوە مەمێنە." ئامە خان دایە پێکەنین و سەیری دانیشتوانی کرد و گوتی: "ئەمە قسەیە، سەرلەشکر پێش نەکەویت؟ هێزی پێشمەرگە چۆن دەزانێت بگەڕێتەوە ئەگەر کاکە تۆفە سەرلەشکر وەک ئاسک پێشیان نەکەوێت، خوا نەیبڕێت شارەزای هەموو ڕێگاوبانێکە، ئەگەرچی وەختی خۆشی ون بووبوو، گەیشتبووە شاخەکانی کودستانی تورکیا." تۆفە دڵخۆش و بەکەیف بوو بۆیە ئەویش بە قسەکانی

ئـامه خـان پێکەنیـی و گـوتی: "قســەت وەک نەقشـی سـەر بەرد وایە، ئـامر مەخـفەر."
هەموویان بە جارێک دایانە قاقای پێکەنین بەم وتوویژەی بەینی ئامە خان و تۆفە.

* * *

شـیروان و نەورۆز هەر چـوار ڕۆژێـک مـانەوە لە تـاران لای دایـک و کەسـوکاریان، تاوەکو ئاگاداری وەزعەکەیان بکەن و هەندێ ئامۆژگارییان بکەن لەو ڕووەوە.
هەر دوای گەڕانەوەی کوڕەکـــان، حەپســـە خـــان و خوشـــکی و ئەوان کەوتـــنە خۆکۆکردنەوە و خۆپێچانەوە، دەتگوت ها ئەوەتا ئۆتۆمبێلیان لەسەر ڕاوستاوە.
بەو حاڵە ئامادە لەسەر کۆڵ و بارەکانیان دانیشتن، جاری وا هەبوو یەکێکیان دەچوو بۆ حەمام سەری بشوات، دادەنیشت جارێکی تر جانتا و باوڵی تێک دەدا تاوەکو جل بۆ خۆی دەربێنێت، ئەوی تریان لەولاوە هەڵی دەدایە و پێی دەگوت: "کچێ دایکم جلی پێویست بۆ قایم دەکەن، خۆ هێشتا کەس دیار نییە و نەبووە کە بڵێت وەرن بڕۆن، خوا دەزانێت بە مانگێکی تریش پێمان دەڵێن وەرن یان نا." ئەوی تریان دەیگوت: "توخوا با سـەرێکی بـازاڕ بدەینەوە، وەی دایە وەڵا ڕەنگە زۆر بیری تاران بکەین، هەرچۆنێک بێت بە خۆشی بێت و بە ناخۆشـی سـاڵ و نیویـک زیـاترە لێرەین، نـان و نمەکمـان کـردوون، ماڵیـان ئـاوا بێت دالّدەیان داین و خزمەتیان کردین، ئیتر بە هەر نیازێک بووبێت من هەقم نییە بەسـەرەوە و من دەڵێم کە ئینسان لە کانییەک ئاوی خواردەوە نابێ بەردی تێفڕێبدات."
ئاغای ڕەزائی هەندێ جار چاوی خۆی دەسڕییەوە و دەیگوت: "گریـانم دێت کە ئێوە دەڵێن دەڕۆینەوە، بەڕاستی لەگەڵتان ڕاهـاتووم کە بڕۆنەوە زۆرتـان بیر دەکەم، توخـوا با منیش بێم لەگەڵتان."
کە ئاغـا ڕەزائـی دەچـووە خـوارەوە، ئەمـان ســەریان دەنـا بەیەکەوە و دەکەوتـنە چرپەچرپ، ئەو دەیگوت: "وەیش، بەڕاستی خەفەتمـان بـۆ دەخـوات، چـاوت لێیە چۆن چاوی پڕ بوو لە فرمێسک." سـەبری دیسـان زۆرزانـانە دەهـاتە قسـە و دەیگوت: "کچێ درۆ دەکـات، فرمێسـکی چـی و حـاڵی چـی، ئەوە پێیـان گوتـووە وا بکـات و وا بڵێت کە بەشکم لەگەڵ خۆمانی بەرین و لەوێ جاسووسی بۆ دائیـرەکەی بکـات، ئێوە چـووزانن، ئەمانە هەزار فرتوفێڵی وایـان لەژێر سـەردایە." ئەوی تریـان دەیگوت: "خـۆ وەڵا ڕەنگە ڕاست بکـات و بە دڵ بیڵێت کە ڕۆیشـتین بیرمـان بکـات بۆمـان نـاڕەحەت بێت، ڕاهـاتن زۆر کـار دەکـاتە سـەر ژیـانی ئینسـان و هەروا ئاسـان نیـیە، تـۆ بـا ئیشـەڵا ئـێمەش بڕۆینەوە، ئەوسا چۆنی بیری دەکەین و چەند زوو زوو دێتە یادمان."
تۆفە بەم دەنگوباسی ڕێککەوتن و گەڕانەوە بۆ وڵات و خۆکـۆکردنەوەیە زۆر سـەرقاڵ و مشەوەش بوو، جاری وا هەبـوو دەچـووە سـەر ژنەکـان و پێـی دەگـوتن: "کـوا هێشـتا

هیچتان نەکردووە، دەی زوو بکەن خۆتان کۆ بکەنەوە." جارێکی تر دیسان چووە سەریان و دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ و گوتی:

- کوا، هێشتا هەر هیچتان نەکردووە!
- کورە باوکم بەرۆکمان بەردە، خۆمان چ کۆ بکەینەوە، چیمان هەیە، دوکانی بەکرە و دوو قالب سابوون، وەکو مەسەلەکە گوتەنی، لەم دوو سێ جانتا و پەڕۆ و پیتاڵە زیاتر چیمان هەیە.

تۆفە هەروەک شێتی لێ هاتبوو ڕۆژی وا هەبوو لە ژەمێک زیاتر نانی پێ نەدەخورا لە پەلەپەلی ئەوەی کەی دەڕۆنەوە. هەروەها کەوتبووە ناو ئەو خرتوپرتەی کە وەختی خۆی هاتبوون بۆ تاران، پێیان وابوو وەک چراییکی ئینگلیزی و لۆکسی نیوداشت و هەندێ قاپ و ماپ کە ئەوسا لە دێیەکەی فاتمە خان کڕیبوویان و ئەوە بوو کە لە بانە ئاغای حەسەنیی ڕێبەریان هەموو چاکەکانی بۆ خۆی بردبوو، خراپەکانیشی بۆ بەجێ هێشتبوون، لەگەڵ ئەو دوو سینییە خیچوخوار و دۆلکەی ئاو و چەند پەرداخێک و چێشتلێنەرێکی بچووکی یەکچاوی نەوتی و یەک دوو بەڕەی کۆن.
تۆفە ئەمانەی هەموو کۆ کردەوە و گوتی: "کۆنەکڕ بێرەدا تێدەپەڕێت، ئەم شتانەی پێ دەفرۆشم، دوایی بە پارەکەیان حاجەیەکی باش دەکڕم و دەیبەینەوە لەگەڵ خۆمان." هەموو خێزانەکە بە دزییەوە پێدەکەنین و نەیاندەوێرا پێی بڵێن: "کورە باوکم ئەوانە ئەوە ناهێنن، بیدە بە فەقیرێک بە کەسێک." بۆیە وازیان لێ هێنا و گوتیان: "کەیفی خۆتە، چی دەکەیت بیکە."

* * *

ڕۆژێک دوای چێشتەنگاوێک خەڵکی گوێیان لە دەنگی قرەیەک بوو لە بەردەرکی حەوشە، کوڕەکان کە لە حەوشە نزیک بوون زووتر ڕایان کرد بزانن چییە. دەنگی تۆفەیان دەهاتە بەرگوێ، کە دەیقیراند و هەر سەگباب سەگبابی بوو. بەختیار بە هەڵەداوان ڕای کرد، سمایل بە پەلە ئاغای ڕەزائیی بانگ کرد، کە لە چێشتخانەکە خەریکی خواردن دروستکردن بوو، هەموو بە جارێک چوون، حەپسە خان و سەبری و نەسرینیش بە هەناسەبڕکێ گەیشتە لایان، کە سەیر دەکەن تۆفە ئەوەندە تووڕە بووە کە هەردوو چاوی چووەتە پشتی سەری و دەمی گۆ ناکات لە تووڕەییدا و هەر دەست ڕادەوەشێنێ و دەڵێت: "نامەردی سەگباب! خۆت ئیختیار و خەڵەفاوی، بۆ من چیم بە تۆ گوتووە تاوەکو پێم بڵێیت..." خەریکە پەلاماری بەرانبەرەکەی دەدات، کە لە تەمەندا هەروەک خۆیەتی؛ کابرایەکی شڕۆڵەی فەقیری داماو، دوو گونیەی بەتاڵی لە بەردەمی خۆیدا داناوە، تۆفە خرت و پرتە شڕەکانی لە بەردەمی خۆی کۆمەڵ کردووە

و هەر دەقیڕێنێ و هەر لەگەڵ کابرای شڕۆڵ شاڵاو بۆ یەکتر دەبەن و دەستیان بە یەخەی یەکەوەیە، ئاغای ڕەزائی و بەختیار و کوڕەکانی تر بە پەلە کەوتنە بەینیان و لە یەکیان کردنەوە.
ئاغای ڕەزائی لە کابرای شڕۆڵ تووڕە بوو و چوو بە گژیدا و بە فارسی پێی گوت: "ئەوە چییە! ئەوە چییە! تۆ نابێ ئاگات لە خۆت بێ کە شەڕ لەگەڵ کێ دەکەیت؟ ئەمانە میوانی دەوڵەتن، دوایی دەوڵەت پێی بزانێ باوکت لە قەبر دەردەهێنێ." کابرای شڕۆڵ بە تووڕەبوون و هەناسەبڕکێوە ڕووی کردە ئاغای ڕەزائی و گوتی: "کورە برام، بێرەدا تێپەڕیم بانگم دەکرد کەسێک کۆنەی هەبێت، ئەم کابرایە بە ڕاکردن هات و گوتی: 'وەرە وەرە من شتم هەیە.' منیش هاتم، ئەویش چووە ژوورێ ئەم زبڵ و شتە کۆن و شکاوانەی بۆ هێنام، دوای ئەوەی سەیرم کردن وتم ئاغا ئەم فافۆن و سینی و شتانەم بەکەڵک نایێت، بەڵام بەڕەکان و چرا نەوتییەکان لێت دەکڕم، ئەویش گوتی باشە بە چەند، منیش گوتم هەمووی بە سی تمەن ەیدەی باشە نایدەی 'اختیار دارید.'" "اختیار دارید" بە فارسی مانای "کەیفی خۆتە" یان هەوەسی خۆتە.
ئاغای ڕەزائی و بەختیار چوون بە گژ تۆفەدا و پێیان گوت: "باشە ئەم کابرایە چیی کردووە کە تۆ ئەم هەموو جنێوەی پێ دەدەی و ئەم شەڕە زلەت ناوەتەوە؟!" تۆفە، کە وەک فیشەکە شێتەی لێ هاتبوو، هەندێ کۆکیی و بە خێسەیەکی ئاگرینەوە سەیری کردن و گوتی: "چۆن چیی کردووە؟! من پێی دەڵێم ئەمە سەوا و معامەلەتە، من دەڵێم بە سەد تمەن تۆ دەڵێیت بە سی، کەچی نامەردە خوێرییە پێم دەڵێت وەڵا تۆ ئیختیاری و خەڵەفاوی." ئاغای ڕەزائی بە تووڕەییەوە و بە نیوە فارسی و کوردی گوتی: "گاگا ئەوە کەی گوتوویەتی پیر و خەڵەفاوی، پیاوەکە دەڵێت 'اختیار دارید'، یەعنی هەوەسی خۆتە بەوەندەی نادەی مەیدە."
هەرچۆنێک بێت هەموو کوڕەکان دڵی کابرایان دایەوە و گوتیان کە ئێوە لە یەک نەگەییون و قەیناکە عاجز مەبە و پەلی تۆفەشیان ڕاکێشا و بردیانە ژوورێ.
هەردوو حاجی هاتبوونە هەیوانەکە و بە حەپەساوی سەیری یەکتریان دەکرد کە ئەمە چی قەماوە، کوڕەکان خەریک بوون دەبوورانەوە لەبەر پێکەنین و هەریەکەیان دایە پڕمەی پێکەنین و لە ترسی تۆفە ڕایان کردە شوێنێک. سەبری، کە لە هەموویان زیاتر بە تۆفە دەوێرا، دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "ئەیەڕۆ، چۆن بووین بە سینەمای گەڕەکەکە، هەموو دراوسێیەکان هاتبوونە بەردەرگاکانیان و ئەوانی ترش لە پەنجەرەکانەوە سەیریان دەکردین، لەبەر ئەو دوو سێ فافۆنە شکاو و بەڕە شڕە کە هەر بۆ تەنەکەی زبڵ و سەرەنوێلک باشن." تۆفە سەیرێکی کرد و بە تەوسەوە گوتی:

"بۆچی بۆ سەرەنوێلک باشن موفەتیش!" سەبری جوابی دایەوە و گوتی: "ئۆە لەبەر فارسییەکەت بمرم، ئەوە بە خێرێ ساڵێکیشە دەچیت بۆ مەکتەب، کەچی لە کابرا نەگەیشتی دەڵێت چی و کردت بەم بەزمە." کاکە حاجی لە هەیوانەکەوە گوتی: "کورە کاکە گیان هەمووی چەند ڕۆژێکمان ماوە لێرە لەسەر ڕۆیشتنین با خۆمان بەدناو نەکەین، هەموو دراوسێیەکان حورمەتمان دەگرن و دەڵێن ماڵێک بێدەنگن." تۆفە لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئینجا با مەدحمان نەکەن، وەڵا لەسەر مەدحی ئەوان پەکمان کەوتووە." ئینجا لەژێر لێوەوە گوتی: "لە قەبری باوکی گەورەیان بەم."
حاجی مەجید سیخورمەیەکی لە براکەی دا و بە ئەسپایی گوتی: "لە ڕێی خوادا لەگەڵی مەڵێ و دەمی مەکەرەوە."

* * *

بۆ دوو مانگ دەچوو کە شیروان و نەورۆز گەڕابوونەوە هەمەدان بۆ لای پێشمەرگەکان، ئەمانیش دەتگوت لەسەر ئاگر دانیشابوون کە کەی جەوابێکیان بۆ دەنێرن و کەی دێن بەدوایاندا. ڕۆژیان لێ بووبوو بە ساڵ، شەویان هەر لە بڕانەوە نەدەهات، جاری وا هەبوو حەپسە خان دەیگوت: "وەڵا دەڵێی بەختیار بنێرین بۆ لایان، ئەوە بۆ کەسیان دیار نەبوو، خۆ دڵمان توایەوە." حاجی مەجید دەهاتە قسە و دەیگوت: "کورە بابم سەبر بکەن و دان بە خۆتاندا بگرن، هەڵبەت هێشتا بۆیان نەکراوە، ئێستا ئەوانیش خۆیان کۆ دەکەنەوە و ڕەنگە هەزار و یەک تەگەرەیان هاتبێتە ڕێ." براکەی لەولاوە سەری با دەدا و بە کزییەوە دەیگوت: "بەخوا زۆر ترساوی کە گفوگۆیەکە تێک چووبێت، ئێوە نازانن کە ڕەنگە ئێستا چەندین کەسی گێرەشێوێن لەبەر دەسکەوتی تایبەتیی خۆیان ئەم ڕێککەوتنەیان پێ ناخۆش بێت و بیانەوێت تێکی بدەن، چونکە دەترسن بە ڕێککەوتن و نەمانی دووبەرەکی جێ بەوان لێژ ببێت، بۆیە زۆر لە مەراقام، خوا ڕەحممان پێ بکات، بەم ساڵ و نیوە هەمووماں سوێمان بووەوە."
نەوبەهار دەیگوت: "دە بڵێ ناتوانن دوو دێڕ کاغەز بنووسن، خۆ پێش ئەم باسە هەفتەی دوو سێ نامەیان دەهات." نەسرین وەرامی دەدایەوە و دەیگوت: "ئۆە کاشکی ئەم قسەیەیان هەر نەکردایە و ئێمەیان نەخستایەتە سەر هەلەکەسەما." تۆفە بە تووڕەبوونەوە دەهاتە لایان و دەیگوت: "بەخوا بەخوا لە سبەینێ زووتر نییە ئیزن وەردەگرم و سواری پاس دەبم و هەمەدان لە کوێیت ئەوا هاتم." دەستی دەدا بە یەکدا و دەیگوت: "باوکم شەو خەوم نەماوە، هەموو شەوێک دەڵێم دەی خوایە بەیانی خەبەرێکمان بۆ بێت، ئیتر بەڕاستی ئەوانیش ناخۆشیان کرد."

ئەو بەیانییە تۆفە بە تووڕەیی و بێزارییەوە خۆی کۆ کردەوە و بە کوڕەکانی گوت: "شەرت بێت سەری خۆم هەڵگرم و هەروا لە خۆمەوە وەکو شێت بکەومە ئەو شەقام و جادە و بیابانە و تاوەکو شەو نەیەمەوە لە داخی عەلی و ئەوان، کەوا هیچ لێمان ناپرسنەوە و نایەن بەلامانەوە." بەختیار زەردەخەنە و پێکەنینەکەی بە زۆر شاردەوە لە ترسی تۆفە و گوتی: "کاکە گیان من ئەڵێم ئیمڕۆش دان بە خۆتدا بگرە و مەڕۆ بۆ هیچ کوێ، دەترسم تووڕە بی و تووشی شەڕێک شتێک ببی." تۆفە بێ گوێدانە نەسیحەتەکانی بەختیار، خۆی ئامادە کرد و جگەرەیەکیشی خستە بەینی لێویەوە و دایگیرساند و بە دەمی گیراوە و بێ ئەوی سەیری کەسیان بکات، گوتی: "بە دووعا، خواحافیز." چووە دەرەوە، هەندێ لە بەردەرکی حەوشە ڕاوەستا وەک بیر بکاتەوە کە بە چ لایەکدا بکەوێتە ڕێ، لە دوای ئێستێک تۆفە دیار بوو بڕیاری خۆی دابوو کە بۆ چ لایەک بڕوات بۆ یەک دوو جار کۆکی و گەرووی خۆی پاک کردەوە و کەوتە ڕێ بەرەو خوار بۆ لای ئێستگەی پاسەکەی دەچووە ناوشار و بازاڕی گەورە.
بە فیڕۆ ڕۆیشت و لە هیلاکی بەولاوە هیچی تریی دەست نەکەوت و ئەو چەند پارە و پوولەشی کە هەیبوو لە گیرفانیدا هەڵی گرتبوو و پشتی پێی گەرم بوو و زۆر جار کە دەیویست شتێک بکڕێت دەیگوت: "دەی با ئەم جارەش واز بێنم با پارەکەم هەڵگرم و خەرجی نەکەم با بۆ شتێکی پێویستتر بێت." هەموو ئەو پارەیەش کە دڵی پێی بوو و گیرفانی گەرم کردبوو، نەدەگەیشتە ٨٠ دینار، کەچی ئەمڕۆش چونکە بێئیش و بێکار دەسووڕایەوە لە ناوبازاڕ، نیوەی پارەکەی بە خۆڕایی خەرج کرد و هەر گوتی: "ئەم بلووزە زۆر هەرزانە و ئەم گۆرەوییانە ئەستوور و باشن، ئەم دوو کاشییە ئەوانەن کە حەپسە خان حەزیان لێ دەکات و ئێستا دڵی پێی خۆش دەبێت، ئا توخوا ئەم دوو شەقشەقە و یارییانە بۆ ئەو دوو سێ منداڵە بکڕم." کەچی پارەکەی نیوەی نەما، هەمووشی بە شتی زۆر ناپێویست، کە دەیتوانی شەش مانگی تریش هەر باسی بلووزکڕین و گۆرەوی نەکات، چونکە هەرچەندە دەچووە بازاڕ، گۆرەوییەکی کڕیوە و ئێستا یەک توورەکە گۆرەویی هەیە لەگەڵ دوو بلووزی لەبەرنەکراویش. شەقشەقە و یاریی منداڵانیش ئەو هەموو پارەیەشی پێ دەدا، ئێستا هەر دوای ڕۆژێک هەڵدەدرێنە ناو سەبەتەی یارییەکانی تریانەوە، یان لەو ناوەدا پەرشوبڵاو دەبنەوە و لەکن خۆیان لەسەر سەفەرن و شتی زیادیان بۆ چییە؟
تۆفە هاتەوە سەرخۆ و گوتی: "'ئەوە چییە دەڵێی نوستون، ئەمە چەند جار من لە زەنگەکە بدەم." ئەم جار پەنجەی نا بە زەنگەکەوە و چەند جارێک لەسەر یەک لێی دا تا گوێی لە دەنگی ڕاکردنێک بوو. سمایل دەرگاکەی کردەوە، تۆفە بە ڕوویەکی زۆر

گرژەوە گوتی: "چییە، ئەمە چەند جار لە زەنگی دەرگاکەم دا و کەس نەهات بیکاتەوە، دیـارە دیسـان چایخـانەکەی حەمە ڕەق گەرمە و لەبەر دەنگـی ڕادیـۆ و گـۆرانی و چەقەچەقی دۆمینە ئاگاتان لە هیچ نەماوە." سمایل بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی: "تۆ جارێ ڕابکە ژووری، کاکە عەلی و ئەوان هاتوون، نەمانگوت ئەمڕۆش سەبر بکە و مەڕۆ و خۆت ئەوەندە تووڕە مەکە." تۆفە گوڕی دایە خۆی و بە پەلە خۆی هاویشتە ناو حەوشەکە و بەدەم چوونەژوورەوە گوتی: "ئەی کەی دەڕۆینەوە؟ نەیانگوت کەی؟" سمە بە خۆشییەوە گوتی: "وەڵا نازانم هەمووی نیو سەعاتە گەیشتوون، هێشتا ئەوەیان باس نەکردووە."

 تۆفە بە توورەکە شتەکانیەوە بە پەلە سەرکەوتە سەرێ و لە خۆشییاندا تووڕەبوون و پـارەخەرجکردن و هەمـوو شـتێکی لەبیـر چـووەوە، بەتـایبەتی ئەو کەسـەی کە هاتووشە، عەلیی خۆشەویستیەتی، بە پەرپۆشەوە کردی بە ژووردا، عەلی لە دوورەوە بـۆی ڕاپەڕیـی و باوەشـی پیـادا کـرد و بێسـتوون و ڕوونـاکیش هـاتن بە هەڵەداوان باوەشیان پیادا کرد.

تـۆفە تـوورەکەکەی خستە کۆشـی حەپسـە خـانەوە و گـوتی: "دوو کاشـیی جـوانم بـۆ کڕیویت، لەوانەی حەزیان لێ دەکەیت، ئەوانی تریش یاریی مناڵەکانن." ڕووی کردە عەلـی و گـوتی: "ئەوە چیتـان کـرد و چیتـان بەسـەر هێنـاین، وەڵاهـی و بیلاهـی ئەو مەراقەی ئەم دوو مـانگە خـواردوومە ئەوەتەی هەم ئەوەنـدە نـاڕەحەت و سـەغڵەتیم نەچێشتووە." عەلی یەک قاقای خۆشیی لێ دا و گوتی: "بۆ؟ بۆ؟ خوانەکا کاکە تۆفیق گیان، دوژمنت ناڕەحەت و سەغڵەت بن، ئەوەتا هاتین و شکور هەموو شتێک بڕایەوە و نیوەی برادەران و هێزیان کەوتنە ڕێ بەرەو وڵات و هەندێکمان جارێ ماوین لەبەر مەسەلەی چەکەکانمان، کە هەمووی وەربگرینەوە لە دەوڵەت." عەلی سەری بردە نزیک باوکی و مامی و گوتی: "ئێستگەکەشمان بۆ ناردن، وا بەڕێوەیە لەگەڵ برادەران، باش بوو شکور تاوەکو ئێستا کەسیش پێی نەزانیبوو کە باوڵەکانمان لە کوێیە." باوکیشی بە چرپەوە پێی گوتەوە: "خەریک بوو ئەو قسەیەی لێ بپرسم، ئەوە هەر لە دڵمدا بوو." حاجی سەری بەرز کردەوە و بە ئەسپایی دووعایەکی کرد، دوایی دەنگی هەندێ بەرز کردەوە و گوتی: "یاڕەبی هەزار جار شکور، بەخوا ئەمە زۆر مژدەیەکی خۆش بوو، دەی خوایە لەسەر تۆ."

حەپسە خان هێشتا توورەکەکەی لە کۆشدا بوو پیشانی خوشکی و کچەکانی دەدا، سوورە سووری ڕومەتی بوو لە خۆشیی هاتنی عەلیی کوڕی و ڕووناک و بێستوونی خۆشەویستەکانی کە زۆر بیری دەکردن، وازی لە سەیرکردنی شتەکانی هێنا و بە

چاوێکی پڕ پەرۆش و خۆشەویستیی دایکانە سەیرێکی کوڕەکەی کرد و گوتی: "باشە بەساقەت بم ئەی ئێمە چی لێ دەکەن؟" سەبری لەوێوە پێکەنیی و گوتی: "پێیان بڵێ بەقوربانە، ئەمە دوو مانگە لەسەر کۆڵ و بارەکانیان دەنوون لە تاوان." عەلی پێکەنیی و گوتی: "دە تۆ جارێ دایکە گیان، با ئێمە بڕۆینەوە ئێوە شوێنەکەتان باشە، ڕەنگە شەڕ دەستی پێ کردبێتەوە ئەم منالە فەقیرانە بێنەوە ناو شەڕ و هەموو ڕۆژێک لە کونە تەیارەدا چی دەکەن، با هیچ نەبێت ئێمە بڕۆینەوە و بزانین حاڵەکە و حاڵی خەڵک چۆنە، ئەوسا یەکێکمان دێینەوە بەدواتاندا، جارێ وا زستانەکەش هات، بە قسەی من دەکەن جارێ وا پەلە بیر لە گەڕانەوە مەکەنەوە."

بێستوون، کە تا ئەوسا هەر لەگەڵ ڕووناک ئەم ژوور و ئەو ژووریان دەکرد، کردی بە ژووردا و هەڵی دایێ، وەک قسەکەی عەلی تەواو بکات و بە زەردەخەنەکەیەکەوە گوتی: "چییە خەسوو گیان، بۆچی ئەوەندە پەلەتانە؟ کونە تەیارەکانت لەبیر چووەوە یان بیریان دەکەیت؟"

ئەم قسەیەی کە عەلی و بێستوون کردیان هەموویانی بە جارێک ڕاپەڕاند، حەپسە خان بە گەرمییەوە گوتی: "ئەیەڕۆ ئەوە ئێوە چی دەڵێن، ئێمە دڵمان سوێی بووەوە ئەم چەند هەفتەیە، شەو و ڕۆژ گوێمان هەڵخستووە کە کەی پێمان بڵێن دەی وەرن، ئێستا وامان پێ دەڵێن؟" ڕووی کردە بێستوون و گوتی: "کونە تەیارە دەڵێیت؟ ئەرێوەڵا بیری دەکەم، وەڵا ئەوەمان کەمە ئێمە لێرە دانیشین و پڵاو و گۆشت بخۆین و ئیسراحەت بکەین و ئێوەش بچنە ناو ئاگر و شەڕ و گولله و ئەوەندەش دوور بین لە یەک."

حەپسە خان دەستی هەڵبڕی و بە پەرۆشەوە گوتی: "وەلا بەسەری پێغەمبەر من لە پێش هەمووتاندا زیرە دەکەم و دەمرم." ئامە خان خۆی گورج کردەوە و گوتی: "کەواتە بڵێن ئێمە وا دەڕۆینەوە و ئێوەش لێرە دیق مەرگ بن و بمرن بۆ خۆتان."

تۆفە جگەرەکەی خستە ناو تەپڵەکی جگەرە و زۆر بە توندی پەنجەی پیا نا، هەروەک کە داخی خۆی بەوە بکات، ئینجا سەیرێکی کردن و بە دەمێکی تێکەڵوپێکەڵ لە تووڕەییدا گوتی: "چی؟ چی ئدکەن؟ بەجێمان دەهێڵن لێرە؟ وەڵا بە مەرقەدی ئەو کاک ئەحمەدی شێخە پێم لەگەڵ پێتان دەبێت، لێرە نامێنم، بۆچی باوکم دەتانەوێت بچمە شێتخانە؟"

ڕووناک بە نازێکەوە گوتی: "وەڵا دەسا خەسووم دەیگوت جارێ لێرە دەمێنمەوە تاوەکو بەهار، بەم پاییزە درەنگە ئەم منالانە و ئەم پیاوە نەخۆشە بۆ کوێ بەرم بەو ڕێگاوبانە سەختەدا." بێستوون بۆی سەندەوە وگ وتی: باوکیشم گوتی کە چوویتەوە بنێرە دەستێک بە خانووەکەماندا بهێنن، چونکە وەک دەزانن خانووەکەمان چۆڵ کراوە

و ئەو معاونە نامەردەش یەک دوو دیواری رووخاندووە. لەبەر ئەوە هەر ئەوەیان باشە ئەم زستانە نەڕۆنەوە." نەسرین گوتی: "خۆ وەڵا لە سەرێکیشەوە ڕاست دەکەن، بەم سەرماوسۆڵەیە ئەم منداڵ و خێزانە بەرینە کوێ بەو ڕێگا سەختەدا و ناو گوللەباران، ئەگەرچی ڕۆحم دەرچێت هەزاران نازدارت ئەو خەڵکەش لەو دێهات و شیوانەن، خۆ ئێمە لەوان عەزیزتر نین، بەڵام چونکە لێرەین هەقە بیرێکی لێ بکەینەوە."
نەوبەهار لە خۆشیی هاتنی عەلیی مێردی بیری داخرابوو، گوێی لە جەماعەت نەبوو کە چی دەڵێن و چی ناڵێن، لەپڕ وەک هاتبێتە هۆش خۆی و ئەو ڕێگاوبانە سەختەی بیر کەوتبێتەوە کە چەند ڕۆژ بەڕێوە بوون و سەروسەکوت و داوێنی هەڵکراوی هاتەوە بیر و منداڵ بە کۆڵ و بە شانی هاتەوە بەرچاو، بۆیە ئەویش ڕووی کردە عەلی و گوتی: "باشە ئەگەر بڕۆینەوە هەر دەبێ بەو ڕێگایەدا بڕۆین کە پیایدا هاتین؟ هیچ ڕێگایەکی تر نییە؟" عەلی بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کرد و لەبەر باوک و مامی و ئەوان ڕووی بهاتایە، لە پێش وەرامدانەوەی پرسیارەکەی جارێ تێر تێر ئەو گەردن و لامل و ڕوومەتەی ماچ دەکرد. وەرامی دایەوە و گوتی: "ئەرێوەڵا هەر ئەو ڕێگایە هەیە، چونکە ئێمە دەبێ بە ڕێگای قاچاغدا بڕۆین، ئەگینا خۆ تەیارە هەیە کەمتر لە سەعاتێک دەتباتە بەغدا، هەروەها ئۆتۆمبێلیش هەیە بە دوو سەعات ڕێگا دەتباتە وڵات، بەڵام ئەوە بۆ ئێمە نییە. ئێمە هەر دەبێ تاکو بانە یان سەردەشت بە ئۆتۆمبێل بڕۆین، لەوێشەوە هەر دەبێ بە پێ و وڵاخ، ئیتر ئێوەش کەیفی خۆتانە، من دەڵێم بیرێکی لێ بکەنەوە."
حەپسە خان بە مەلوولییەوە گوتی: "ئەی ئەو ماڵانەی لای ئێوە چی دەکەن؟" عەلی گوتی: "منداڵدارەکان دەڵێن جارێ ناڕۆینەوە تاوەکو بەهار و ئەوانەی منداڵی وردیشیان نییە و کوڕەکانیان ماشەڵا زەلام و پێشمەرگەن، ئەوانە دەگەڕێنەوە و بەشی زۆریشیان لەگەڵ پێشمەرگەکان گەڕانەوە." ئامە خان بە پەرۆشەوە گوتی: "توخوا ئەی خاتوو زبێدە و بووکەکانی چییان کرد؟" بێستوون هەر بە هاتنی ناوی زبێدە، دایە پرمەی پێکەنین و گوتی: "خاتوو زبێدە دەفەرموون؟ ئۆە خۆی و سەروسەربەستە قوڵینەکەی ئاوا بێت، ئەوە هەر زوو لەگەڵ یەکەم دەستەی پێشمەرگە کەوتە ڕێ و گەڕایەوە، ڕانەوەستا و گویی لە قسەی کەس نەگرت ئەوەندە تاقەتی چووبوو." تۆفە بە گرژومۆنییەکەوە و بە توندی گوتی: "بۆچی ناهەقی بوو؟ یارەبی دەستی خۆش بێت."

* * *

ئەو شەوە هەموو خێزانەکە تا درەنگ هەر دەوری یەک دانیشتبوون و بیریان لێ حەل کردەوە و هەر کەسەیان لە لای خۆیەوە بیرێکی لێ کردەوە و بەوانی تری دەگوت کە

چی بکەن باشە، جار دەبوو بە قڕە و دەمەقالێ و جار خاو دەبوونەوە، ئەو دەیگوت هەر دەبێ بڕۆینەوە و ئەوی تر بیری دەکردەوە کە وەڵا ڕاست دەکەن، بەم زستان و سەرما و ڕەشەبایە ئەم منالانە بۆ کوێ دەبەن. حەپسە خان و خوشکی لە ترسی ئەوەی کوڕەکانیان نەڕۆنەوە و نەچنەوە ناو شەڕ و گوللەباران و هەروەها زۆریش دوور نەکەونەوە لێیان، لەبەر ئەوە وەکو شێتیان لێ هاتبوو، ناو بە ناو ڕادەپڕین کە گوێیان لەم جۆرە قسانە دەبوو، بە شپرزەیی دەیانگوت: "کەس قسەی وا نەکات، ئێمە هەر دەڕۆینەوە، چونکە نەڕۆینەوە دڵمان دەپچڕێت."

عەلی و بێستوون دەبوو زوو بگەڕێنەوە، چونکە پێشمەرگە و برادەرانی تریان لەسەریان ڕاوەستابوون و چاوەڕێیان دەکردن. بە درێژایی ئەو هەفتەیە کە عەلی و بێستوون لە ناو خێزانەکەدا بوون خەو و ئیسراحەت لەبەر هەموویان هەڵگیرابوو، ئەوەندەیان بیر لە وەزعەکەیان کردبووەوە و سەری دنیا لە خێزانەکە هاتبووە یەک. ئاخری هەرچۆنێک بوو عەلی توانیی دایکی و ئەوان ڕازی بکات و پێیان بسەلمێنی کە لەوێ بمێننەوە، هیچ نەبێت تاوەکو ئەمان دەڕۆنەوە و لە وەزعەکە دەگەن و دەنێرن بەدوایاندا.

* * *

دیسانەوە چاو ئاوسا لەبەر گریان و سەر بەسترا لەبەر ژانەسەر، هەر زوو ئامە خان پشتێنی ناوککەوتنەکەی بەستەوە پشتی و بانگی خوشکی کرد کە بێت ناوکی بۆ بگریتەوە؛ کاتی خواحافیزی و لەیەکجیابوونەوە هات.

حەپسە خان بە دڵێکی گوشراوەوە دەستە تەزیوە لەرزۆکەکانی لە ملی کوڕی ئالاندەوە و سنگ و بەرۆک کراسی خاکیی ڕەنگی فرمێسک تەڕ و پەڵەپەڵاوی کرد و بەدەم هەنسکەوە باوەشیشی بۆ بێستوون و ڕووناک و کامەران و کاوەی خزمیان کردەوە، کە دەبوو ئەو دوو کوڕە خزمەشیان بڕۆنەوە لەگەڵ عەلی و ئەوان، حەپسە خان دوای ئەو باوەشپیاکردن و ماچوموچە دڵتەزێنە، هەر لە شوێنەکەی خۆی لە هەیوانەکەی سەرێ دانیشت و خۆی گرمۆڵە کرد، هەروەک ئیتر پێی هێزی نەمابێت کە بڕوات و بەڕێیان بکات تاوەکو بەردەرکی حەوشە. ئەوانی تریش کەوتبوونە ناو یەک، ئەم عەلیی دەگرت و بێستوونی بەرئەدەدا و ئەوی تریان ڕووناک و بێستوونی دەگرت و باوەشی دەکرد بە کاوە و کامەراندا.

بەختیار لەبەر گریان و شیوەنی ئامە خانی دایکی و پاڕانەوەی باوک و مام و پووری، کە پێیان گوتبوو: "ئەگەر بێت و تۆش بەجێمان بهێڵی، هەر بە تەواوی هەموومان پەرێشان دەبین." بێجگە لەوەش عەلی توانیبووی ئەویش ڕازی بکات و تێبگەیەنێت کە

خەباتکردن و پێشمەرگایەتی هەر ئەوە نییە تفەنگ هەڵگریت و بچیتە جەبهە، بەڵکو ئەوەش هەر بەشێکە لە خەبات و پێشمەرگایەتی کە کەسێک بتوانێت ئەرکی ژن و منداڵ و نەخۆشی بێدەسەڵات هەڵگرێت و بیانپارێزێت لە کاتی تەنگانەدا و دڵیان بداتەوە و یارمەتییان بدات کە ورە بەرنەدەن و نەڕووخێن، لە کاتێکدا کە ڕۆڵەکانیان بە هۆی خەباتەوە لێیان دابڕاون.

* * *

عەلی و بێستوون و ڕووناک و ئەوان بە ماتی لە ناو جێبە لاندرۆڤەرەکە دانیشتبوون و تاوەکو دەوروبەری کەرەجیش هێشتا دڵگیریی فرمێسەکەکانی دایک و کەسیان هەر لە بەرچاو بوو، هەریەکەیان لە لایەکەوە سەیری شەقام و ڕێگاوبانی دەکرد، بەتایبەتی عەلی، کە هەروەک کاسی لێ هاتبوو ئەوەندە هیلاک و ماندوو دەهاتە بەرچاو، چونکە ئەوەنـدەی لەگەڵ گوتبـوون و ئەوەنـدە دڵـی ئەم و ئەوی دابـووەوە قـوڕگی، وشـک بووبوو.

عەلی ئۆفێکی درێژی هەڵڕشت و دەستی برد بۆ سەرولاملی خۆی و گوتی: "بەڕاستی ئەم دڵدانەوە و پێسەلماندن و دیمەنی فرمێسکەکانی دایکم و پوورم و ئەوانی تر لای من لە چوونە جەبهە و چوونە ناو شەڕەگوللە سەختترە." بێستوونیش بە زەردەخەنەوە سەری با دا و لە ژێرەوە سەیرێکی ڕووناکی کرد کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، ئەمجا سەیرێکی عەلییشی کرد و گوتی: "خۆزگەم بە خۆت... ڕزگارت بوو، هێشتا بەزمی فرمێسکی دایکم و ماڵی ئێمە ماوە." عەلی بە زەدەخەنەیەکی بێتینەوە گوتی: "ئەرێوەڵا لە ئێستاوە خۆت حازر بکە."

ڕووناک قوڕگی پڕ بوو لە گریان و سوور هەڵگەڕا، لەبەر ئەوە هەردوو لای عەباکەی هێنایەوە یەک و دەموچاوی خۆی داپۆشیی، تاوەکو نەبینرێت کە خەریکە بگرییێت.

بێستوون گوتی: "تۆ بڵێی کاک شیروان و ئەوان فریا بکەون بێن سەر بدەن و بگەڕێنەوە؟" عەلی گوتی: "ئەی چی، هەر ئێمە گەیشتین ئەوان دەنێرینەوە، هەر دوو ڕۆژی لێ بن بەسە، ئەوەش لەبەر ئەوەی دایکم و ئەوان دڵیان تۆزێ ئارام بێتەوە." بێستوون سەری هێنایە نزیک عەلییەوە و لەسەرخۆ گوتی: "وەڵا مامە حاجیم ڕاستی دەکرد، کاشکی یان ماڵی ئێمە لە تاران بوونایە یان ماڵی ئەوان لە هەمەدان بوونایە، هیچ نەبێت وەک دەربەدەرن لە شارێکدا بوونایە بۆ خۆیان سەبوورییان بە یەک دەهات و هەمیشە پێکەوە دەبوون، هەمەدان و تاران زۆر دوورن لە یەک." عەلی گوتی: "ئیتر بزانین چۆن دەبێت، من دەڵێم هەقە بەم سەرما و ڕەشەبا و زستانە لە جێی خۆیان نەجووڵێنەوە، بەتایبەتی کە دەوڵەتیش ڕازییە، دەڵێن چەند لێرە بمێننەوە قەیناکە."

ماوەیەکی باش تێپەڕیی بەسەر گەڕانەوەی هێزی پێشمەرگەدا بۆ وڵات، حەپسە خان و ئەوان ئەگەرچی لە سەریکەوە دڵیان خۆش بوو و بووژابوونەوە و هیوا و ئومێدێکیان پەیدا کردبوو و ورەیان بەرز بووبووەوە کەوا شکور ئیتر ئەو دووبەرەکییە دوابڕاوە نەما و وا هەموویان دڵیان نا بە دڵی یەکەوە و وەک جاران وەکو برا چوونەوە پشت یەک لە دژی دوژمن. ئەمانە و گەلێ قسەی خۆشتریشیان دەکرد، بەڵام مەراق و بێخەبەریی کوڕەکانیان هەندێ بێتاقەتی کردبوون و هەمیشە چاویان لە ڕێگا بوو و گوێیان هەڵخستبوو بۆ خەبەرێک.

* * *

زستانەکەی زۆر سارد بوو، خیزانەکە لە دەوری سۆپا و ئاگردانەکە کۆ بوونەوە، هەریەکەیان خەیاڵێکی دەکردەوە و هەریەکەیان نوقمی گوماوێکی خەیاڵ دەبوون، هەروەها هەندێکیان لە بێئیشی و بێتاقەتی تەنگەتێکەڵە و بێحەوسەلە بووبوون، زوو زوو هەڵدەچوون و دەچوون بە گژ ئەوی تردا، هەندێ ڕۆژیش سڵی خۆیان خۆش دەکردەوە، بەوەی کە دنیا ساردە و هەور و بارانە و ئێستا ڕەنگە کوڕەکانیان سەریان قاڵ بیت و خەریکی ئیشوکاری خۆیان بن، پاش ئەوە کەسێک دەنێرن، خۆ هەروا ئاسان نییە و ئێستا هەر دەردەکەون. لەپڕ سبەینێ دڵتەنگ دەبوونەوە کە ئەمە چ بوو، ئەمە چەندە ڕۆیشتوون، تۆ بڵێی کەسێکیان دەست نەکەوێت کە هەر هیچ نەبێ نامەیەکی پیا بنێرن و هەواڵێکی سەلامەتیی خۆیانیان بۆ بنووسن.
جارێکی تر خێزان کەوتنەوە مەراق و سەرگەردانییەوە و وایان لێ هاتبوو بەیانیان کە هەڵدەستان لە خەو دادەنیشتن بە ڕیز و بە نۆرە خەونەکانیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، هەروەهاش بەپێی کەیف و ئارەزووی خۆیشیان بۆ یەکتر لێکیان دەدایەوە، زۆر جاریش حەپسە خان دەستی دەکرد بە گریان و مەراقی کوڕەکانی و ئامە خانی خوشکی دڵی دەدایەوە و خاوی دەکردەوە و دەیهێنایە پێکەنین، کەچی چەند ڕۆژێکی تر ئەم جارە ئامە خان پشتینی ناوککەوتنەکەی دەبەستەوە و ژانەسەر دەیگرت و قورگی پڕ دەبوو لە گریان، ئینجا خوشکی و کچەکان دەکەوتنە دڵدانەوەی کەوا سەبر بگرێ و هەموو تەنگانەیەک فەرەحانییەکی لە دوایە و لەم قسانە، هەردوو حاجی مەراقی خۆیان لە دڵی خۆیاندا کۆ دەکردەوە و بە دزیی ژن و کچەکانیانەوە بۆچوونە خراپەکانیان بە ورتەورت بۆ یەکتر دەگێڕایەوە و کە چاویشیان بەوان دەکەوت، خۆیان دڵخۆش پیشان دەدا و دەستیان دەکرد بە قسەی دڵخۆشکەر و زەردەخەنەی دەستکردیان دەخستە سەر لێوانیان.

* * *

لای نیوەڕۆیەک تۆفە بە گوڕ هاتە سەرەوە و وەک ڕەشەبا خۆی کرد بە ژووری دانیشتنەکەدا، کە خێزان لەوێ گرد بووبوونەوە و دیسان بێزاری و ناڕەحەتیی خۆیان بۆ یەکتر دەردەبڕی، تۆفە گوڕی دایە خۆی و بە شپرزەییەکەوە ڕووی تێکردن و گوتی: "ڕاستیتان دەوێت؟ ئیتر چی تر دڵم قبووڵ ناکات و بەرگە ناگرێت، چەند ڕۆژە داویەتە سەرم کە ئەمە، ئەم بێدەنگییەی ژوورەکان، هەروا بە خۆڕایی نییە شتێک هەر ڕووی داوە!" تۆفە لەپی دەستی پان کردەوە و بەدەم هەناسەبڕکێ و تووڕەیی و ناڕەحەتییەوە پەنجەکانی یەکە یەکە نوشتاندەوە و گوتی: "باشە عەلی پێی ناکرێ یاخود خوانەکردە گوێی شەیتان کەڕبێت نەخۆشە، ئەی حسێن چی؟ حسێن سەری قاڵە، ئەی شیروان بۆ؟ شیروان نوقمی ئیشوکارە و لە جەبهەیە، ئەی بێستوون؟ ئەی نەورۆز؟ قابیلە لەم هەموو کەسە یەکێکیان هەست و شعووری نەبەێت و ئەقڵی بەوە نەشکێت کە بڵێت ئێستا دایکوباوک و کەسمان شێت بوونە و غەریب و بێکەس ئێستا چاویان لە ڕێگایە، با خەبەرێکیان بۆ بنێرین." تۆفە دەستی دا بە یەکدا و سەری ڕاوەشاند و گوتی: "ئەمە هەروا بە خۆڕایی نییە، دەبێت شتێک قەومابێت."
ئامە خان چاوی زەق بوو لە ترساندا و لەبەر خۆیەوە ورتەورتێکی کرد و هەردوو دەستی خستە باوەشیەوە و خۆی گرمۆلە کرد. حەپسە خانیش گورج دەستی کرد بە گریان. نەوبەهار هەستا لە ژوورەکە و ڕای کردە دەرێ. سەبری بە تووڕەبوونێکەوە ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "ماشەلا لە پیاوی ماڵ و دەمڕاستی خێزانەکە، ئەوە لەجیاتیی دڵخۆشییان بدەیتەوە، خۆ تۆ زیرەت پێ کردن حەواڵە بە خوا بیت!" تۆفە بە خێسەیەکی ئاگرینەوە سەیرێکی سەبریی کرد و گوتی: "ئەرەستۆی تەکبیرکەر ئەوە لەجیاتیی ئەم قسانەت بۆچی عیلم و خوێندنەکەت ناخەیتە کار و چارەیەک نادۆزیتەوە، بەشکم هەواڵێکی ئەو کوڕانە بزانن." سەبری وەک داخی دڵی خۆی دەرکات بە ڕقێکەوە گوتی: "من لەم دوورییە تەگبیری چییان بۆ بکەم، خۆ مناڵ نین، کوڕە دە قیروسیا چش هەرچییەکیان لێ هاتبێ خۆ ڕۆحمان دەرچوو و لە بەشەرییەت کەوتین و زوخاوەسکیان کردین."
بەختیار لە نهۆمی سێیەم لە ژوورەکەی دایک وباوکی پاڵ کەوتبوو، خۆی بە خوێندنەوەی کتێبێکەوە خەریک کردبوو، کە گوێی لە دەنگی سەبری و تۆفە بوو، هەستا و بە هەڵەداوان هاتە خوارێ و چووە لایان، کە سەبری و تۆفە هێشتا هەروا قرەیان دەهات. بەختیار ویستی قسەیەک بکات، بەڵام هەرچەندی کرد لە بەردەمی تۆفە نەیوێرا، هەندێ ڕاوەستا و دوایی دەستی بەرز کردەوە، هەروەک بڵێت بێدەنگ بن من شتێک هاتووە بە بیرمدا. خێزان چاویان بڕییە دەم و دەستی بەختیار، هەروەک بڵێن کارت

ڕاست بێ ڕۆڵە باش بوو هاتی، وەرە فریا بکەوە بەشکم قسەیەکی خێر بکەیت. بەختیار بە زەردەخەنەیەکی بێتینەوە سەیری کردن و گوتی: "دەزانن من چیم هاتووە بە خەیاڵدا؟ دەڵێن چی تەلەفۆنێک بۆ شەوکەت ئاغا بکەین و حاڵ و وەزعەکەی تێبگەیەنین، وابزانم ئەو دەتوانێ هەواڵێکمان بۆ بزانێت، ناسیاوی زۆر و قاچاخچی و ئەو نەوعە کەسانە هەمیشە هاتوچۆی دەکەن، بەتایبەتی هەموو جارێک پێمان دەڵێت هەر ئیشێکتان بوو پێم بڵێن." حەپسە خانی پووری چاوی خۆی سڕییەوە لە فرمێسک و بە پەرۆش و گەرمییەوە گوتی: "ئەرێوەڵا ڕاست دەکات، ئەمە هەر بەو دەکرێت." سەیرێکی بەختیاری کرد و بە زەدەخەنەیەکی مەلوولەوە گوتی: "ئۆە یاخوا لە دەوری سەرت بگەڕێم، بەخوا ئەمە تەگبیرێکی باش بوو." ئامە خان منگەمنگێکی کرد و جووڵایەوە و لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەرێوەڵا ئەو هەموو خەبەرێک دەزانێت." حاجی مەجید لەسەرخۆ بە دڵێکی ئارامەوە گوتی: "ئەگەرچی حەز ناکەم خەڵک گرفتاری ئیشوکاری خۆمان بکەم، بەڵام بەخوا چارمان نییە، دەبێ هەواڵێکی ئەو کوڕ و خەڵکە بزانین کە بێسەروشوێن ڕۆیشتوون، بزانین خوانەکردە چییان بەسەر هاتووە." حاجی هەندێ ڕاوەستا، وەک بیر بکاتەوە، دوایی قسەکەی تەواو کرد و گوتی: "وا بۆ دوو مانگ دەچێت نە هەواڵیان هەیە نە دەنگ." کاکە حاجی، کە بە پەرۆشەوە گوێی لە قسەی براکەی دەگرت و کەساسی لە دەموچاوی دەباری، ڕووی کردە ژنەکان و گوتی: "بەلای منەوە ئەمە زۆر قسەیەکی بەجێیە، کەواتە هەستن و زوو یەکێکتان تەلەفۆنی بۆ بکەن."

ژنەکان سەیری یەکتریان کرد، هەروەک بە یەکتر بڵێن ئەم تەلەفۆنە هەقە یەکێ لە پیاوەکان بیکات، کەچی ڕوو دەکەنە ئەوان! حەپسخان خۆی پێ نەگیرا و هەڵی دایێ و گوتی: "وەڵڵا من دەڵێم کە یەکێک لە ئێوە قسەی لەگەڵ بکات باشترە." حاجیی مێردی وەرامی دایەوە و گوتی: "نەوەڵا کەس لە تۆ باشتر نییە بۆ ئەم ئیشە، تۆ دایکی و هەموو کەس دەزانێ حاڵی دایک چییە لە کاتی وادا." کاکە حاجی ڕووی کردە حەپسە خان و گوتی: "براژن، کاکم ڕاست دەکات، قسەی تۆ لە هەمووومان زیاتر کار دەکات، ئێمە هەردووکمان تاقەتی پاڕانەوە و کڕووز کڕووزمان نییە، بەڵام بۆ تۆ قەیناکە." نەسرین سەیرێکی پووری کرد و گوتی: "ئەرێوەڵا پوورێ گیان مامم و باوکم ڕاست دەکەن، دە هەستە توخوا بەشکم خەبەرێکی لە لا بێت."

حەپسە خان هەستایە سەر پێ، نەسرین و ئامە خان و بەختیار شوێنی کەوتن بۆ ژووری تەلەفۆنەکە. بەختیار ژمارەکەی ماڵی شەوکەت ئاغای بۆ لێ دا و حەپسە خان بە دەستێکی لەرزۆک تەلەفۆنەکەی گرت بە دەستەوە. دڵی وا پەلەپەلی دەکرد، دەتگوت بانگ کراوە بۆ بەردەم دادگای عورفی و ئاخۆ ئێستا چیی لێ دەکەن، ئەوەندە شڵەژاو

و ترسابوو لەوەی نەوەکا شەوکەت ئاغا قسەی خراپی بیستبێ لە بابەت کوڕەکانەوە و ئێستا بەمی بڵێ.
شەوکەت ئاغا هاتە سەر تەلەفۆن و بە گەرمی چاک و چۆنیی لەگەڵ حەپسە خان کرد و گوتی: "لێم ببوورە، بەینێک لە تاران نەبووم، چووبووم بۆ ئەورووپا و ئەو ناوە، سەرقاڵ بووم بۆیە، دەنگم نەبوو." حەپسە خان لە دوای وەرامدانەوەی خۆشی و چاکیی قسەکانی، ئەم جارە خۆی گورج کردەوە، باسی بێخەبەریی کوڕەکانی بۆ کرد، کەوا لەوەتەی ڕۆیشتوون تەنها یەک جار نامەیەکیان هاتووە، ئەویش کە هێشتا بەڕێوە بووبوون و تازە گەیشتبوونە دەوروبەری قەڵادزە و ئەو ناوە و ئێستا ئەمان زۆر شپرزە و ناڕەحەتن و بەشکم هەواڵێکیان بۆ بپرسێت بێزەحمەت. حەپسە خان کەوتە وەرامدانەوەی قسەکانی شەوکەت ئاغا و هەر بەوا دەگەیشت کە بڵێت سوپاس، زۆر سوپاسعەمرت درێژ بێت، چاوت خۆش بێت، خەڵکی ماڵەکە لە دەوری حەپسە خان کۆ بوونەوە، هەموویان دەست لەسەر دڵ ورتەیان لە خۆیان بڕیبوو و سەیری دەست و دەم و تەلەفۆنەکەیان دەکرد، وا چاویان تێبڕیبوو دەتگوت کابرا لە تەلەفۆنەکەوە دیارە و وا بەرانبەریان ڕاوستاوە قسەیان بۆ دەکات.

* * *

بۆ ڕۆژی دوایی شەوکەت ئاغا گەیشتە لایان و کەوتبووە قسە، هەردوو حاجی گوێیان بۆ شل کردبوو، بە حەپەساوی سەیری دەمیان دەکرد، کە ئەمە چی دەڵێت؟ حەپسە خان و خوشکی کە لە ژوورەوە لە لایان بوون، یەک لە دوای یەک چوونە دەرێ و بە شپرزەییەوە خۆیان گەیاندە کچەکان، بەختیار چاوی زەق بووبوو و لەگەڵ تۆفە و سمایل بەو سەرمایە لە حەوشە کەوتبوونە پیاسەکردن و ورتەورت: "توخوا ئەمە قسەیەکی سەیر نییە؟ نەورۆز و بێستوون لە بەغدا بینراون؟
بەختیار دەستی دا بە یەکدا و سەری ڕاوەشاند و بەدەم پیاسەوە گوتی: "هیچ ناچێتە ئەقڵمەوە هەر دەبێ درۆ بێت." "تۆفە بە بزەیەکەوە گوتی: "بۆ؟ هەموو شێک ڕێی تێدەچێت، بەشکم حکومەت دیسان خەریکی گفتوگۆ بێت لەگەڵ کورد و ئەوانیش بۆیە ڕۆیشتوون." تۆفە مژێکی چاکی لە جگەرەی دا و گوتی: "گیانە تۆ گوێت لێ نەبوو کابرا گوتی چی؟ گوتی کاغەزی بەکری ئامۆزامم بۆ هاتووە لە بەغداوە کە دەڵێت نەورۆز و بێستوونی دیوە لە یەکێ لە شەقامەکانی بەغدا و قسەشی لەگەڵ کردوون، هەروەها گوتووشیەتی کەوا لێرە قاو بڵاوە کاک عەلی و برادەرانی تریشیان هاتوون بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت." تۆفە کۆکە گرتی و بەدەم کۆکە و هەناسەبڕکێوە گوتی: "ئەگەر گفتوگۆیەکەش درۆ بێت قابیلە بەکرە زلە درۆ بکات لەگەڵ ئامۆزاکەی یان

نەورۆز و بێســتوون نەناســێتەوە؟" ســمایل بە خۆشــییەوە دەســتی هەڵگڵۆفــت و بە شــەوقەوە گــوتی: "دەی خــوایە... ئیشــەڵا مەســەلەکە ڕاســت دەردەچێــت و بە زوویــی دەگەڕێینەوە وڵات و مـاڵی خۆمـان." تـۆفە بە دڵێکی خۆشـەوە گوتی: "هەر دەبێت شـتێک بووبێت کەوا کوڕەکان لەوساوە بێدەنگن." تۆفە بە زەردەخەنەیەکی خۆشـەوە دەستی دا بە یەکدا و گوتی: "من هەر دەمگوت شتێک هەیە لە کایەدا."

بەختیـار بە سەرسـامییەوە گـوتی: "ئینجـا کە وەزع وا خۆشـە، لەگەڵ حکومەت گفتوگـۆ دەست پێ کراوە! ئەی بۆچی خەبەرێکیان بۆ ئێمە نەنارد و ئەو هەموو مـاوەیە دەنگیـان نەبووە!" بەختیـار هەناسـەییەکی قـووڵی هەڵکێشـا و گـوتی: "هەرچۆنێک بێت شـتێک هەر هەیە."

بەختیار وەک بیری کەوتەوە، کە ئای لەوسـاوە میوانەکەیـان لە لای ئەو دوو پیرەمێردە بەجێ هێشـتووە و هەر کەسـەیان چووە شـوێنێک. بە پەلە بەرەو پێپلیکەکە ڕۆیشـت و لەبەر خۆیەوە گوتی: "خۆ میوانەکەمان لەبیر چوو!"

* * *

دوای ڕۆیشتنی میوانەکەیان، خەڵکی ماڵەکە هەریەکەیان لە ژوورێک و لە کونێک هـاتە دەرەوە، هەمـوو چـوونە ژووری دانیشــتن و لە دەوری یەک کـۆ بـوونەوە و کەوتــنە هێژاوی ئەم قسانەی میوانەکەیانەوە، ئەمیان دڵی خۆش دەکرد کە "دەبێ ڕێککەوتنێکی ڕاست هەبێت، ئەگینا چۆن ئەوان دەگەنە بەغدا؟" ئەوی تریان دەیگوت: "تۆ بڵێی ئەمە ڕاسـت بێـت؟" بە خۆشـییەوە سـەری هەڵدەبڕی بـۆ ئاسـمان و دەیگـوت: "ئـۆە خـوایە بەقوربانت بم، هەموو ئیشێک چەند سەختیش بێت لای تۆ چەند ئاسانە." حـاجی مەجید بە ماتییەکەوە و بە ئەسپایی بە براکەی دەگوت: "بەخوا کـابرا زۆری شـتی زانیی، بەڵام مـن بزانم هەنـدێ قسـەی کـرد بە ژێـر لێوەوە و وەکـو هەیە بـۆی نەگێڕاینەوە، چـونکە جارێ گوتی: 'دەڵێن هەر کاک عەلی و برادەرانـی خەریکـی گفتوگـۆن لەگەڵ حکومەت و لایەکەی تری تیا نییە.' جاریش گوتی: 'دەڵێن هەموویانن.'"

خێزانــی مــاڵەکە بەم هەواڵ و قســەیە ئەوەنــدەی تــر کەوتــنە مەراقەوە و هەراســان و بێئـارام بوون. بەختیـار خـۆی گـورج دەکردەوە و دەیگوت: "ئێسـتا دەچمە پۆسـتەخانە گەورەکە تەلەفۆن لەگەڵ سلێمانی دەکەم." حەپسە خانی پووری بە پەرۆشەوە دەیگوت: "نا نا بەقوربانت بم، دەترسم ئەم قسـانە وانەبێت و ئەو کەسـەی تەلەفـۆنی بـۆ دەکەیت تووشی بەڵایەک ببێت." نەوبەهار هەڵی دایێ و گوتی: "وەڵا لەوە باشتر نییە، هەر ئێستا یەکێک بێت لەگەڵم بۆ پۆسـتەخانەکە تەلەفـۆن بـۆ مـاڵی بـاوکم دەکەم." سـەبری لەوێوە ڕادەپەڕی و دەیگـوت: "ئەیەڕۆ، وەڵا مـاڵی بـاوکتی بەسـەزمان هەر ئەوەیـان کەمە. وەڵا

هەر گوێیان لەدەنگت بێت ڕەنگە زیرە بکەن، خانوو و تەلەفۆن و هەموو شتێکیان لەژێر چـاودێریی حکومەتـدایە و هەمـووی دەسـتی بەسـەردا گیـراوە." سـەبری سـەیرێکی نەوبەهاری دەکرد و بە تەوسێکەوە دەیگوت: "ئەشـهەدوبیلا خـوا هەڵناگریٚ تەکبیرێکی چاکت کردووە."

چەند هەنگاوێک تۆفە هەستایە سـەر پیٚ و سـەروجامانەی بەست و قۆپچە و زرتـزەی قەمسـەڵەکەی تونـدوتۆڵ داخسـت و پەلامـاری چەتـرەکەی دا، تـاوەکو بچێت کـولێرە بکڕێت بۆ نیوەڕۆ.

بـارانێکی بـاش دەبـاری، ئاسـمان بە هەورێکـی چڵکن داپۆشـرابوو و تـاریکی کردبـوو، دەتگـوت ئێـوارەیە، لە شـەقامی بەر ماڵەکەیـان ئۆتۆمبێل فڕکـان فڕکانیـان بـوو، ئەرزی تەڕی بارانیـان دەشـێلا و بەسـەریدا تێـدەپڕین، دەنگـی بـاران و گـڤەی بـا و گڤەگڤـی ئۆتۆمبێل هەمووی تێکەڵاوی یەک دەبوو، دەچوونە ناو مێشک و دەروونی ڕێبوارەوە و هەستێکی تێکەڵاو لە خۆشی و لە چەوساندنەوە و تێگوشین بۆ بەردەوامیی ژیانیان پیٚ دەبەخشی.

تـۆفە بە بۆڵەبـۆڵەوە لە بەردەرگاکەیـان ڕاوەسـتا، کـابرایەکی مشـەمالەبەری سـەر بە کڵاوی لیٚ دابەزی و لە زەنگەکەی دا، تۆفە گورج دەرگای کردەوە، کابرای پاسکیلسوار لە ترسی بارانەکە کاغەزێکی لە ژێر مشەماکەوە دەرهێنا و بە فارسی بە تۆفەی گوت: "ئاغا ئەم کاغەزە ئیمزا بکە." تۆفە دەستەپاچە بوو، دەستی تێکەڵوپێکەڵ بوو و گوتی: "ئاغا ئەمە چییە کە بۆت ئیمزا بکەم؟" کابرا گوتی: "ئەمە تەلەگرافە لە بەغداوە بۆتـان هـاتووە." تـۆفە حەپەسـا و سـەیرێکی کـابرای کـرد و قەڵەمەکەی لـیٚ وەرگـرت و لە شـپرزەییدا قەڵەمەی سـەروخوار گـرت بە دەسـتەوە، بە پەلە ڕاسـتی کـردەوە و گـوتی: "کامەتـا؟ ئاغـا گیـان کـویٚ ئیمـزا بـکەم؟" کـابرا پیشـانی دا و تـۆفە دوو سـیٚ خەتـی خواروخیچی لەسەر ئیمزا کرد، کە زیاتر لە گوێچکەی مشک دەچوون وەک لە ئیمزا و پەلامـاری تەلەگـرافەکەی دا و ڕای کـردەوە ژووریٚ و هەر لە حەوشـەکەوە قیڕانـدی گـوتی: "بەختیـار، سـمایل، ڕاکەن تەلەگـراف لە بەغـداوە هـاتووە!" بە پەلە سـەرکەوتە سەریٚ بۆ لای حاجی و ئەوان و بەختیار و سمایل و ئاغـای ڕەزائی بە دواوە، سەبری پەلاماری دەستی دا و تەلەگرافەکەی گرت بە دەستەوە و کەوتە خوێندنەوەی، کە تیایدا نووسرابوو: "ئێمە باشین، خۆتان کۆ بکەنەوە و ٢٥ی مانگ برادەرێک دێت بەدواتاندا، خەبەر بە ماڵەکانی تریش بدەن، ئیمزا حسێن."

خێزان قریشک و هوڕی خۆشییان تێکەوتەوە، ئامە خـان پەلامـاری تەلەگرافەکەی دا و دوو سیٚ جار ماچی کرد و نایە سەر چاوی، حاجی مەجید لێی وەرگرتەوە و بۆ جاری

سێیەم خوێندییەوە، دوایش قەدی کرد و خستیە گیرفانی بەرباخەڵییەوە و دەستێکی پیا هێنا.
ئەوەندەی پێ نەچوو ئەم جارە نەوبەهار و نەسرین هاتن و گوتیان: "ئا توخوا مامە گیان بێزەحمەت تەلەگرافەکەمان بدەرێ بزانین بەرواری ناردنەکەی کەیە؟" حاجی دەستی برد بۆ گیرفانی و دەری هێنا و پێش ئەوەی بیداتە دەستیان، عەینەکەکەی کردە چاو، لەگەڵ براکەی سەریان نا بە سەری یەکەوە و بەرواری تەلەگرافەکەیان خوێندەوە و پیشانی یەکتریان دا کە ئەوەی نووسراوە ژمارە دووە نەک سێ، دوایی تەلەگرافەکەیان دایە دەست کچەکان، ئینجا حاجی مەجید کەوتە ژماردنی ڕۆژەکان، کە چەندی دەمێنیت تاوەکو برادەرەکە دێت بەدوایاندا. حاجی دەتگوت تازە فێری یەک، دوو، سێ دەبێت و ئەو پیاوەی خاوەنی دوو سێ دوکان بوو، چەندەها جار هەروا بەسەر پێوە حیسابی پارەی تۆپە کوتاڵ و سندووقە چا و کارتۆنە سابوونی کردووە و لێی داشکاندووە و لێی زیاد کردووە، بەبێ کاغەز و بەبێ قەڵەم، ئەوەندە شارەزا و حیسابزان بوو، کەچی ئێستا لە خۆشیی ئەم پارچە کاغەزەی کە بۆیان هاتووە سەری لێ تێک چوو و هەموو شتێکی لەبیر چووەوە، ئەوەندە شپرزە و پەرێشانی دەنگوباسێک بوو و ئەوندە ئەم دەربەدەری و ئەو زرووفە نالەبارە کاری تێکردبوو.

* * *

هەرچۆنێک بوو ڕۆژی ٢٥ی مانگ نزیک بووەوە، جەماعەتیش حازر و ئامادە و لەسەرپێ بوون، هەر خوا خۆیشی دەیزانێ ئەو چەند ڕۆژەیان چۆن لێ تێپەڕیبوو، هەندێکیان لەڕ و لاواز بووبوون لە بێخەوی و بێخواردنیدا. هەندێکیشیان بۆ خۆیان قەڵەو بووبوون، چونکە لەبەر بێئیشی و چاوەڕوانی هەر خەریکی خواردن بوون و هەرچی شیرینیی چەور و پڕ قەیماغ بوو، هەمیشە بە دەستیانەوە بوو و هەمیشە دەمیان وەک ئاش خواردنی دەهاڕی.
ئێوارەی ٢٥ی مانگ تۆفە و بەختیار و ئاغای ڕەزائی، چوونە فڕۆکەخانەکە، تۆفە بە شپرزەییەوە سەیری خەڵکەکانی دەکرد کە دەهاتنە دەرەوە بە جانتا و باوڵکەنیانەوە و چەند جارێک بە شەوقەوە ڕای کرد و گوتی: "ئەرێوەڵا ئەوەتا هات!" لە دوورەوە کەوتە ئیشارەت و دەستهەڵبڕین، کەچی دوایی دەرچوو کە ئەمە ئەم خەڵکانەی دێنە دەرێ، ڕێبواری تەیارەیەکی ترن کە لە ئیتاڵیاوە یان لە پاکستان یان لە شوێنێکی ترەوە هاتوون.
یەک دوو جار بەختیار پێی لە دڵی خۆی نا و خۆی پێ نەگیرا و ڕووی کردە تۆفە و گوتی: "کورە کاکە گیان، تۆ ئەوەندە خۆت شپرزە مەکە، ئێمە هەر چووزانین کە

برادەرەکە کێیە تاوەکو ڕاکەی بەپیریەوە، جارێ سەبر بکە و لەسەرخۆ بە، بێگومان ئێستا ئەو ناونیشانێک شتیکی پێیە." تۆفە دەیویست خۆی تەریق پیشان نەدات، دوو سێ جار کۆکی و بەدەم دەستبردن بۆ گیرفانی خۆی، کە دەسرەکەی دەربێنێت، گوتی: "چووزانم، وەڵا ئەم کابرایە دەتگوت خەڵکی کەرکووکە و ئەوەی پێشووش هەر ڕاست دەتگوت خەڵکی سلێمانییە." بەختیار ڕووی کردە لایەکی تر، وەک پێکەنینەکەی بشارێتەوە لە ترسی تۆفە و لە دڵی خۆیدا گوتی: "باشە ئەگەر شکڵ و ڕەنگی ئەو کەسانەش لە یەکێ لە ناسیاوەکانمان بچێت، ئەی ئەم کابرایەی بەم جلە سەیرانەی کە لەبەریایەتی سەر تا پێ سپی و کۆڵۆنجەی پاکستانی، ئەی ئەمیش هیی سلێمانی و کەرکوک بوو."

هەرچۆنێک بوو تاوەکو تەیارەکەی بەغدا گەیشت و دابەزی، تۆفە چەند جارێکی تریش وای کردەوە، یەک دوو وردە شەڕیشی لەگەڵ بەختیار و ئاغای ڕەزائی کرد.

* * *

ئاخری برادەرەکە گەیشت و خێزانی ماڵ تاوەکو شەو درەنگ بە دیاریەوە دانیشتن، برادەرەکە یەکێ بوو لە هاوڕێیەکانی عەلی و ئەوان و ئاشنایەکی زۆر نزیکیشیان بوو، ناوی سەعدوڵڵا بوو، سەعدوڵڵا بۆی گێڕانەوە کەوا خەختی عەلی و برادەرانی و هێزی پێشمەرگە گەرابوونەوە وڵات و تێکەڵی لایەکەی تری پارتی بووبوون، هەر دوای ماوەیەکی کەم برادەرێکی کوردپەروەری بەناوبانگ خەڵکی ئەو دەروبەرەی کە لێی بوو، بە دزییەوە چووبوو بە عەلیی گوتبوو کەوا ئاگاتان لە خۆتان بێت، چونکە هەندێک لە سەرکردەی لایەکی تر نیازیان خراپە لەگەڵتان و خەریکن چەند برادەرێکی ناسراوتان لەناو بەرن، بۆیە تا زووە بکەونە خۆتان. ئەوانیش هەر بە هۆی هەمان برادەرەکەی خەبەرەکەی پێ گەیاندبوون، خۆیان لە بەرچاو گووم کردبوو و خۆیان گەیاندبووە شوێنێکی ئەمینتر. حکومەت ئەمەی بە هەل زانیبوو، ناردبووی گوتبووی کە وەرن گفتوگۆ بکەین و چیتان دەویت دەتاندەینێ.

خێزانەکە هەموویان بەرانبەر ئەم خەبەر و دەنگوباسە سەیرە حەپەسابوون و واقیان وڕمابوو! چۆن پاش ئەوەی کوڕەکانیان سەرکردە و هێزی پێشمەرگە بە هەموو شانازی و فیداکاری و دڵسۆی و دڵپاکییەوە، کەوتنە خۆیان کەلوپەلیان پێچایەوە و گەڕانەوە وڵات و هەموو شتیکیان لەبیر خۆیان بردەوە و لاپەڕە ڕەشەکەی ڕابردوویان هەڵدایەوە و لاپەڕەیەکی سپیی پاکیان خستە ڕوو، پاراستنی وڵات و قازانجی میللەتیشیان خستە پێش هەموو شتێک کە ئەم شەڕی براکوژییە نەمێنێ و هەموو لایەکیان بە دڵ و بە گیان دەست بدەنە دەست یەک و لەسەر خاک و شەرەف و

نامووسی خۆیان و هاوولاَتییان بکەنەوە، کەچی کە دەچنەوە وایان بەسەر بهێنرێت و تەگبیر لە کوشتنیان بکرێت... درۆ نییە کە دەڵێن هەندێ کەس ئەوەندە داخ لە دڵن و لەبەر ڕقی شەخسیی خۆیان هەموو شتێک دەخەنە ژێر پێ.

* * *

ئامە خان وەک چۆلەکەی زریباری لێ هاتبوو، هەر دەهات و دەچوو و ئەیکێشا بە سنگی خۆیدا و دەیگوت: "ئەیەڕۆ قوڕ بە سەرمان نەبێت، بەس نەبوو ئەو پیاوە فریایان کەوتووە و ئەو خەبەری داونێ، ئۆە ڕەبی عەمری درێژ بێت و ماڵی ئاوا بێت، بزانە چەند پیاوێکی نەجیب و کوردپەروەر بووە، لە کن خۆیشی سەر بەوانی ترە و لەگەڵ ئەوانە، کەچی غیرەت و پیاوەتیی قبووڵی نەکردووە و هەر کە زانیویەتی گورج خەبەرەکەی بۆ بردوون." ئامە خان ئیتر هەر نەیدەبڕییەوە، هەر دەیگوت و دەیگوتەوە.
هەردوو حاجی لەگەڵ ئەوانی تریش بەرۆکی کاکە سەعدوللایان بەرنەدەدا و بە پرس و پرسیار دایان گرتبوو، ئەم لێ دەبووەوە، ئەوی تر دەستی پێ دەکرد.
هەر زوو ئاغای ڕەزائی خەبەری دا بە دائیرەکەی، کەوا خێزانەکە حازرن، هەروەها دەوڵەتیش پێشەکی دەیزانی کە دەیانەوێت بڕۆنەوە.
دوای دوو سێ ڕۆژ دوو لاندرۆڤەری بۆ خۆیان و لۆرییەکی زلیشی نارد بۆ کەلوپەلەکەیان. لە وەختی ماڵبارکردندا تۆفە خۆی گەیاندە حەپسە خان و بە چرپەوە گوتی: "لۆریی زلیان بۆ ناردووین، وادەزانن فەرش و قاڵی و بار و بارخانەمان پێیە." نەسرین لەولاوە هەڵی دایێ و گوتی: "خوا دەکات دەگەڕێینەوە ولاَتی خۆمان، ئەم چەند شتەی هەشمانە هەر زیادە و هیچمان ناوێت، حەپسە خان خۆی گورج کردبوو بۆ ڕۆیشتن، عەباکەی دابوو بەسەر قۆڵیدا، خۆی و سەروسەرپۆش و جلوبەرگی شەوقی دەدایەوە ئەوەندە پاک و جوان و لێوەشاوە بوو، سەیرێکی تۆفە و نەسرینی کرد و گوتی: "ئیتر خوا ڕەحممان پێ بکات، بەخوا ئێستاش باوەڕ ناکەم، هەروا دەزانم خەو دەبینم."

* * *

لۆری بار کرا، خێزان بە پەلە سواری جێبەکان بوون و دامەزران، لە دوای دووعاخوازییەکی زۆر گەرموگوڕ لەگەڵ ئاغای ڕەزائی، هەندێ لە ژنەکان چاویان پڕ بوو لە فرمێسک و دەستیان کرد بە گریان و بەدەم هەنسکەوە سوپاسی ئەو هەموو خزمەت و ئەزیەتەیان کرد، هەروەها یەک دوو مەئمووری ساواکیش بە ئۆتۆمبێلەکانیان لەگەڵیان ڕۆیشتن تاکو سەروو کەرەج و لەوێ دابەزین و

دووعاخوازییان لە یەک کرد و ئیتر ئەمان گەڕانەوە بەرەو تاران. خێزانیش کەوتنە ڕێ بەرەو کرمانشاە و قەسری شیرین.
حەپسە خان ڕووی کردە حاجیی مێردی و بە چرپە گوتی: "تۆ بزانە چەند بەمەعریفەتن، چۆن هاتن بەڕێیان کردین، ئەشهەدوبیلا زۆر بە خزمەت و سەلەیقەن."
سەبری، کە لە تەنیشتیانەوە دانیشتبوو، سەری بردە نزیکیان و ئەویش بە چرپە گوتی: "ئەمانە مەعریفەت دەزانن، ئەوە ئێوە ئەمانە ناناسن کە چۆن بیر دەکەنەوە، ئەمە لەبەر ناوبانگی خۆیان وایان بۆ کردین، لایان وایە کە ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان قازانج لەو ناسینەمان بکەن، بەتایبەت کەوا دەگەڕێینەوە ولات و ئیتر ئیشمان بەوان نییە، بەلام قوڕ بە سەر ئەو کەسەی دەکەوێتە بەردەستیان، هەر ئەوەندە شکی لێ بکەن کە بەدڵیان ناجوولێتەوە، بزانە چۆن هەر زوو سەرنگومی دەکەن و لەناوی دەبەن، دەڵێن حەپسخانەکانیان بۆنی خوێنی لێ دێت و ئەمەی بۆیان کردین لەبەر خاتری چاوی کاڵی ئێمە نییە."
حاجیی باوکی نقەی لە خۆی بڕیبوو و ئەم قسانەی سەبریی زۆر پێ ناخۆش بوو، ئەگەرچییش کە زۆر بە ئەسپایی قسەی بۆ دەکردن، بەلام هەر خواخوای بوو کە قسەکەی زوو تەواو بێت و چیتر لەسەری نەڕوات، لەبەر ئەوەی کە تۆفە پێی گوتبوو کە ئاگاتان لە قسەتان بێت لەبەر لێخوڕەکان، چونکە هەموو پیاوی ساواکن، هەروەها ئۆتۆمبێلەکانیش لەوانەیە ڕیکۆردەریان تیا بێت، کە هەموو قسەکانتان بگرێت کە بزانن چی دەڵێن و چی دەکەن.
لەبەر ئەوەی ڕێگای بەینی تاران و قەسری شیرین زۆر دووروودرێژ بوو، بەتایبەتی کە خێزانەکە منالی بچووکیان پێ بوو، بۆیە تێکرا لە زۆر شوێنی پشوودان و نانخواردن دادەبەزین. لە یەکێ لەو شوێنانەی لێی دابەزیین، چایخانەیەکی خنجیلەی بچووکی سەر ڕێگای کرمانشاە بوو، کە هەر لە خانوو و ژووری لادێ دەچوو، نزیک بە دێیەکیش بوو، خانووەکە لە خشتی کاڵ دروست کرابوو، بەردەمی هەیوانێکی فراوان و خۆش بوو، لەوە دەچوو کە ئەو پاییزە دەستێکیان پیا هێنابێ، چونکە کۆڵەکەی هەیوانەکە داری سپینداری تازە بوو. حەوشەکەشی هەروا زەمینێکی بەرد و خۆڵ بوو و حەوزێکی چوارگۆشەی شینی بۆیەکراویشی لە ناوەڕاستدا بوو و دەوری چایخانەکەش هەمووی دارودرەختی ڕووتەڵەبوونن، کە لەبەر سەرما و زستان گەلایان پێوە نەمابوو و بە کەساسی سەریان نابوو بە یەکەوە لەدەست شەکان شەکانی ڕەشەبا.
دیار بوو کە بۆ بەهاران و هاوینان شوێنێکی زۆر خۆش بوو، هەروەک لێخوڕی ئۆتۆمبێلەکانیش باسیان کرد کە ئێرە ئەگەرچی وێنەیەکی سادە و فەقیرانە دیارە لەچاو

ئەو چێشتخانە و جێی پشوودان و ئوتێلانەی چەندچینی و ڕازاوە بە چرا و گڵۆپی سەوز و سوورەوە، کە تووشیان دەهات لە ڕێگا، بەڵام دەیانگوت کە ئێرە پێچەوانەی ئەو شوێنانەی تر خواردنی زۆر تازە و بەلەزەتی تیا دەست دەکەوێت، بەتایبەتی ئاو و گۆشتی ناو دیەی بچووک و مریشکی بە کەرە سوورکراوی تازەی دەمودەست بە ئەڵقە پیازەوە، بەو جۆرە خواردنانە زۆر بەناوبانگە و هەمیشە ئەو کەسانە سەری ئێرە دەدەن کە شوێنی خواردنی فەریک و تازە و بەلەزەت دەکەون.

* * *

خێزانەکە لە دوای چەند جار دابەزین و پشوودان لەو ڕێگاوبانە خۆشانەی ئێران، کە بەو زستان و سەرمایەش هەر دڵگیر بوون. بە ناو شارۆچکە و شاری گەورە و سەیرکردنی دیمەنی شاخوداخی دڵفڕێن و بینینی خەڵکی سەر جادە و قەراغە ڕێگا بە جلوبەرگی جۆراوجۆرەوە، هەر لە جلی کوردیی جوانەوە تاوەکو جلی ئەفەندی و عەجەمی و مۆدە و چادربەسەر، تاوەکو پانتۆڵ لە پێ و مینی جۆب لەبەر.
هەرچۆنێک بوو ئاخری خێڵ گەیشتنە قەسری شیرین، کە ماڵی باوکی بێستوون و هەموو ماڵەکانی تریش لە هەمەدانەوە گەیشتبوونەوە ئەوێ. هەموویان لە ئوتێلێکی قەراغ شار دابانبەزاندبوون، ئەمانیشیان بردە لایان، ئوتێلەکەیان بۆ ئەو خەڵک و خێزانانە چۆڵ کردبوو لە خەڵکی تر، ئوتێلەکە و ئیشکەرەکان و ئەوی سەرپەرشتییشی دەکرد، هەموویان ساواکی و سەر بە ساواک بوون.
خێڵی حەپسە خان و خوشکی و خێزانیان برانە چینی سەرەوە و دوو ژووری گەورەیان دانێ، ماڵەکانی تریش یەکی ژوورێکیان دابوونێ، چینی خواریشەوە ئۆتۆمبێلچییەکان و مەئمووری خۆیان و قاچاغچیی سەر بەوان و ئەو جۆرە کەسانەی تیا بوون کە لەسەر سنوور هەمیشە لە گەڕدا بوون و خەریکی ڕاووڕووتی خۆیان بوون.
دوو ژوورەکەی خێڵی حەپسە خان دیسان دابەش کران، هەرە گەورەکە بۆ ژن و منداڵەکان و ئەوی تریشیان بۆ پیاوەکانیان.
جەماعەت بووژانەوە و دڵیان خۆش بوو، لەگەڵ ماڵەکانی تر بە گەرمی دەستیان کردە ملی یەک، بەتایبەتی لەگەڵ ماڵی بێستوون و ئیتر هەر پێکەوە بوون و لە یەک جیا نەدەبوونەوە، کاتی نوستن نەبوایە، هەر خێزانە دەچووە ژووری خۆی، ڕووناک قریوەی دەهات لە خۆشیی ئەم گۆڕینی وەزعە و لە خۆشیی هاتنی دایکی و باوکی، چونکە تێکرا ئەو لە ماڵی خەزووری بوو لە هەمەدان.

* * *

پاش ڕۆژێک پشوودان، نەوبەهار و ڕووناک و نەسرین کەوتنە ورتەورت و باسی جلوبەرگ و سەرشتن و حەمام و دەیانگوت: "وەی ماشەڵا لەم خەڵکە، ئوتێلەکە چەند حەمامی گەرم و خۆشی تیایە، کەچی قەت بەرمان ناکەوێت و هەمیشە خەڵکی تیایە و خۆیان دەشۆن دەڵێی هەنگیان لە داردا دۆزیوەتەوە." سەبری بەسەریاندا هەڵشاخی و گوتی: "خەڵکیش وەکو ئێوە منالیان هەیە و حەز دەکەن خۆیان بشۆن، بۆچی ئەوەندە بۆڵەتان دێت و بە هیچ ڕازی نابن؟!"
تۆفە کڵاو و جامانەکەی لار کردبووە و قیتەی سمێڵی دەهات و وەکو سەرکردە و سەرلەشکر بەسەر هەموو ماڵ و خێزانەکاندا دەگەڕا و عیلم و مەعریفەتی بەسەردا دابەش دەکردن، بەڵام لە دڵدا یەک شت زۆر دڵگیری کردبوو، ئەویش ئەوە بوو کە کاربەدەستانی ساواک لە ئوتێلەکە نەیاندەهێشت هیچ کەس لە ئوتێلەکە بچێتە دەرەوە بۆ بازاڕ و ئەملاولا و هەموویان وەک دەستبەسەر وابوون لە ئوتێلەکەدا، بەڵام سێ ژەمە نانی باشیان دەخرایە بەردەم و هەر خێزانە سینیی خۆی بۆ دەبرایە ژووری.
پاش دوو ڕۆژ پرتەوبۆڵە دەستی پێ کرد، خێزانەکان جووڵەجوولیان پێ کەوت و خەریک بوو تاقەتیان دەچوو. حەپسە خان و خوشکی دوو سێ جار بەختیاریان ناردە لای کاک سەعدوڵلای برادەر و ڕێبەریان، کە پێی بڵێت کەی دەڕۆن؟ دەیانەوێت بزانن کە چۆن لە سنوور تێدەپەڕن؟ کاک سەعدوڵلاش بەختیاری تێگەیاند کە بچێت پێیان بڵێت کە هەندێ سەبر گرن، زۆریان بڕیوە و کەمیان ماوە. ئێستا خەڵکی لای خۆمان دەگەنە سەر سنوور و وەرتان دەگرنەوە و دەتانبەن بۆ بەغدا و لەوێش هەر کەسەو دەنێررێتەوە بۆ شار و ماڵی خۆی.
ئامە خان بە شەوقەوە دەیگوت: "ئۆە خۆزگەم بەو سەعاتە، دەترسم بمرم لە خۆشییاندا." دایکی بێستوون دەیگوت: "ئەیەڕۆ، ئینجا ئێمە لە بەغدا چی بکەین؟ ئێمە ئەم هەموو خێزانە لە کوێ جێمان دەبێتەوە." حەپسە خان بە خۆشییەوە وەرامی دەدایەوە و دەیگوت: "ئینجا خۆ ناچینە چۆڵی قوڵفە، ئەی ماڵی باوکی نەوبەهار چییە؟ ئەویش نەبێت هەزار خزم و ناسیاوی تر هەیە، ئەمە چ قسەیەکە، ئێستا ڕەنگە کە بگەینە جێ، خزم و کەسمان دوور لە گیانیان هەموو شامەرگ ببن لە خۆشییاندا."
تۆفە دەهات و دەچوو و دەیگوت: "بە زاتی خوا خەریکم دەدەمە ئەو دەشت و کێوانە، هەر بە تەواوی تاقەتم چووە." سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان و دەیگوت: "خوایە ئەمە کەی لەم حەپسخانەیە نەجاتمان دەبێت؟ ئەوا بۆ شەش ڕۆژ دەچێت کە لێرە چاوەڕێ دەکەین، ئەوەندە نانمان خوارد هەموویم لەبەر کرد، بەیانیان نان و کەرە و چامان دەدەنێ، سەعات دە لە باڵکۆنی ژووری پیاوەکانەوە کە زۆری کات بەو سەرمایە

دادەنیشم، دەبینم وا دوو شاگرد لە حەوشەکە فرووجەکان سەر دەبڕن و دەیانبەنە چێشتخانەکە، سەعات یەک و نیو پڵاو و جووجە کەبابمان دەدەنێ و ئێوارە پڵاو و خۆرشت." حەپسە خان سەیری دەمی دەکرد و کە تۆفە لێبووەوە دایە پڕمەی پێکەنین و گوتی: "وەڵڵا دیسان وەکو ئەوسای بانەمان لێ هاتووە، دیسان بووینەوە بە دابەستە، هەر دەخۆین و دەنوین." ڕووناک دەمی خۆی گرت و دایە قاقای پێکەنین و گوتی: "بووین بە جووجە کەباب و مریشک، خەریکین باڵ دەگرین و هەر قووقەقووقمان کەمە." ئامە خانیش گوتی: "ئۆف! لە چاوەڕوانی ناخۆشتر نییە." سەبری دیسان لێیان تووڕە بوو و گوتی: "ئێوە بە هیچ شتێک ڕازی نابن، وەختی خۆی دەتانگوت ئەم شاخ و کێو و ڕێگاوبانە سەختە و ناخۆشە، کوشتینی، لەسەر پشتی کەر و وڵاخ کووڕ و شەل بووین، مناڵەکانمان مردن لە برساندا و هەر هاوارتان بوو. ئێستا لە ئوتێلێکی خۆشدا دانیشتوون، سێ ژەمە سینی دێتە بەردەمتان، کەچی هەر بۆڵەتان دێت."

* * *

ئێوارەیەک زەلامێک بە هەڵەداوان هاتە ئوتێلەکە و گوتی: "خەڵک هاتوون بەشوێن ماڵەکاندا و گەیشتوونەتە سەر سنوور و دەڵێن با ماڵەکان بێن." هەروەها یەکێ لە برادەرەکانی کاک سەعدوڵلاش نامەیەکی بۆ نووسیبوو، کابرا ئەویشی دایە دەست ماڵەکان، کردیان بە گرم و هۆڕ و هەرا و لە خۆشییاندا و هەموویان بە پەلە کەوتنە خۆیان و مناڵیان و کەلوپەلیان پێچایەوە و ئامادە کرد.

ئێوارە کە تاریک داهات، خێزان و ماڵەکانیان سواری ئۆتۆمبێل و لاندرۆڤەری ساواک کرد و کەلوپەلیشیان لە لۆری بار کرا. ئوتومبێل و لۆرییەکان شوێن یەک کەوتن و کەوتنە ڕێ و بە شەقامەکاندا تێپەڕین و لە دوای ماوەیەکی باش ڕۆیشتن، یەک لە دوای یەک خێراییان کەم کردەوە و بە ڕیز بەشوێن یەکەوە ڕاوەستان و چرا و لایتەکانیان کوژاندەوە و بانگی کاک سەعدوڵلایان کرد و گوتیان: "ئێمە لەمە زیاتر ناڕۆین و ئێوە چۆن دەگەنە لای ئەوانی تر هاتوون بە شوێنتاندا، ئەوە خۆتان دەزانن." کاک سەعدوڵلا وەرامی دانەوە و گوتی: "باشە، ماوەکە کەمە زۆرە بۆ لای ئەوان؟ چونکە ئەم هەموو ماڵ و مناڵە وردانە بە خۆیان و کەلوپەلیان و بە تاریکی لەم دەشت و بیابانە چۆن دەتوانن بڕۆن؟" ئۆتۆمبێلچییەکان گوتیان: "وەڵا کەیفی خۆتانە، ئێمە لەمە زیاتر ناتوانین بتانبەین و فەرمانی هەر ئەوەندەمان پێیە." ناچار یەکێ بە پەلە نامەیەکی کاک سەعدوڵلای برد بۆ ئەو کەسانەی هاتبوون و چاوەڕوانییان دەکردن، کە پێیان بڵێت مەسەلەکە وایە و ئێوە چی دەڵێن؟ چونکە ئێرانییەکان دەیانگوت کە نابێ ئەوانیش بێنە ناو خاکەکەمان و هەر دەبێ لە شوێنی خۆیان بمێنن.

هەرچۆنێک بوو ئەو زەلامە یەک دوو جار هات و چوو وەڵامی هێنا و برد و بەم هاتوچۆ و خەبەر لە یەک گێڕانە کات گەیشتە دووی شەو. ماڵ و مناڵەکان هەموو بێتاقەت بووبوون و هەر لە ناو ئوتومبێلەکاندا خۆیان کزۆڵە کردبوو لەبەر سەرما، بەو شەوە زەنگە کە چاو چاوی نەدەبینی، چونکە هەردوو لایان لایت و چراکانیان کوژاندبووەوە.

بۆ جاری سێیەم، ئەم جارە کاک سەعدوللا خۆی چوو لەگەڵ یەکێ لە پیاوەکانی ماڵەکانی لەگەڵیان و گەیشتنە ئەوێ. ئەوانیش بەینێکی باشیان پێ چوو، کە نیوەی ژن و مناڵەکان بە دانیشتنەوە لە ناو ئۆتۆمبێلەکان خەویان لێ کەوتبوو، کە هەر ئەوەندەیان زانی لە دوورەوە ئەو دەشتودەرە بوو بە چراخان و بە دەیان لایتی ئۆتۆمبێل داگیرسان و کەوتنە ڕێ بەرەو لای ئەوان، هەموو لایەکیان شڵەژان، ئێرانییەکان شپرزە بوون و کەوتنە خۆیان و بوو بە مقۆمقۆیان لەگەڵ یەک، چەند کەسێکیان هانای بردە بەر ژن و ماڵەکان کە "توخوا بێزەحمەت ئەگەر سەرو دۆشەک و خاولی و پەڕۆتان پێیە بماندەنێ". تۆفە سەری گەرم بوو، دەستەپاچە بوو و نەیدەزانی لە خۆشییاندا چی بکات، لە ئۆتۆمبێلچییە ئێرانییەکان چووە پێشەوە و گوتی: "پەڕۆ و خاولی و سەرو دۆشەکتان بۆچییە؟" هەندێکیان بە شپرزەییەوە گوتیان: "دەمانەوێت ژمارەی ئۆتۆمبێلەکانمانی پێ داپۆشین و پێی بشارینەوە." ژنەکان چاویان بە حەوت ئاو شۆڕایەوە و خەو بەری دان لە خۆشییاندا، بەڵام دیمەنی ئەو هەموو لایت و ئۆتۆمبێلە زۆرە کە ئەو دەشتودەرەی ڕووناک کردبووەوە، هەر هەندێکیان بە تەواوی شڵەژاندبوو. ئامە خان گوتی: "وەی باوکە گیان ئەمە چییە! خۆ لەرزم لێ هات لە ترساندا!" خوشکی وەرامی دایەوە و گوتی: "ئەیەڕۆ! لەجیاتی دڵمان خۆش بێت و لە خۆشییاندا هەڵپەڕین کەوا ئەو هەموو ئۆتۆمبێلە زۆرە هاتووە بە شوێنماندا و وا بە قەدر و حورمەت دەگەڕێینەوە، کەچی دەڵێیت لەرزم لێ هاتووە؟!" ئامە خان بە کەساسییەکەوە گوتی: "چووزانم، وەڵا دەترسم ئێستا ئەمان بیکەن بە شەڕ و بڵێن چۆن دەتوانن بێنە خاکی ئێمەوە."

بەختیار زوو زوو دەهات و دەچوو بەلای دایکی و پوورییەوە، دڵی خۆش بوو و جاریش دەچووە لای باوک و مام و خەریکی بەدەورهاتنی ئەوانیش بوو.

ماڵەکان بە ژن و پیاوەوە هەستێکی تێکەڵاو لە ترس و خۆشی و ورەبەرز بوون و حەپەسان و شپرزەیی مێشک و دەروونی ورووژاندبوون. هەندێکیان ئەو دیمەنە سەیرەیان، بەو نیوەشەوە لەو دەشت و بیابانە کپ و ساردە و ئەو هەموو لایتەی دەهات بەرەو پیریان، وەک خەونێکی سەیریان دەهاتە پێشچاو، دەتگوت کەوا

ڕەوەگورگ و ڕەوە ئەژدیها شایی و زەماوەندیانە و ئێستا دێن ئەمانیش ڕادەماڵن لەگەڵ خۆیان، کە بچن تێکەڵاوی ئەو زەماوەندە سامناکە ببن.

* * *

ئۆتۆمبێلەکان گەیشتن، زەلامەکان هەموویان خۆیان هەڵدایە خوارێ و بە پەلەپرۆزێ پشتی لۆرییەکانی خۆیان نا بە پشتی لۆرییەکانی ئێرانییەکانەوە، بوو بە غەڵبەغەڵب و بەیەکدا هاتن، دەنگەدەنگێک کە وەکو دەڵێن سەگ ساحێبی خۆی نەناسیێتەوە.
ئەوەندە ئۆتۆمبێل هاتبوون کە هەردوو زەلام یەکێکی بەردەکەوت، زمانی عەرەبی، فارسی، کوردی تێکەڵ بەیەک بوون و بەیەکدا دەهاتن. ئێرانییەکان بانگی یەکتریان دەکرد و گوێت لەم قسانەیان دەبوو: "ئاغا حەسەن کوجای." ئەوی تریان دەیقیڕاند: "اغا جون تو اینو بگیر واین قد حرف نزن." "اغا کیسەچی، زود باش کوجا رفتی." لەم جۆرە قسانە. عەرەبەکانیش بە پەلە و خێرایی خەڵکەکەیان سوار دەکرد، ئەوانیش قڕەقڕیان بوو، هاواری یەکیان دەکرد و ئەو دەیگوت: "وینک ابو جاسم، تعال من هنا." ئەوی تریان دەیقیڕاند: "الزم... الزم... شد الحبل زین." ئەوی تریان لەو سەرەوە دەیشیڕاند: "عریف عبد... عریف عبد، تعال تعال انفک الباب." کوردەکانیش کردبوویان بە قڕەقڕ و بەیەکداهاتن، هەندێ پیاویان بەسەر ژن و منداڵەکانیاندا هەڵەشاخێن، ئەو دەیگوت: "کچێ دە بچۆ لێرەوە خێرا بکە، ئێستا وەختی مەحکەمە نییە، وای ماڵت بە قوڕ نەگیرێ." ئەوی تریان دەیگوت: "کچێ تووورەکەی چی باش دەکەیت؟ ئەمەتان هەموو شتەکانت، دە ئیتر بیبڕەوە، ئێستا وەختی ئەوە نییە."
تۆفە دەنگی دەهات، کە بە تووڕەبوونەوە دەیگوت: "ئاغا بێقەزا بی لەسەرخۆ، خۆ تۆ کەلەکەت کون کردم، قەیدی نیس قەیدی نیسی چی ماڵت کاول بێ." ڕووناک سەری نا بە سنگی دایکییەوە و بە چرپەوە گوتی: "وەی دایکە گیان خۆ ئەمانەی هاتوون بەدوامانـدا، هەموو عەسکەرن و ئەوەش هەموو لۆریی عەسکەرین." ئامە خان، کە وەخت بوو لە دیمەنی ئەو هەموو عەسکەر و لایت و ئۆتۆمبێل و غەڵبەغەڵبە ببووریێتەوە لە ترساندا، سەیرێکی خوشکی کرد و گوتی: "باوکەڕۆ ئەمە چییە، خۆ دەڵێیت قیامەت هەستاوە." بە ترسێکەوە دەستێکی برد بۆ قۆڵی خوشکی و گوتی: "چییە، هەرسێکمان بە تەنیا لە ناو ئەم ئۆتۆمبێلەدا دەبین؟ توخوا با تۆفە یان یەکێ لە کوڕەکان بێن لەگەڵمان سوار بن، بەخوا دایکم من لەم عەسکەر و مەسکەرانە دەترسم."
حەپسە خان بە خۆشییەوە گوتی: "کچێ خوشکم ئەمە هەموو ئۆتۆمبێل و عەسکەر و برادەرانی خۆمان هاتوون بەپیر ئێمەوە و ئەوە لەبەر ئێمە وادەکەن، ترسی چی و حاڵی چی؟" حەپسە خان سەیرێکی ئاسمانی کرد و گوتی: "ئۆە خوایە گیان بەقوربانت

بم و بەقوربانی چەرخت بم، بە چ حاڵێک هاتین و بە چ حاڵێک دەگەڕێینەوە." تۆفە گەیشتە لایان و بە شەوق و خۆشییەوە گوتی: "چاوتان لێیەتی بە چ هەرایەک دەمانبەنەوە؟ نەک هەر ئۆتۆمبیل و لۆری هاتوون، چەند ئۆتۆمبێلی ڕەشاش لەسەر و موسەلەحیشیان لەگەڵە، ئەوەتا سەیر بکەن ئێرانییەکان ڕۆحیان چووە لە ترساندا." حەپسە خان گورج گوتی: "توخوا تۆفە گیان وا مەڵێ، ئێرانییەکان زۆریان خزمەت کردووین، توخوا بە گەرمی و سوپاسەوە خواحافیزییان لەگەڵ بکەن، خەڵک کە لە کانییەک ئاوی خواردەوە نابێ بەردی تێفڕێبدات." تۆفە بە بزەیەکەوە گوتی: "بۆچی گوتوومە چی؟ هەر ئەوەیە دەڵێم کە ترسنۆکن و بزانە ئەوانەی لای خۆمان چۆن گوێیان نەدانێ و هاتن و..." تۆفە خەریک بوو لەسەری بڕوات کە حەپسە خان گوتی: "باشە باشە بەقوربانت بم قسەی تۆیە قسەی تۆیە، بەڵام تۆ یان یەکێ لە کوڕەکان وەرن لەگەڵ ئێمە سوار بن." تۆفە بە گەرمییەوە گوتی: "نا نا نا، من لەگەڵ سەبری و نەوبەهار و نەسرین سوار دەبم، سەبری حەز دەکات لەگەڵ ئەوان سوار بم، ئێستا بەختیار دەنێرم لەگەڵ ئێوە سوار بێت."

دوای ئەوە تۆفە ڕۆیشت، حەپسە خان بە ئەسپایی پێکەنیی و گوتی: "بەخوا ئەوە سەبری لە دەمی ترساوە، بۆیە حەزی کردووە لەگەڵیان بێت، تاوەکو نەهێڵێت قسە بکات." ڕووناک بە ئەسپایی پێکەنیی و گوتی: "ئینجا نۆرەی ئەمانە قسەی لێ دەربێنن و باسی تورکیا و ئوردون و لوبنانیان بۆ بگێڕێتەوە." دایکی لە ژێر عەباکەیەوە وا پێکەنیی کە خیزەی سنگی هات و فرمێسک لە چاوی دەرپەڕی و بەدەم هەناسەبڕکێ و پێکەنینەوە گوتی: "قوڕمان بە سەر نەبێت، وا ئێران و توورانیشی هاتە سەر، ئیتر کێ لە دەمی تۆفە نەجاتمان دەدات."

* * *

هەردوو حاجی لە تەنیشت یەکەوە سواری شۆفەرێکی ستێشنی تازە بووبوون، کە دەتگوت ڕەخشە، بە حەپەساوی سەیری قەڵەباڵغییەکەیان دەکرد و سەریان سووڕمابوو، حاجی مەجید سەری بردە نزیک براکەیەوە و بە چرپەوە گوتی: "ئەم مەسەلەیە چییە، دەبێ چی قەومابێت؟" براکەی بە شەوق و خۆشییەوە گوتی: "پەنا بە خوا، یاخوا ئەمە تا سەر بێت، دیارە شوکور ئەم جارە ڕێککەوتنەکە ڕاستە و لەوەش دەچێت کە کوڕەکان و برادەرانیان دەستیان باش بڕوات." حاجی مەجیدی برای بە مەلوولییەکەوە گوتی: "بڵێم چی، چەند جاری تریش هەراوهۆریای وامان دیوە، کەچی لە ئاخریدا چییان پێ نەکردین، ئەوساکە دووبەرەکی و شەڕی براکوژییەکە دەستی پێ کرد، چاوت لێ بوو بۆ لایەکەی تر چییان دەکرد، خۆ هەر لۆرییە پرتەقاڵ و سێو و

جگەرەی ڕۆسمان بوو بەڕێوە بوو بۆیان، ئەوەندەیان پارە دابەش کرد بەسەریاندا کە زۆر کەسیان هەر لە کەڵک کەوت و کە جەماعەت پەلاماریان داین لە ماوەت، ئەوەندە نازدار بوون حکومەت تەنانەت لۆریی عەسکەرییشی دانێ، کە پێی بێنە سەرمان و دەرمانپەڕێنن." کاکە حاجیی برای دەستی بە ڕیشیدا هێنا و گوتی: "ئەی چی بکەین؟ هەر ئەوەمان دەسەڵاتە بڵێین لەسەر خوا، خوا ئاوێکی ڕەحمەت بکا بەو ئاگرەدا و هەرچی چاکە بیهنێتە ڕێی ئەم کوردە هەژارە بەدبەختە، چ سەگبابێ حەزی لە شەڕە؟ کێ پێی خۆشە ئەو هەموو گەنج و لاوە بکوژرێن؟ بەڵام کە ناچاری زۆری بۆ هێناین و خەڵک بە سەرشۆڕی ژیا و لە ژێر چەپۆک بوو، ناچار دەبێت کە سنگ بنێت بە گوللەوە، چونکە مردن گەلێ خۆشترە لە ژێردەستی و ژیان بە سووکی."
بەیانی دنیا تاریک و ڕوون بوو کە ئۆتۆمبێلەکان گەیشتنە بەغدا، هەموو لە خۆشییاندا گەشانەوە، زۆریان بە ژێر لێوەوە شایەتومانیان دەهێنا و هاواری غەوزی گەیلانییان دەکرد، لە خۆشیی ئەوەی خۆ ئەمە ڕاستە و ئەوە ئەوانن خەریکە دەگەنە بەغدا و ئەمەتا دارخورما و باخ و بێستان و تابلۆ و ئیعلان دەرکەوتن، ئەمەتا دهن الراعی و ئەوی تریان سابون جەمال و دهن نێرگز و شیری نەستەلە و پەنیر و قەیماغی الابان. دنیاش ڕووناک بووەوە، خانوو و مەنارەش دەرکەوتن، وا پیاوی دشداشەلەبەر و ژنی عەبابەسەر و ابو نفط و دوکانی نانەواخانە و سەموونیش دیار بوو.
ئۆتۆمبێلەکان هەموو بە یەکەوە لە قەراغ شەقامێک ڕاوەستان، کاک سەعدوللا و دوو برادەری دابەزین و کەوتنە قسە لەگەڵ هەمووماڵەکان کە کێ لە کوێ دادەبەزێت و کێ ئاشنا و خزمی هەیە، کێش کەسی وای لێرە نییە، بێن لەگەڵ ئەوان تاوەکو دایانمەزرێنن لە بارەگای حیزب و لە ئوتێل و شوێنی وا، لەوێشەوە هەر کەسەو ڕەوانەی شار و ماڵەکانیان دەکرێن.
هەر کەسەیان شتێکی گوت و داوای کرد کە ببرێن بۆ فڵان شوێن و فڵان گەڕەک و ماڵی خزم و ئاشنا. خێڵی حەپسە خان و خوشکی و ماڵی باوکی بێستوونی زاوایان ڕوویان کردە ماڵی میرزا عەبدوڵلای باوکی نەوبەهار و ئەشیاکانیشیان هەروا بە بەستراوی لە شوێنێک دانرا تاوەکو دەچنەوە سلێمانی.
ماڵەکان لە دوای دووعاخوازییەکی زۆر گەرموگوڕ لە یەکتر، جیابوونەوە، هەر ماڵیان چوو بە ییی خۆیدا.
هۆڵە خۆشە گەورەکەی ماڵی باوکی نەوبەهار جمەی دەهات؛ سەرای میوانەکانیان کە ئەو بەیانییە گەیشتبوونە جێ، پەیتا پەیتا خزم و کەس و ئاشنا یەک لە دوای یەک دەگەیشتنە لایان و زەنگی دەرگا ئەو بەیانییە هەمیشە لە کاردا بوو، هەر

سەرپۆشلەسەر و کۆڵوانەلەشان و سەروسەربەستی جوان جوان بوون گەیشتنە حەپسە خان و خوشکی کچەکان و کەوتنە پەلاماردان و دەستلەملان و ماچوماووچ و گریان و پێکەنین و بەقوربان و بەسەدەقە و بەخێرهاتن هەمووی تێکەڵ یەک بوون.
هەندێ لە خزم و کەس و ئاشنا و بەپیرهاتووەکان دەکەوتنە چرپەچرپ لە بەینی خۆیاندا و بە یەکیان دەگوت: "بەقربانە جارێ کەس بە حەپسە خان و ئامە خان نەڵێت کە پوورە فاتمە خانیان ئەمری خوای کردووە." ئەمی تریان دەمی دەبردە نزیک ئەوەی تریانەوە و بە چرپە پێی دەگوت: "با جارێ ئێمە باسی هیچ نەکەین، دوایی کە چوونە سلێمانی با لەوێ پێیان بڵێن کە مامی بێستوون ئەمری خوای کردووە." ئەمیان بە گوێی ئەوەی تردا دەیچرپاند و دەیگوت: "کچەکە حەپسە خان دەڵێیت ڕۆژێ لە عەمری کەم نەبووەتەوە، بزان چییشیان بەسەر هاتووە، کەچی نامە خوا هەر سوورە سووری ڕوومەتیەتی، هەمووشیان سەرودڵیان خۆشە."
سەبری و نەسرین و نەوبەهار و ڕووناک، ئەوانیش لەگەڵ کچی هاوڕێی و هاوعومر و کەسی خۆیان سەرگەرم ببوون، کە هەندێکیان دوو سێ ڕۆژ بوو هاتبوون بۆ بەغدا و چاوەڕێییان دەکردن، هەر کە زانیبوویان کەوا لەم ڕۆژانەدا دەگەنە جێ. عەلی و شیروان بە ڕوویەکی خۆش و دڵ و دەروونێکی ڕوونەوە دانیشتبوون بۆ هەردوو حاجی و باوکی بێستوون و ئەو پیاوانەی تر باسی وەزع و ڕێککەوتنەکەیان دەکرد لەگەڵ حکومەت و باسی مقەڕ و بارەگا و هێزی پێشمەرگەی حیزب، کە لە کوێن و چەند شوێنیان بە دەستەوەیە و لە کام شار و کام ناوچە چییان هەیە و خەریکی چین و ئەم جۆرە قسانەیان بۆ دەکردن. هەروەها ئەوەشیان دەگێڕایەوە کە وەختی گەڕابوونەوە چۆن لایەکەی تریان پیلان و شتیان بۆ دروست دەکردن و چۆن زانییان کە خەریک بوون چەند سەرکردەیەکی ناسیاویان لەناو بەرن. ئیتر ئەمانیش ناچار هاتن و لەگەڵ حکومەت ڕێک کەوتن و بەڵێنی زۆریشیان وەرگرتووە کە گەلێ شتمان بە قسە دەکەن.
حاجی مەجید و براکەی بە دڵ گوێیان لێ دەگرتن، لەگەڵ ئەوەشدا کاکە حاجی بە ماتییەکەوە گوتی: "یاخوا ئەم جارە ڕێککەوتنەکەتان ڕاست بێت و دیسان پیلان و دەستگەرمکردنەوە نەبێت وەکو جاری پێشوو، بەلای منەوە حکومەت هەرچییەکتان بۆ بکات و چەندیش بە قسەتان بکات و چەندیش وەزع خۆش بێت بۆ کورد، هێشتا ئارامی و خۆشی ناخاتە دڵەوە، ئەویش چونکە خۆتان لە ناو خۆتاندا بوون بە دوو بەشەوە و دووبەرەکی و شەڕی براکوژییەکە هەر ماوە، بەلای منەوە هیچ خۆشی و دەستکەوتێک ناگاتە ئەو خۆشی و دڵنیاییەی کە ئێوە یەک بن و وەک برا لە پشتی یەک بن. ئەوەتا تا

وابن حکومەت ئەم بەرەتان لە دژی بەرەکەی تر بەکار دەهێنێت و پێتان ڕادەبوێرێت، هەروەک پێش ئێوە لەگەڵ ئەوانی تر ڕێک کەوتن و بە پارە و بە و چەک و لۆری ئەوان هاتن بە گژتاندا و ئەو هەموو قارەمان و لاو و گەنجە لە هەردوو لاتان کوژرا و لەناو چوون." عەلی گوتی: بەخوا ڕاست دەفرمووی مامە گیان، خۆیشمان ئەوە دەزانین، بەڵام چارمان نییە، لە بەرچاوی خۆتان چۆن پێمان لە دڵی خۆمان نا و هەموو شتێکمان لەبیر خۆمان بردەوە و بە ڕاکردن چووینە لایان کە زانیمان خەریکن دەکەونە تەنگانە و گوتمان فەرموو ئەوە هاتینەوە و برا بچووکیشین، کەچی ئەوان لەجیاتیی ئەم کردەوەیەمان قەدر بگرن، خەریک بوو لەناومان بەرن و وەک گوڵیش سەیری پێشمەرگەکانمان بکەن، ئەو پێشمەرگانەی سەر و ڕۆح و ماڵیان لەپێناوی کورد و کوردستان دانابوو و خەریکیش بوون سەرکردەکانمان بکوژن و لەناو بەرن." عەلی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: 'ئیتر بڵێین چی؟ ئێستاش هیچ بە سەرشۆڕی نەهاتووین ڕێک بکەوین لەگەڵ حکومەت، بە پێچەوانە ئەوان دەیانەوێت بە دڵی ئێمە نەکەن و زۆریش حورمەتمان دەگرن، چونکە دەنگمان دلێرە و پیاو و نۆکەری کەس نین لە هیی میللەتەکەمان زیاتر."

باوکی پرسیی: "ئەی حسێن و نەورۆز کوان؟ لە کوێن؟" عەلی بە خۆشییەوە گوتی: "ئەوان لە ناوچەی سلێمانین، لە ناو پێشمەرگەدان، من و کاک شیروان و بێستوون لەبەر ئێوە هاتووین." لەو کاتەدا شیروان کردی بە ژووردا، کە لە کاتی قسەکردندا هەستابوو و چووبووە دەرێ و کوڕەکەشی بە باوەشەوە بوو، قسەکەی عەلیی تەواو کرد و گوتی: "لەبەر خاتری ئێوە هاتووین، هاتووین بەپیرتانەوە، ئەگینا هەزار ئیشمان هەیە، تۆزێ پشوو بدەن، دوو سبەی ئەگەڕێینەوە سلێمانی."

* * *

ڕۆژ ڕۆژی کەس نەبوو هیی تۆفە نەبێت، وەک دەرمانێکی نایابی لێ هاتبوو، هەر دەست کەس نەدەکەوت، ئەم دەیگرت و ئەو بەری نەدەدا، ئەم دەستی دەکردە ملی و ئەو جگەرە و چای دەخستە بەردەست، ئەم قۆڵی دەگرت و ئەو دەیگوت: "هەستە با تۆزێک بتبەین بۆ پیاسە، دەمێکە بەغدات نەدیوە." کوڕە لاو و هەرزەکاری خزمیان و ئەو پێشمەرگانە لە بارەگای بەغدا بوون و دەهاتن بۆ سەردانیان و لێی دەپاڕانەوە و بە قوربان و حەیرانی دەبوون کە دانیشێت و باسی تارانیان بۆ بکات. ئیتر تۆفە دەتگوت بووە بە پاشای سەرتەخت، هەر خەریکی فەرماندەرکردن بوو و نەدەکەوتە سەر ئەرز.

بۆ ڕۆژی دوایی، حەپسە خان و خوشکی و دایکی بێستوون خۆیان کۆ کردەوە، کە لە پێش سلێمانی بچنە سەر مەرقەدی غەوزی گەیلانی و ناردبوویان نوقڵ و مۆم و بەیداخی سەوزیان بۆ کڕیبوون، کەوتنە ڕێ بەرەو بابلشیخ، ئۆتۆمبێلەکەی حەپسە خان و ئەوان شەقامە قەڵەباڵغەکانی بەغدای دەبڕی. ئەویش چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و ڕۆژەکانی چوونە سەر مەرقەدی حەزرەتی مەعسوومەی بیر دەکەوتەوە، کە لە تاران لەگەڵ خوشکی و خاتوو زبێدە و تۆفە چوون بۆ زیارەتی؛ ئای ئەوسا و ئێستاش چەند فەرقی زۆرە، ئەوسا چەند مەلوول و کەساس و غەریب و دڵتەنگ بوون و ئێستا چەند بەورە و پشتئەستوورن.

* * *

دوای دوو ڕۆژ پشوودان و چوونە سەر شەخس و پیر، خێڵی حەپسە خان و خوشکی بە خاووخێزانەوە کەوتنە ڕێ بەرەو سلێمانی، دەشت و بیابان و چۆڵی قوڵفەیان بڕی، وا سەیری ئەو دەشتودەرەیان دەکرد، دەتگوت کە قەت بەو ڕێگاوبانەدا تێنەپەڕیون، تەپوتۆزەکەشیان لێ بووبوو بە سەیران، خۆ کە نزیک دەوروبەری شارە شیرینەکەی کەرکووک بوونەوە، لە دوورەوە دیمەنی ئاگرە گەشەکەی بابەگوڕگوڕیان لێ دەرکەوت، چاوی هەندێکیان تەڕ بووبوو لە فرمێسک و موچڕکەیەکی خۆش سەرتاپای داگرتن و هەندێکی تریان کەوتنە سەڵەواتلێدان. لای ئێوارە درەنگ و لە دوای پشوودانێک لە کەرکووک کەوتنە ڕێ، گەیشتنە گرد و چاڵوچۆڵیی نزیکی سلێمانی و کە لەپڕ ئۆتۆمبێلەکان سەر بەرزاییەک کەوتن و دیمەنی شارە دڵگیرەکەی سلێمانی دەرکەوت و لە دوورەوە چرا و گڵۆپەکانی چاوی ڕوون کردنەوە، حپسە خان خۆی پێ نەگیرا و بەدەم هەنسکەوە گوتی: "ئۆە بەقوربانی ئەم دیمەنە جوانە بم، خوایە پێمان ڕەوا ببینی و کەس لە وڵاتەکەی خۆی دوور نەخەیتەوە و لەو بەهرەیەی بێبەشی نەکەیت." ئامە خانی خوشکیشی لەولاوە فرمێسکەکانی سڕییەوە و گوتی: "ئۆە بەقوربانی ڕەشەباکەشی بم، شەرت بێ ئیتر ئەگەر چوار فەسڵە ڕەشەبا بێت و لە تۆزوخۆڵدا بخنکێم، بۆڵەم لە دەمەوە نەیەت." ئامە خان هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "ئۆف... تەپوتۆز و خۆڵەکەشی هەر خۆشە."